# ئەلبێر کامۆ

## کۆمەڵێک بەرهەم



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# ئەلبێر کامۆ

ڕۆمانی **نامۆ** و لێکدانەوەیەک

لەگەڵ دوو شانۆگەریی

## بەدحاڵی بوون و دادپەروەران

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: حەمەکەریم عارف



کتێب: ڕۆمانی نامۆ و لێکدانەوەیەک لەگەڵ دوو شانۆگەریی بەدحاڵی بوون و دادپەروەران
نووسینی: ئەلبێر کامۆ
وەرگێڕانی لە فارسییەوە: حەمەکەریم عارف
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٠٦
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
خۆشنووسیی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٨٥)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# نـامۆ

## پێشـەکی

١

ئەلبێر کامۆ لە ٧ی نوفمبری ١٩١٣ لە گوندی موندوڤی هەرێمی قەستەنتینەی جەزایر لە باوکێکی فەرەنساوی و دایکێکی ئەسپانی نەژاد لە دایک بووە، بابی وەرزێر بوو، لە شەڕی مارنی یەکەمدا هاتە کوشتن، دایکی لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا بێوەژن کەوت و هەر لە جەزایردا مایەوە. تا کارێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، ماڵێکی پەرپووتی لە گەڕەکی بلکوردا بەکرێ گرت، هەردوو کوڕەکەی و دایکی و خوشکە کەڕە پەککەوتەکەشی لە گەڵیا بوون، ژیانێکی هەژارانەی دەگوزەراند، کوڕە چکۆڵەکەی -ئەلبێر- هەر لە مناڵییەوە هەستی بەم بێ دەرەتانییە کرد و هەستی کرد کە هەژاران لە یەکێتی و بێدەنگیدا هاوچارەنووسن. بەڵام دوو شت باری قورسی ئەم هەژارییە سەختەی لەسەر شان سووک کرد، هەتاو و دەریا، هەتاوی گەرمی جەزایر، دەریای شین و مەنگ کە



خەیاڵی فراوانی ئاوەدان دەکردەوە.

کەواتە کامۆ سەردەمی مناڵی و گەنجیی بەهەژاری و لە نێو هەژاریدا بەسەربرد، ناخی پڕ بوو لە هەستی زیرەکانەی چینی چەوساوە، هەست بەزۆرداری، تاڵی ناکۆکی و جیاوازی کۆمەڵایەتی نێوان چینەکان، لووتبەرزی دەوڵەمەندان، ئەم هەستانە بوونە مایەی یاخیبوون و شۆڕش دژی بارودۆخەکان.

بیری کامۆ لەم بارەیەوە تەنیا هەڵقولاوی خوێندنەوە نەبوو، بەڵکو پتر هەڵقولاوی ئەزموونی ژیانی خۆی بوو، ئەو ژیانەی لە سەردەمی منداڵی و هەرزەکاریدا لە نێو کوچە و کۆڵانەکانی جەزایردا بەسەری برد. هەر بۆیە ڕاستگۆیی لە گوزارشتەکانیدا، قووڵی لە باوەڕیدا، گەرمی لە هەناسەکانیدا بەدی دەکرێ و دەبینرێ.

ئەوەی کە یارمەتی پڕانی بەهرەی کامۆی دا، مامۆستایەکی بوو لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بەنێوی جرمان، لەو مامۆستایانە بوو کە لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا قاڵ بووبووەوە، بەڵام جمهوری خوایەکی دڵسۆزی سەرەتاکانی شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨ بوو، هیوایەکی گەورەی بەرزگاربوونی چینەکان و بڵاوبوونەوەی سەرەتاکانی سۆشیالیستی هەبوو، زیرەکی ئەم منداڵە هەژارە سەرنجی ڕاکێشا، توانی مینحەیەکی خوێندنی لە اللیسیە بۆ دابین بکات.

لێرەدا، لە اللیسیە لە جەزایر کە جێگای منداڵە دەوڵەمەندەکان بوو ئەو منداڵە زۆر زیرەکە هەستی بەستەمی کۆمەڵایەتی کرد و دەرکی بەوە کرد کە لە ڕیزی کۆمەڵگادا جێی کوێیە. لە ڕیزی هاووڵاتییە فەرەنساوییەکانی خۆیدا نییە، بەڵکو جێگای نێو ئەو زۆر لێکراوە موسوڵمانانەیە کە بەدەستی هەژاری و چەوساندنەوە دەناڵێنن. ئەلبێر کامۆ شەیدای وازی تۆپی پێ بوو، بوو بەگۆڵچی، گوڵچییەکی هەرە چاکی قوتابخانەکەی خۆیان بوو، جارێکیان سەرمای بوو، ئەم سەرمایە لێی پیس کرد و دووچاری پەنامی سییەکان بوو، نەخۆشییەکەی زیادی کرد و لێی کرد بەرەشە سیل و هەتا هەتایە لە کۆڵی نەبۆوە، بۆیە هەستی کرد ناتوانێ پیشەی دەرس گوتنەوە لە ئەستۆ بگرێ. ئیدی پیشەی مامۆستایەتی لە خەیاڵی خۆی دەرکرد، چووە ڕیزی فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە، یەکەم کارێ کە گرتییە ئەستۆ ئەوە بوو، بوو بەفەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی جەزایر. بەڵام کاری ڕۆژانەی نێو دۆسیەی بێزارکەر ڕێی نووسینی ئەدەبی لێ نەگرت، دەستی بەنووسینی کورتە وتار کرد و بەناوی «شایی»ەوە بڵاوی دەکردەوە، خووی دایە دامەزراندنی تیپێکی شانۆیی، زۆربەی ئەکتەرەکانی ئەو تیپە موسوڵمان بوون. شانۆ زۆری سەرقاڵ کرد، چ وەکو نواندن چ وەکو خوێندنەوە. لەو سەردەمەدا ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەبی دۆستۆفسکیدا پەیدا کرد، ئەو چیرۆکانەی کە لە خودی خۆیەوە نزیک بوون، هەر دووکیان باوەڕیان بەئادەمیزاد هەبوو، هەردووکیان زۆر ناسک بوون، بەتایبەتی دەربارەی باری کۆمەڵایەتی و گیروگرفتی دەوڵەمەند و هەژاران.

ڕۆژنامەگەری سەرنجی کامۆی ڕاکێشا، هەر کە پەیوەندی بەرۆژنامەنووسی نووسەر- بسکال بیا- سەرۆکی نووسینی «الجزائیر الجمهوریة» کرد ئیدی ڕۆژنامەگەری بوو بەخولیای، یەکەم وتاری سەرەکی کە کامۆ نووسی لێکۆڵینەوەیەک بوو دەربارەی کوێرەوەری کرێکاران، لەو وتارەدا باری کۆمەڵایەتی ناهەمواری ئەو کرێکارانەی ڕوون کردبۆوە کە لەبەر دەستی سەرمایەدارە داگیرکەرەکاندا کاریان دەکرد، کە

هەموویان موسوڵمان بوون. دەسەڵاتی ئیستعماری لە جەزایر و لە پاریسدا هەستیان بەمەترسی ئەمە کرد بەرێژەی داگیرکەرانەوە. لێرەدا دەبێ دان بەوەدا بنەین کە کامۆ یەکێک بوو لەو فەرەنساییانەی لە ڕیزی پێشەوە ویژدانیان ڕاپەڕی دژی ئەو تاوانانەی کە داگیرکەری فەرەنسی دەی کرد و هەروەها ئەمە جارێک بوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی داگیرکەران.

کامۆ گواستییەوە بۆ پاریس. بوو بەسکرتێری نووسینی ڕۆژنامەی پاریسی ئێواران لە کاتی کارکردندا سوور بوو لەسەر ئەوەی بەشداری ژیان و کارەکانی کرێکارانی چاپ و کۆکردنەوە بکات، چونکە هەستی دەکرد ئەوان زیاتر لێوەی نزیکن وەک لە دەستەی نووسەران.

کە دووەم جەنگی جیهانی بەرپا بوو، ویستی بەشداری جەنگ بکات، بەڵام لەبەر نەخۆشی ئەمەی پێ نەکرا، دوای هەڵاتنەکەی فەرەنسا لە پاریسەوە گواستییەوە بۆ «کلیرموند فراند» لە نزیکی فیشی، هەروەها ڕۆژنامەی «پاریسی ئێواران»ش گواستییەوە، لەو دەمەدا لە ساڵی ١٩٤٠دا یەکەم چیرۆکی گەورە و بەناوبانگی خۆی نووسی، کە بریتی بوو لە چیرۆکی نامۆ، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٢دا کەوتە بەر دیدەی خوێنەران.

ئەوجا چووە ڕیزی بزووتنەوەی «بەرەنگاری» دژی داگیرکەری ئەڵمانی، لە شانەی «خەبات»دا بەشداری کرد و بەنهێنی لە پاریس مایەوە، خۆی و دەستەیەک لە هاوڕێکانی بڵاوکراوەیەکیان بەناوی «کومبا» (خەبات)ەوە چاپ و بڵاودەکردەوە، زۆری نەبرد و دوای ئازادکردنی پاریس لە ٢٤ی ئۆگستۆس ی ساڵی ١٩٤٤دا ئەو بڵاوکراوەیە بوو بەڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە و بەزمان حاڵی «بەرەنگاری» میللی لە فەرەنسادا، لەو بەروارەوە ئەلبێر کامۆ بوو بەسەرۆکی نووسینی، بسکال بیای دۆستی بەڕێوەی دەبرد، هەروەها لە نووسیندا، سارتر، بال واستروک و ئولیفر و...هتد کە لەوەدوا گەیشتنە لووتکەی نێوبانگ بەشداریان کرد. ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی لە میانی لاوان و نەجەوانانی ئازار چەشتووی جەنگدا بینی، ئەو وەچەیەی بەتەمای ئەوە بوون دەرگای هیوای تازەیان لەبەردەما بکرێتەوە، بۆچوون و کەرەستەی خۆی هەبێ لە ژیاندا. هەرچەند ئەم ڕۆژنامەیە زۆر بڵاو نەبوو، بەڵام ڕۆڵی لە بارەی ئاراستەکردنەوە لە هەموو ڕۆژنامەیەکی دی گەورەتر بوو، کامۆ و دۆستەکانی تێیدا مانەوە تا بارودۆخ لە فەرەنسادا گۆڕا، کە ڕۆژەکەی ڕۆژی بیرکەرەوە و ئابڕوومەند و خاوەن ڕا نوێ و چاکەکان نەبوو، بەڵکو ڕۆژی حیزبە هەلپەرستەکان بوو، وازی لە سەرنووسەری (کومبا ) هێنا و بۆ یەکجاری بەجێی هێشت، جێگای سەرسوڕمان نییە کە کابرایەکی جوولەکەی تونسی کڕی و بەزووترین کات کردی بەڕۆژنامەیەکی ئیستعمارییانەی کۆنەپەرستانەی بێ ئاست.

ئەستێرەی ئەدەبی و فیکری کامۆ دەستی بەبەرزبوونەوە و درەوشانەوە کردبوو، ئەو و سارتر بوون بەدوو ئەدرەس بۆ بزووتنەوەیەکی ڕەسەنی نوێ لە ئەدەب و فیکری فەرەنساییدا، کامۆ بەدڵ و بەگیان خووی دایە نووسینی ئەدەبی، ڕۆمان و شانۆگەری و وتاری ئەدەبی یەک لە دوای یەکی بڵاو دەکردەوە. ئەو و سارتەری هاوڕێی بوون بەسەر ئامەدی بزووتنەوەی ئەدەبی و فیکری هەڵچوو لە فەرەنسادا.

لە هەڵوێستە ڕامیارییە دیارەکاندا دەنگی دژی زۆر و ستەم و هەموو جۆرە داگیرکەرێک بەگشتی و



دژی داگیرکەری فەرەنسی لە باکوری ئەفەریقادا بەتایبەتی بەرز دەکردەوە. هەرگیز عەرەب ناتوانن هەڵوێستە گەورەکانی دەربارەی بەرگری لە ئازادی لە تونس و مەراکشدا بەتایبەتی ئەو دەمانەی کە سوڵتان محەمەدی پێنجەم لە ساڵی ١٩٥٤دا لێ خرا، فەرامۆش بکەن. ئەوجا بەرگریکردنی لە مافی جەزایر لە سەربەستی و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا، هەرچەند هەڵوێستی دەربارەی گیروگرفتی جەزایر کەمتر ڕوونە وەک لە گیروگرفتی تونس و مەراکش، چونکە هەرچەندە باوەڕی بەمافی جەزایرییەکان هەبوو لە دیاریکردنی مافی چارنووسییاندا، مەبەست سەربەستییە، حەزیشی دەکرد، بەشێوەیەک پێوەندی لە نێوان جەزایر و فەرەنسادا هەبێ.

سەبارەت بەم هەڵوێستە جوانانەی دەربارەی بەرگری لە ئازادی و هێرشکردنە سەر زۆر و ستەم، سەبارەت بەبایەخی مرۆڤایەتی چیرۆکەکانی و سەبارەت بەدڵسۆزی بەرانبەر بەجاڕدانی دادوەری و قێزهاتنەوەی لە هێزی داگیرکەر لە ساڵی ١٩٧٥دا خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشرا، ئەو و کبلنگ بچووکترین دوو کەسێ بوون کە خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت، کە گەورەترین خەڵاتی ئەدەبییە لە جیهاندا.

کامۆ گەییبە لووتکەی نێوبانگ، بەڵام ئەم نێوبانگە تەنیا دوو ساڵ دەوامی کرد. کامۆ لە ساڵی ١٩٦٠دا لە سەعات دوو کەم پێنج دەقیقەدا لە ڕۆژی ٤ی ینایری ١٩٦٠دا جیهانی بەجێ هشت و کۆچی دوایی کرد.

## ٢

کامۆ دەڵێ مەرسۆ- پاڵەوانی سەرەکی کورتە ڕۆمانی نامۆ- لە لام ئینسانێکی بەستەزمانە، ئەو هەتاوەی خۆش دەوێ کە سێبەر لە دوای خۆی جێ ناهێڵێ. (لە پێشەکی چاپە قوتابخانەییە ئەمەریکاییەکەی ڕۆمانی نامۆ ل ٨ نیۆیۆرک ١٩٥٥ ئیلتون ستیشری وەری گێڕاوە) لە ڕاستیدا ئەو «هەستی بێ هودەییەی» کە لە وتارە فەلسەفییە درێژەکەی «ئەفسانەی سیزیف»دا هاتووە لە مەرسۆدا بەرجەستەیە، کەسێتی مەرسۆ کە باسی ئەم هەستە دەکات لەم لایەنەوە سارتەر گوتەنی: تەتبیقی تیۆری ڕۆمانی بێهوودەیە. ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە بۆچی کەڵە ڕۆمان نووسەکان پابەندن بەڕواڵەتە دیارەکانەوە، بۆ لە ڕێگای وێنەی هەست پێکراوەوە گوزارشت لە خۆیان دەکەن، لە بری وردبوونەوە و حوکمدانی ژیری و مەنتقی، مەرسۆ کە خۆی دەخاتە باوەشی ڕواڵەتە خالیسەکان و ئەزموونی ڕاستەوخۆی زیندووەوە، لە ڕاستیدا هەموو سیستەمێکی تەفسیر و لێکدانەوە ڕەفز دەکات، خۆی دەخاتە بیابانێکی خاڵی لە گشت دەلالەت و مانایەک چ شتێ بەلای ئەوەوە و بۆ ئەو نرخی نییە جگە لە واقعی ئێستای دیاریکراو، بەو حیسابەی زنجیرەیەکە لە لەحەزاتی لێک دابڕاو و ڕێبوار، چ واتا و دەلالەتێ لە ئارادا نییە، ئێمە خۆمان لە دنیایەکی دەوڵەمەندی پڕ لە وێنە و ڕەنگ و هەستدا دەبینینەوە کە چ پێوەندییەک بەیەکەوەیان نابەستێ و هیچ فیکرێ پەکیان ناخات. هەموو شتێ هەرچەند بچووک بێ نرخێکی تایبەتی و دیاری خۆی وەردەگرێ، هەموو وێنەیەک هەرچەند تەنیا و گۆشەگیر بنوێنێ، واتای خۆی وەردەگرێ.

مەرسۆ بەشێوەیەک باسی خۆی دەکات وەک ئەوەی «یەکێکی تر» بێ من «أنا» لەلای ئەو وای لێ دێت وەک ئەو «هو» بێ هەموو دەستەواژەیەک کە دەی درکێنێ، بەتاقی تەنیا دەوەستێ، چ پێوەندییەک بەدەستەواژەکانی دوای خۆیەوە نابەستێت، چ مانا و دەلالەتێک کۆیان ناکاتەوە، دەستەواژەکان پتر لەوەوە نزیکن کە ئیشارەتی خێرابن وەک لەوەی یەکەی زمان یان فیکری بن. دەبێ بەکۆمەڵێ هەست و دەرکی سەربەخۆ، کە لە پاڵ یەکدا دانراون، سیستەمێکی فیکری دیار ڕێکیان ناخات، لە نێو هەر دەستەواژەیەکدا، بۆشاییەک لە بێدەنگی و نەبوون هەیە.

مەرسۆ لە بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەدا و تا حوکمی خنکاندنی بەسەرا دەدرێ، هەست بەبێهوودەیی ناکات. خۆ ئەگەر ئەم هەستی بێهودەییە ختووکەی ناخی یەکێک بدات، ئەوا ختووکەی ئەو خوێنەرە دەدات کە ئەم هەستی نائومێدی پڕ لە غوربەتە بەبێهوودەیی ڕای دەماڵێ. خۆ ئەگەر شنەیەک دەربارەی هوشیاری لەلای مەرسۆ پێویست بێ، ئەوا لەم قۆناغەدا جۆرێکە لە وریابوونەوەی ڕاستەوخۆ، زیاتر لەو شتە دەچێ، کە پێی دەڵێن فانوسی سیحری، هەموو جارێ تیشکەکەی دەخاتە سەر وێنەیەک کە جیاوازە لەو وێنەیەی لە پێشییەوە هاتووە، وێنەکان بەدابڕاوی و دوور لە یەکدی دەمێننەوە، وەک چۆن لە شریتێکی سینەماییدا دەی بینین، چ پێوەندییەک کۆیان ناکاتەوە. ڕەنگە ئەم کەلێنە ترسناکە بێدەنگانەی کە وێنە و دەستەواژەکان لێک دابڕێ و وایان لێ دەکات وەکو خەلقەندەی ڕووت لەبەر سەرمای زستاندا هەڵبلەرزن، ئەو هۆیە بێ کە ئێمە لە کاتی خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەدا وا لێی بکات هەست بەتەنیاییەکی قووڵی ڕامالەر بکەین. مەرسۆ خۆی بۆ ئەزموونی خاڵیسە ساز دەدا، بۆ ئەو شادییەی ئێستا و لەحزەی ڕاستەوخۆ دەی بەخشێت، وەک بڵێی منالێکی گەورەیە و بۆ یەکەمین جار چاو دەکاتەوە و پاکی و بێگەردی ڕووناکی دەبینێ و لە دڵەوە گەشکە بەئاهەنگی ڕەنگەکان دەکات و بەدەم ژیانی هەموو بوونەوەرانەوە «موجودات» دەتریقێتەوە، تووڕ دراوەتە عالەمێکەوە نایناسێت و بەوە حوکم دراوە کە لە کۆمەڵگایەکدا بژی کە لە زمانی تێ ناگەن، چارەنووسی بەستراوە بەخەڵکانێکەوە، بیروبۆچوون و ڕەوشتیان شتێکی غەریبە، ناتوانێ و نایەوێ هۆگری ببێ، وەکو غەریبێ لە نێو غەریباندا دەژی، ئەو بۆ ئێمەش ئێمەی کە دەیخوێنینەوە و شوێن پێی چارەنووسی هەڵدەگرین، ئینسانێکی غەریبە چ جێیەک لە سیستەمی ئامادەکراوی قیەم و ڕەوشتماندا نابینین کە بۆ ئەو گونجابێ، ئێمە لە هەمان کاتدا هەست بەغوربەت و بێگەردی «بریء»ی ئەو دەکەین. بەڵام هەستێک، تووڕەیی و ترس و بەزەیی تێدا تێکەڵ دەبێ، ئێمە نازانین لە ئاستی ئەم ئینسانە سەیرەدا کە لە هیچەوە دەست پێ دەکات و ناشیەوێ لێی لابدا چی بکەین.

ئەلهەقی مەرسۆ ئینسانێکی بێگەردە بەهەموو واتای وشەی بێگەردی. لووتکەی بێگەردی و تاوانەکەی لە هەمان کاتدا لەوەدایە کە ئەو تاکو ئێستا ژیانی خۆی گوزەراندووە بێ ئەوەی لەلایەن خۆیەوە گومان بخاتە دڵی ئینسانێکەوە، ئەو فیشەکەی لە دەمانچەکەی دەردەچێ بۆ ئەوەی کابرایەکی عەرەب بکوژێ چاوی خەڵکی لێ دەکاتەوە. ئەم تاوانەی کە ڕێ کەوت، ڕێکەوتێکی کوێر کردی بەڕیشیەوە، بەڕێژەی وەکیل نیابەوە ئەنجامە نەک سەرەتا. تیشکی خستە سەر ئەو ژیانەی تا ئێستا



بەخەمساردی و بێ موبالاتی گوزەراندوویەتی، ئەو جگەرەیەی کە بەبێ مەبەست لەبەردەم لاشەی ڕاکشاوی دایکی، ئەو فرمێسکانەی بۆ ناشتنی دایکی نەیڕشت، ئەو چاو گەرمکردنە کەمەی، ئەو فیلمەی لەگەڵ ماری دۆستیدا دوای مردنی دایکی بەماوەیەکی کەم بۆی چوو، هەموو ئەمانە دەبن بەتاوانێک کە کەس نایەوێ پێی بەخشێت، کەواتە مەرسۆ تاوانبارێکی هەرە گەورەی تاوان بوو، گوناحی هەرە گەورەشی ئەوەیە باوەڕی بە«گوناح» نەبووە یان لە واتای تێ نەگەیی، بەرانبەر بەنەریت و خووی کۆمەڵگا بەخەمساردی و گوێ نەدانەوە دەوەستا، ئەو ئێستا لە ڕوانگەی پرسکار «محقق» و «قازییەوە» دڕندەیە و دوژمنی مەسیحە.

مەرسۆ وا سەیری مەسەلەکە دەکات وەکو ئەوەی ئینسانێکی دی موحاکەمە بکەن کە پێوەندی بەمەوە هەر نەبێ، هەستکردن بەبێهوودەیی لە ناخیدا ڕاکشاوە و، هەڵناسێت هەر چەندە ئەم ئینسانە بەتەنیا بەڕووی کۆمەڵگادا دەتەقێ، کە لە کەسێتی پرسکار و قازییەکاندا و شایەتەکان و قەشەی زیندانەکەدا و هەموو نەریتێکی ڕەوشتیدا خۆی دەنوێنێ، ئەم هەستکردن بەبێهوودەییە لەلای ئەو ناگاتە قۆناغی هوشیاری، هەموو وشەیەک کە مەرسۆ دەیدرکێنێ، لە هەستەوە و لە وێنەوە هەڵدەقوڵێ، کەچی هەر وشەیەک کە پرسکار دەیدرکێنێ دەلالەت لە مانایەک، یان شێوەیەک لە شێوەکانی سیستەمی شارستانی و کۆمەڵایەتی دەکات. بەم چەشنە مەرسۆ بەغەریبی دەمێنێتەوە لە بەردەم خۆی و لەبەردەم ئەو کۆمەڵگایەی کە تاوانباری دەکات و بەرەو مل قرتاندنی ڕەوانە دەکات.

حوکمی خنکاندنی وەکو شمشێری جەلاد دەنگ دەداتەوە، قەشەی زیندانەکە سەردانی دەکات، ئەوساکە مەرسۆ هەستی بێهوودەیی لەلا دەگاتە هوشیاری و ڕادەپەڕێ، لەو دەمەیدا کە مەرسۆ پابەندە بەشادی ئەم دنیاوە، دەبینین قەشەکە بەڵێنی شادی ئەو دنیای دەداتێ، مەرسۆ ئەم هیوایە ڕەفز دەکات، لە قەشەکە ڕادەپەڕێ و هاواری بەسەردا دەکات، هەموو ئەم مژدەیەی کە بەدڵنیاییەوە دەم دەیتێ، یەک تاڵ لە قژی ئافرەتێ ناهێنێ، یاخیبوونەکەی، ئەو یاخیبوونە نییە کە ئینسان بەناوی هەموو مرۆڤایەتییەوە بانگەواز و جاڕی بۆ دەدات، هەروەها بەناوی سروشتی مرۆڤایەتییەوە، بەڵکو یاخیبوونە بەناوی شادی سەر ئەرزەوە کە تا ئەم کاتە بەبێ ئەوەی پێ بزانێ لەزەتی لێ وەرگرتووە، «هەستم کرد، شاد بووم و هێشتاش هەر شادم» هەمان شادییە کە کامۆ لە وتاری (أعراس)دا باسی کردووە و هەڵقوڵاوی کلۆڵییەکی بێ بڕانەوەیە.

مەرسۆ لە هەموو ژیانیدا هەر بەتەنیا مایەوە، هەستی بەبوونی کەسانی تر نەکرد، تەنیا لەکاتی مەرگدا نەبێ، ئێستا بیر لە دایکی دەکاتەوە، ئەو دایکەی ئەمیان لەسەر تاوانبار کرد کە گوایە خۆشی نەویستووە، هەروەها بیر لە خەڵکی دەکاتەوە، ئەو خەڵکانەی لە نێویاندا دەمرێ. ئەمڕۆ هەموو ئاواتێکی ئەوەیە، بۆ ئەوەی هەستی تەنیایی کەم بێتەوە، لە ڕێگای چوونیدا بۆ سێدارە زۆرترین ژمارە لە تەماشاکەران ببینێ کە بەهاواری ڕق و قین و کینەوە پێشوازی بکەن.

## ٣

نامۆ بریتییه له دوو بەش، بەشی یەکەم بەکوشتنی کابرایەکی عەرەب لەسەر کەنارێک له کەنارەکانی جەزائیردا کۆتایی پێ دێ، بەشی دووەم بەوە کۆتایی دێ کە مەرسۆ له ئەنجامی ئەو کارەیدا بۆ مەقسەڵەکە دەبرێ، مەرسۆ فەرمانبەره له یەکێک له نووسینگەکانی جەزائیردا، دایکی له پەککەوتەخانەیەک دایە، برووسکەیەکی دەگاتێ و هەواڵی مەرگی دایکی تێدایه، دەست بەگێڕانەوەی چیرۆکەکەی دایکی دەکات، دوو ڕۆژ مادونی وەردەگرێ و دەچێ بۆ پەککەوتەخانەکه، بەدرێژایی ئەو شەوه بەدیار تەرمەکەی دایکییەوه دادەنیشێ بۆ سبەینێ لەگەڵ بەڕێکردنی تەرمەکەی دایکیدا بۆ گۆڕستان دەچێ، هیچ جۆره خەمێک یان هەستێک نانوێنێ، تەنیا ئەوه نەبێ له ئەنجامی گەرمادا هەست بەشەکەتی دەکات، له کاتی دانیشتندا دوو فینجان قاوه دەخواتەوه و جگەرەیەکی بەسەرا دەکات ئەنجا چاوێ گەرم دەکات.

کە دەگەڕێتەوه بۆ جەزائیر، دەزانێ ئەو ڕۆژه شەمەیه واته یەکەم پشووی کۆتایی هەفتەیه. دیاره ئەم ڕۆژه گرنگترین ڕۆژانی حەفتەیه، بۆ کەسانێ کە ژیانیان ڕۆتینه، دەچێ بۆ مەلەکردن، بەڕێکەوت تووشی ماری دەبێ، ماری کیژێکه سەرددمێک له هەمان دائیرەی مەرسۆدا کاری کردووه، له گەڵیدا دەچێ بۆ سینەما بۆ بینینی فیلمێکی هەزەلی، ئەوجا دەییاتەوه بۆ ماڵێ، دەست بەعەشقبازی دەکەن، ڕۆژی دوو شەممە وەکو جاری جاران بۆ سەر کارەکەی دەگەڕێتەوه، ئەو ژینگەیەی چینی کرێکار دەبینین کە تێیدا دەژین، سیلیست ژنێکه و خاوەنی خواردنگایەکی بچووکه، خەریکی نان خواردنه سەلمانۆ پیرەمێردێکه بەتەنێ و لەگەڵ سەگێکی پیردا دەژی، لێی دەدا و جنێوی پێ دەدا، شەوێک لەسەر بانێژەکەی خۆیەوه کە بەتەنیشت ژوورەکەی مەرسۆوەیه بۆ سەگە ونبووەکەی دەگەڕێ «ڕیمون»یش کابرایەکی ڕەوشت گوماناوییه دەڵێن گوایه، گەواده.

لێ ڕیمۆن، هەستێکی ئابڕوومەندانەی سەرەتایی تێدایه کە هەست دەکات دۆستە عەرەبەکەی خیانەتی لێ دەکات، نەخشەی تۆڵەسەندنەوه دەکێشێت، یەکەم هەنگاوی ئەوه دەبێت داوا له مەرسۆ بکات کە بەزمانی ئەووەوه نامەیەک بۆ دۆستەکەی بنووسێت، ئەوجا بەشێوەیەکی دڕندانه دەکەوێتە وێزەی دۆستەکەی و ئەمە ئاشکرا دەبێت، داوا له مەرسۆ دەکات کە له دادگا شایەتی بۆ بدات. مەرسۆش ڕازی دەبێت.

له پشووی کۆتایی حەفتەی سێیەمی دوای مردنی دایکی مەرسۆ، ڕیمۆن مەرسۆ و ماری داوەت دەکات کە ڕۆژێکی لەگەڵدا و لەگەڵ برادەرەکانی (آل ماسون) ببەنە سەر، کە دەست بەگەشت و گەردش دەکەن، چەند عەرەبێک دوایان دەکەون، دەبێ بەشەڕیان، یەکێک له عەرەبەکان چەقۆیەک له ڕیمۆن دەدات و بریندارى دەکات، مەرسۆ ناوبژی کردن و دەمانچەکەی له ڕیمۆن وەرگرت، عەرەبەکان کشانەوه، دوای فراقینێکی بەلەزەت و خواردنەوەیەکی زۆر، مەرسۆ بەکەنارەکەدا دەکەوێتە پیاسە و ڕوو دەکاتە کانییەک،



تاقه شوێنێک بوو کە له کەنارەکەدا سێبەر دەیگرتەوه، لەو دەمەدا کە لەبەر تیشکی سووتێنەری هەتاودا هەنگاوی دەنا، یەکێک له عەرەبەکانی بینی ڕاکشاوه و شا بەسەپان ناگرێ، بەهەرحاڵ هەڵدەکێشێتە دەمانچە و چوار گولله بانەو بان یەک بەکابرای عارەبەوه دەنێ و گیانی لەبەر دەبڕێ.

بەشی دووەمی سەرگوزشتەی مەرسۆ بەدەوری ئەو «١١» مانگەدا دەسووڕێتەوه کە له زینداندا بەسەری دەبات، چۆنیەتی موحاکەمەکردنی حوکمی ئیعدام، ڕۆژانی پێش جێبەجێکردنی حوکمی ئیعدام، ئەو ماوه دوور و درێژەی نێوان تاوان و موحاکەمە، تەنیا هەندێ جار حاکمی تەحقیق، موحامی ماری و کاهینی زیندانەکه دەبینێ، مەرسۆ بەهیچ جۆرێ نایەوێ بەرگری له خۆی بکات. بەشی دووەم جیاوازتره له بەشی یەکەم، بەشی دووەم له دوو ئاستدایه، ئاستی دەرەوه کە بەموحاکەمە کۆتایی دێ، ئاستی ناوەوه کە له کۆتایی ڕۆمانەکەدا دەگاتە لووتکە، ئەوەش ڕووبەڕووبوونەوەی کاهینی زیندانەکەیه، لەو دەمەدا کە مەرسۆ چاوەڕوانی ڕۆژبوونەوەی ڕۆژی جێبەجێکردنی حوکمی ئیعدامەکە دەکات.

ڕۆمانی نامۆی ئەلبێر کامۆ یەکێکە لەو کارە ئەدەبییانەی کە گەلێ گفتوگۆ و وتووێژی بەردەوامی دروست کرد، بەهاوارێکی نائومێدانە بەرانبەر بەژیان هاتە ژماردن، هەروەها وا ژمێردرا کە بەرجەستەکردنێکی ڕوانینی نەهیلستانەی ئەوتۆیە، کە ئینکاری گشت بەهایەک دەکات، ئەمە جگە لەوەی بەنیمچە مانیڤیستێک دەربارەی ئیغتیراب لە قەڵەم درا.

دیاره ئەوەش خەتەرێکه ڕوو لە هەموو کارێکی هونەری دەکات، ئەگەر بەتۆبزی لە دەرەوە بەسەریا بسەپێنرێ گەلێ لێکدانەوه و ئیفرازاتی بەسەردا بار دەکرێ، ڕەنگە لێکدانەوه و ئیفرازاتی جوان بێ، بەڵام کارەکە سڕپۆ دەکات چونکە مۆڵەتی نادات لە ناوەوه تیشک بخاتە سەر خۆی و ڕوونتر و جوانتر بنوێنێ.

کامۆ لە پێشەکی نامیلکەی (الظهر و الوجه)دا ١٩٥٧ دەڵێ: (تەنانەت ساتەکانی یاخیبوونیشم، هەمیشە پرشنگدار بوون. زرووف خستیە نێوان کوێرەوەری و هەتاوەوه، کوێرەوەرەی ڕێی نەدام دوای ئەو بۆچوونە بکەوم کە دەڵێ هەموو شتێ لە مێژوودا و لە سایەی هەتاودا چاکە و بەجێیە، هەتاویش فێری کردم کە مێژوو هەموو شتێ نییە، کە ژیان بگۆڕین بەڵێ، بەرزی بکەینەوه بۆ ڕووناکی، بۆ خۆمان، بۆ گشت بەشەرییەت بەڵێ، بەڵام کە عالەم بگۆڕین نەخێر، چونکە عالەمم کردووە بە.)

ڕەنگە بێ سوود نەبێ ئەگەر قسەکانمان پتر ڕوون بکەینەوه، ئەو گۆڕینی ژیانەی کە کامۆ باسی دەکات، ئامانجی بەرز و بەشکۆی هونەرە لای ڕامبۆی شاعیر، نزیکی نێوان ئەو و کامۆ هەر لە سنووری ئەم چەمک و تێگەیشتنی ڕۆڵی هونەرەدا نەوەستاوه، لەوە قووڵترە، ڕەگوڕیشەی لە زەمینەی ئەو هەستە هیلینە نوێیە هاوبەشەی نێوانیاندا داکوتاوه، کە بەئاشکرا بۆ وێنە لە چامەکەی ڕامبۆ (الشمس والجسد) و لە (أعراس)ی کامۆدا دەدوێ، کامۆ گۆڕینی ژیان لە پارسەنگ و بەرامبەر بەگۆڕینی عالەم دادەنێ و دەڵێ (عالەمم کردووە بەخوام) ئەگەر مەبەستمان بێ زیاتر لەو قسەیەی دوایی تێ بگەین، ئەوا دەگەڕێینەوه بۆ بۆلفالیری کە تەنیا بەڕێکەوت نییە، فالیری لە چامەی (المقبرة البحرية)دا و کامۆ لە کارە بنەڕەتییەکەیدا (أسطورة سيزيف) بەهەمان دێری پندار دەست پێ بکەن، کامۆ درێژه

بەپێشەکییەکەی دەدات و دەڵێ (دەربارەی خودی ژیان دوای تێپەڕبوونی ئەم هەموو ساڵە چ شتێکم نییە بیخەمە سەر ئەوەی لە «الظهر والوجه»دا گتوومە، کە چ خۆشەویستییەکی ژیان نییە بەبێ وەڕسبوون لێی.

کە ئەو قسەیەم کرد. نەم دەزانی تا چ ڕادەیەک ڕاستگۆیی تێدایە چونکە ساتە نائومێدییە ڕاستەقینەکانم نەدەناسی وەک لەوەدوا ناسیم. ئەوەی هەموو شتێکی لە ناخمدا وێران کرد تەنیا ئەو ئەڵها و ئارەزووە بێ پایانە بوو بۆ ژیان ئەوەی تا ئەمڕۆش هەستی پێ دەکەم، ئەوەی تاریکترین لاپەڕەکانی «الظهر والوجه» لێی دوا، بریتییە لە ئەڵهایەکی بێ وێنە و ژەم بردەبییەکی بێ سنوور بۆ ژیان بەخراپترین و چاکترین شتەوە.)

ئەوجا دەبینین لە کۆتایی (الصيف في الجزائر) و(أعراس) ١٩٣٨دا دەڵێ: (چونکە ئەگەر هەڵە و خەتایەک هەبێ بکرێ دەرهەق بەژیان، ڕەنگە ئەو هەڵەیە نائومێدبوون نەبێ لە ژیان بەئەندازەی ئەوەی وازهێنان بێ لێی بەئومێدی ژیانێکی دی لە ئایندەدا.)

ئەمە ڕوویەکی زۆر بایەخدارە بۆ چوونە ناو فیکر و تێگەیشتنی هەڵوێستی کامۆ، هەر لە سەرەتاوە وازی لە غەیبایەتی مەسیح هێنا. لە ئەنجامدا غەیبایەتی سەر زەوی ڕەفز کرد. (ئینسانی یاخی ١٩٥١) هەڵوێستی یۆنانی دەربارەی ژیان پەسەند کرد و تا ڕادەی پیرۆزی خۆشی ویست و قەدری زانی، (گالیلۆ کە ڕاستییەکی زانستی گرنگی دۆزییەوە، زۆر بەئاسانیش نوکولی لێ کرد، هەر کە بینی ژیانی لە خەتەردایە خۆی لێ بەری کرد. لە ڕوانگەیەکی دیاری کراوەوە دەتوانرێ، بگوترێ زۆر چاکی کرد، چونکە ئەوە مەسەلەیەک نەبوو کە لە پێناویدا بێتە سووتاندن، زەوی بەدەوری ڕۆژدا بسوورێتەوە یان ڕۆژ بەدەوری زەویدا بسوورێتەوە. شتێکە هاوتای ژیان ناکاتەوە) سیزیف ١٩٤٣ کامۆ وەکو هیلینییە کۆنەکان، عالەم قبووڵ دەکات، ڕەفزی ناکات، دژایەتی ناکات، خۆی لێ نادزێتەوە، بەڵکو بەخۆشەویستییەوە پێشوازی لێ دەکات، دەیکات بە(خوا) کامۆ مەلەکووتە و مەملەکەتی مەبەستەکان وەکو یەک ڕەفز دەکات، (مەلەکووت چ شتێک پێشکەش ناکات جگە لە دوورەپەرێزی و چاوپۆشی لە ژیان، کەواتە بێ کەڵکە و سوودێ ناگەیەنێ، مەملەکەتی مەبەستەکانیش جگە لە وێرانکاری چیدی پێشکەش ناکات کەواتە ئەویش بێ کەڵکە، بۆیە هەردووکیان وێڕای جیاوازی نێوانیان لە یەک شتدا یەک دەگرنەوە کە ئەویش ڕەفزی سوڵحکردنە لە گەڵ ژیانا ئەو بەهایەیە کە یاخیبوون پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێ، کەواتە شتاقیان هیچمان پێشکەش ناکەن جگە لە دوو جۆرە نموونەی زۆر دوور لە واقیعەوە.) ئینسانی یاخی.

د. عبدالغفار مكاوي لە لێکۆڵینەوە بەتامەکەیدا (ئەلبێر کامۆ، هەوڵدانێ بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری فەلسەفی، بڵاوەخانەی المعارف القاهرة)دا دەڵێ: ئەم فیکرەی کە عەقڵ ڕزگار دەکات و دەیخاتە جێگای متمانە و بڕوای تەواوەوە، کامۆ نێوی دەنێ (فكر الظهيرة) نموونەی باڵای ئەو بریتییە لە فیکری یۆنانی کە هەمیشە پەیامداری تەسەوری حەدە، پەرگیری لە هیچ شتێکدا نەکردووە، نە لە پیرۆزی نە لە عەقڵ ئەو فیکرەی توانی پارێزگاری نێوان سێبەر و ڕووناکی بکات و پایەی مرۆڤ لە سروشت و غەیب



و لە بارەگای خواکاندا دیاری بکات، بریتییە لە فیکری سنوور و پێوانە (الحد والمقياس) ئەوەش فکری یەکێتییەکی ئەوتۆیە کە چ شتێکی دەربارەی کەڵکەڵەی شموولییەت نەناسیوە، کە ئەوڕۆ هەڕەشە لە کوشتنی ئەوروپا دەکات، کامۆ گوتەنی، ئەوجا د. مەکاوی دەگەڕێتەوە سەر باسەکەی و دەڵێ (فیکری ظهیرەی یۆنانی لە لای ئەلبێر کامۆ فیکری نیوەی شەوی ئەوروپا دەگەیەنێ کە بەوپەڕی خێراییەوە بەرەو داگیرکردنی شموول دەچێت و بێ وچان سنوورەکان دەبەزێنێ تا خۆی بخاتە گێژاوی سەرکێشی و ملهوڕی بێ سنوورەوە.)

لەپاڵ ئەو هەستەدا بەنرخی ژیان، هەستی تامەزرۆیی ژیان ئەو تامەزرۆییەی کە هەرگیز لە جۆش و خرۆش ناکەوێ، هەستی بێهوودەییش لەلای کامۆ دەبینین، ئەو هەستەی وای لە کامۆ کرد لە سەرەتای سیزیفدا بڕیاری ئەوە بدا کە یەک مەسەلەی فەلسەفی هەیە و لە ڕاستیدا خەتەرە، مەسەلەی خۆکوژی (حوکمدان لەسەر ئەوەی ئاخۆ ژیان ئەوە دێنێت یان ناهێنێ کە بژیت، ئەوە مەبەستی گەوهەری فەلسەفەکەیە.)

شان بەشانی مەسەلەی خۆکوژی، هیوا و ئومێد دەبینین. (سندووقی باندورا کە گشت بەڵا و نەهامەتییەکی ئینسانی تێدا کۆبۆتەوە، یۆنانییەکان لە ئەنجاما هیوا و ئومێدیان لێ دەرهێنا، دوای گشت خراپەکارییەکانی دی، بەو حیسابەی لە هەموویان خراپترە. لە ڕاستیدا من چ شتێ نابینم لە ڕەمز و هیمایە کە کاریگەرتر بێ لە دەروونا، چونکە ئومێد بەپێچەوانەی باوەڕی باوەوە، بەرامبەر بەتەسلیم بوونە (الصيف في الجزائر) بەڕادەی ئەوەی کە کامۆ خۆکوژی جەستەیی ڕەفز دەکات. خۆکوژی میتافیزیکیش ڕەفز دەکات، هیوا، خۆکوژی، سووکایەتی پێکردنی بوونە، نکۆڵی کردنە لە بوون، لە سیزیفدا دەپرسێ (ئاخۆ بێهوودەیی بوون، ناچارت دەکا لە ڕێگای هیوا یان خۆکوژییەوە لێی هەڵێیی؟) هەڵبەت وەڵام لە گشت بیرکردنەوەیدا نەئە ئەی چار- ئەگەر چارێک هەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەی بێهوودەییش ئەوا خۆکوژی نییە، خۆ دۆزینەوە لە عالەمدا نییە هەروەها چاوەڕوانکردنی عالەمێکی دی نییە کە کەڕ و ناماقوڵ نەبێ. چار لە بەزاندنی سنووری خودی بێهوودەییەکەدایە، بەزاندنی سنووری ڕاکردن و هەڵاتن لە بێهوودەییە یاخۆ هەڵخەڵەتاندنی ئینسان خۆیەتی، بەڵکو هەنگاو نانە بەرەو ناوجەرگەیان، بەرەنگاربوونەوەی ژیانە بەوەی تێکەڵی ببێ و ئالکاوی ببێ و بیدۆزێتەوە و تێیدا بژیت (ئینسان لەسایەی هەستکردن بەبێهوودەییدا لە ژانەکان ورد دەبێتەوە، بتەکان کەڕ دەکات ئەوسا کە زەوی لە کەونیدا، کە لە پڕ ناچاری بێدەنگی کراوە، لە ڕێگای هەزاران دەنگی بچکۆلەی ئاوێتەی دڵبەندییەوە دێتە زمان و گۆ. چ هەتاوێ بێ سێبەر نییە و پێویستە شەو بناسین. (سیزیف). ئینسانێک کە هەست بەبێهوودەیی بکات، دەتوانێ بەهیواوە سەرقاڵ بێ، ئەگەر هیوا هەبێ- نابێ لە ڕاستیدا- ئەوەندە سەرقاڵی بکات، بەئەندازەی ئەوەی کە پێویستە دەستبەرداری هەڵاتن و خۆ هەڵخەڵەتاندن بێ. (هەمان سەرچاوە).

تێکەڵبوون و چوونە ناو ژیان لە بەرامبەر بێهوودەییدا، لەلای کامۆ یاخیبوونی بێ وچان دەگەیەنێ، یاخیبوون بەواتای ڕەفزکردنی ناماقوڵییەتی عالەم، چاو نەپۆشین و خۆنەدزینەوە لە عالەم.

دیاره ئەم نوێشە کورتە، مۆڵەتی ئەوە نادات تەواوی هەڵوێستەکانی کامۆ بخرێتە ڕوو. یان دەرفەتی ئەوە نادات هەموو ئەو ڕێگایانە، شی بکرێنەوە کە بیری کامۆ پێیدا تێپەڕیوە، لێرەدا مەبەستمان گەلاڵەکردنی پوختەیەکە کە ڕووناکی داخلی بخاتە سەر عالەمی چیرۆکی نامۆ. وتمان ژیان، بۆ خۆی لە خۆیدا، قیمەتی هەوەڵ و ئاخیرە لەلای کامۆ چ قیمەتێکی دی لەو بەرزتر نییە، دیارە لە بەرامبەر ئەم قیمەتە بەرزەشدا حەتمیەتی مەرگ و بێهوودەیی بوون هەیە. لە نێوان ژیان و مەرگیشدا ڕەفزی تەنازول و خۆکوژی هەیە، ڕەفزی هەڵاتن و خۆ هەڵخەڵەتاندن هەیە، هەوڵێکی یاخیبوونێکی بێ بڕانەوەیە، تاقە ڕێگایە بۆ بەزاندنی سنووری بێهوودەیی و تێکەڵبوون بەژیان. هەروەها گەڕانە بەدوای وەعیدا. وەعی بەبوون، لە ڕاستیدا ئەم هەست و وەعیە لەو بازنە داخراوەدا- بمانەوێ و نەمانەوێ- هەستکردنە بەبێهوودەیی، بەبێکەڵکی هەموو جۆرە کارێ، بەپووچی و بێ مانایی هەموو هەوڵێک، (هەستان، ترام، چوار سەعات کارکردن، خەوتن، دووشەممە، سێ شەممە، چوار شەممە، پێنج شەممە، هەینی، شەممە. هتد. ئەمە ڕێگایەکە هەمیشە ناگیرێتەبەر، چونکە زۆر نابات پرسیارێک لە دەرووندا قووت دەبێتەوە، بۆچی، ئەوکاتە هزر بێ بەش دەبێ لەو وەنەوزە پێویستەی بەردەوام بوونی ژیان) نامۆ.

لێ ئەو هەستە بۆ خۆی، ئەو وەئاگاییە سەختە، ئەو ڕووبەڕووبوونەوە بێ پەردەیەی بوون لە ناو جەرگەی بێهودەییەوە تاقە ڕزگاربوونێکی لەبارە، ڕزگاربوونی چی؟ ڕزگاربوونی ڕۆح وەک (باوکە بانیلو) لە (ڕشانەوەدا) دەیلێ؟ نەخێر، ڕزگاربوونی جەستەکانە وەک کامۆ بەزمانی (دکتۆر ڕیو)وە لە هەمان بەرهەمدا دەیلێ، ئەوە ڕزگاربوونێکە لە لای کامۆ چ ڕێگایەکی بۆ نییە، جگە لە ڕێگای هەستەکان نەبێ.

کامۆ لە چیرۆکی نامۆدا- لە شەخسیەتی مەرسۆدا- بوونەوەرێکی حسسی خالیسە پێشکەش دەکات. ژیان لە لای بریتییە لە تێرکردنێکی جەستەیی بەردەوام، بەڕادەیەک وای لێ دەکات بەئاشکرا و بەو سادەییەی کە لە ئەنجامدا بەرەو مەقسەڵەی برد بەئەوقاتەکەی بڵێ کە (پێویستییە جەستەییەکانی زۆر جار زاڵ دەبێ بەسەر هەستەکانیا و دەیشێوێنێ) و ئەو ڕۆژەی کە دایکی نێژرا (ماندوو بوو، بەرادەی پێویست دەرفەتی نوستنی بۆ نەڕەخسا.)

کامۆ لەمەڕ ئەو پاڵەوانەی، گوتوویەتی (ئینسانێکی بەستەزمانی ڕووتە، ئینسانێکە، خەڵکی ظهیرەیە) ئەگەر بیرمان بێتەوە ئەم بت پەرستە، ژیا، حوکم درا و لە ڕژێمێکی ئەوروپایی مەسیحیدا کوژرا. بەگوێرەی فیکری کامۆ هەڵقولاوی نیوەشەوە، هەڵبەت ئەوەش دەزانین کە بۆ وەک بەستەزمانێ دەیبینێ، بۆچی وەک خۆی نێوی ناوە بێگانەیە، دیارە ئەمە فێلێکی ڕۆمان نووسی نییە کە هەتاو ئەو ڕۆڵە گرنگە لە ڕۆمانی نامۆدا ببینێ، مەرسۆ لەو دەمەدا پیاوی کوشت کە لەژێر کارتێکردنی هەتاودا بوو، ئەمەشی بۆ هەموو ئەوانە دووبارە دەکردەوە کە پرسیاریان لەمەڕ هۆی تاوانەکەی کردبا واتە ئەمەی لە کەس نەدەشاردەوە! هەتاو سەرە گێشکەی پێ خست، کەوتە وڕێنەکردن، پەنجەی بەپەلەپیتکەوە نا و ئینسانێکی دی کوشت، وەک ئەوەی ڕەوتی کارەکە ئەوە بڵێ کە مەرسۆش نێچیرێکە، وەکو نێچیرەکەی خۆی، چونکە خەڵکی شارستانیەتێکی ناکۆک و نامۆ و قەرزاربارە ئەمە دەلاقەیەکە کە دەتوانرێ لێوەی



بڕوانرێتە شەخسیەتی مەرسۆ، دەلاقەکەی دی ئەوەیە کە سارتەر ئیشارەتی بۆ کردووە مەرسۆ حیکایەتەکەی بەرجەستەکردنێکی ڕۆمانی بێهوودەییە.

مەرسۆ لە دەلاقەی یەکەمەوە، وەکو خەڵقەندەیەک لە چوارچێوەی ئەو شارستانیەتەدا دەسوڕێتەوە، کە فیکری یۆنانی تێدا لە دایک بوو، کە کامۆ و هەموو کامۆ ئاساییەکان هەوڵیان دا سەرلەنوێ زیندووی بکەنەوە، بۆیە ئینسانێکی بت پەرست و لە سایەیی شارستانیەتێکی نامۆی لە دەرەوە هێنراودا دەژی، شارستانیەتێک کە لە ساتی مێژوویی کارەساتەکەیدا زاڵ و باوە، بۆیە وەکو نامۆ و بێگانەیەک دەژی، ڕەفز دەکرێ، قەرزاربار دەکرێ، دەکوژرێ، چونکە بێگانەیە.

لە دەلاقەی دووەمەوە کە سارتەر وەری دەگرێ و بۆ لێکدانەوەی بەرهەمەکە لەسەری دەوەستێ سوورە لەسەری- خەلقەندەیەکی عەبەسییە- گەرچی تەنیا لەو ساتەدا هەست بەبێهوودەیی دەکا، کە لە زیندانەکەیدا ڕووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە.

بەرهەمەکە، وێڕای ئەمە و ئەوە، بەرجەستەکردنی ڕوانینێکی یەجگار قووڵ و بەئازارە بۆ ڕوویەک لە ڕووەکانی بێهوودەیی ژیان، کە دەقاو دەق ڕووی پەیوەندی تاکە بەخەڵکەوە و ڕادەی خەتەری بەڕێژەی تاکەوە، هەر لەبەر ئەوەی ئەو تەنیا باڵە و ئەوان زۆرن. ئەوە ڕوویەکە دەمانگەیەنێتە زەمینەیەک کە زۆر جار کامۆ ڕووی تێ دەکات، سەرقاڵییەکی بنەڕەتی بۆ پێک دێنێت، گیروگرفتی عەدالەت وا بزانین پێویست بەوە ناکات بڵێین کاری گەورەی هونەری وەک کارەکانی ئەم نووسەرە، دەجووڵێ و دەژی و گەواهی خۆی لە دەلاقەیەک زیاترەوە دەدات، قووڵی و چاکی و گشتیەتی خۆی لەم فرە لایەنییەوە وەردەگرێ، لە دەوڵەمەندی بەپیتی جیهانی ناوەوەی وەردەگرێ.

ڕەنگە خراپ نەبێ لەلایەکی ترەوە ئەوە بڵێین کە بابەتی نامۆ لەو کارانەی کامۆ کە لە پاڵ سێ بەرهەمی تریدا ئەگەر ئەم دەربڕینە دروست بێت- نووسەر بیر و توانای داهێنانی خۆی تێدا خستە کار بۆ شیتەڵکردنەوەی ئەوەی کە لە پێشەکی سیزیفدا ناوی لێ نا (ئەو هەستی بێهوودەییەی کە مرۆڤ دەبینێ لەم سەدە باو و بڵاوەدا) بۆ ئەمەش ڕێگای جودای شێوەی ئەدەبی و شێوازی چارەکردنی گرتە بەر (نامۆ ١٩٤٢، ئەستورەی سیزیف ١٩٤٣، بەدحاڵیبوون ١٩٤٤، کالی گولا ١٩٤٥،) لە ڕاستیدا چ ڕێگایەک نییە بۆ تەماشاکردنی بەرهەمێک لەم بەرهەمانە، بێ سیانەکەی دی، ئاخۆ ئەمە ڕێکەوتە، کە مەرسۆ لە زیندانەکەیدا چاوی بەپارچە ڕۆژنامەیەکی دڕاو بکەوێ و ببێ بەهەوێنی کارەساتێکی بێهوودەیی لە شانۆگەری (بەدحاڵیبوون)دا؟

شایەنی باسە ئەوەش بڵێین کە کامۆ لە پاڵ ئەوەدا کە یەکجار سەرقاڵی چەمکی عەدالەت بوو، وەک زۆربەی ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەشی قینێکی یەکجار زۆری لە سزای خنکاندن بوو، کامۆ هونەرمەندێکی مەزن بوو، تیورسینێکی گەورە بوو، پیشە وردەکەشی خستە خزمەت بیرەکانییەوە و توانایەکی چاکی لە بەکارهێنانی چەکی تەوس و توانجدا خستەکار... دەبا ئێستاش لە دیوی ناوەوە بڕوانینە بەرهەمەکانی، مەرسۆ کێیە؟ یا بەشێوەیەکی تر بڵێین مەرسۆ چییە؟ ئەو شەخسیەتە لە کارەکەدا دەژی، دەجووڵێ، کار دەکات و وەکو هەر ئینسانێکی ئاسایی توانایەکی هەیە، هەست دەکات زیاد یان کەم، هەستێکی

جەستەیی جیای دەکاتەوە بێ ئەوەی دای ببڕێ یان جیای بکاتەوە یان شازی بکات، هەستێکی جەستەیی بەهێز کە هەمیشە عەودالّی دوای تێربوونە، مەرسۆ دەڵێ (ویستم ئەوەی بۆ بسەلمێنم کە تەواو وەکو هەموو خەڵکی دیم، چ جیاوازییەکم لەوان نییە، بەڵام سەیرم کرد ئەمە سوودێکی ئەوتۆی نییە، لەبەر تەمەڵی وازم لێ هێنا) ئەوجا دەڵێ (لێی پرسیم ئایا من دایکم خۆش ویستووە، گوتم بەڵێ وەک گشت خەڵکانێ) لە کۆتاییدا بەسەرسامییەوە دەڵێ (نەم دەتوانی تێبگەم کە چۆن کرا خەسڵەتی ئاسایی مرۆڤ ئەو خەسڵەتانەی لە هی خەڵکانی دی جیاواز نییە، هەڵبگەڕێندرێتەوە و ببێ بەتۆمەتی کوشندە و بەڵگەی تاوانبارکردن.)

ئەمە بەرەو لایەنەکەی دی مەرسۆمان دەبات، ئەو کەسێکی دییە، بەڵام دیسانەوە- لەوەشدا وەکو هەموو خەڵکێکی دی- تاقە کەسێکە و خەڵکانێکی زۆر تێی ئالاون، گەلێ کۆسپی لە ڕێگادایە، پێوانە و پێوەر، گەلێک داوای کۆمەڵایەتی کە پێویستە لە تاکا هەبن بۆ ئەوەی ڕێگای ژیانی پێ بدرێ، هەموو ئەمانە شێوەی دارِشتنی مەحکەمیان وەرگرتووە، بوون بەدروشم و نەریت، لە ڕێگای خۆیانەوە بوونەوەرە ئینسانێکان دادەڕێژن و لە قاڵبیان دەدەن، لە سەرجەمی ئەوانەوە ڕژێمێکی نا شەخسی ئەوتۆ دروست دەکەن کە بتوانێ لە هەر کاتێکدا دەستی دەستەڵاتدارێتی خۆی بەئاسانی بۆ هەر تاکێ بەرێ و لەتوپەتی بکا، ملی ژێوە بکات، وەک ئەوەی لەگەڵ مەرسۆدا کرا.

جارێکی دی ئیشارەت بۆ قۆناغەکانی کامڵبوونی داهێنانی کامۆ دەکەین، لە سەردەمی گەنجیدا بەگەشانەوەی فیکری هیلینی کە بەدرێژایی ژیان لەلای نەکوژایەوە، دەستی پێ کرد (الظهر والوجه) و(اعراس) ئەوجا قۆناغی هەستکردن بەبێهوودەیی، دوای ئەمە قۆناغی یاخیبوون، ئەم قۆناغە بە(ڕشانەوە) ١٩٤٧ دەستی پێ کرد، دوای ئەوە (حالة حصار) ١٩٤٨، (العادلون) ١٩٤٩، دواجار (ئینسانی یاخی) ١٩٥١.

لە سەرەتای قۆناخی یاخیگەریدا (ڕشانەوە) کامۆ دەگەڕێتەوە و سەر گیروگرفتەکەی مەرسۆی پاڵەوانی چیرۆکی نامۆ، (عرافە) کە لە بەردەم جران و کوتاردا دەڵێ (وەڵڵایی ئەگەر گشت ئەم ئۆباشانە بخرێنە زیندانەوە ئیدی پیاوماقوڵان دەتوانن بەرەحەتی و ئاسوودەیی بژین). مەبەستی ئەم شەخسیەتە وردە بورجوازیە ئاشکرایە، خەڵکانی ماقوڵ دژ بەئۆباشەکانن. ڕەفزکردنی لایە جیاوازەکەی دی، تاوانبارکردنی. تەنانەت لە بواری ڕشانەوەشدا دەرفەتی پیاوماقوڵ یان ئۆباش نادات هەناسە بدەن. کامۆ وەک ئەوەی هێشتا نیگەرانی تاوانبارکردنی مەرسۆ بێ لەلایەن پیاو ماقوڵانەوە، بۆیە بەم شێوە تەوس ئامێز و پڕ لە سەرسامییە دەگەڕێتەوە سەری.

بێگومان مەرسۆ تەنیا، مەرسۆی کائینی ئینسانی، ئەو مەرسۆیە نییە کە مەکینەی ڕژێم، ڕژێمی ناشەخسی خستی. مەرسۆ ئەوسا کە وەک یەکێکی نوقسان، عەیبدار و جیاواز لە سیستەمی شێوەی پیاوماقوڵان و ئارەزووەکانیان بینراوە، چی؟ کەسێ لە مەرگی دایکیدا ناگری؟ بەو تۆمەتە حوکم درا، تاوانبار کرا و لە سێدارەدرا، بۆ ئەوەی ژیانی بکەوێتە قەبێڵی جیاوازی ئەم سیستەم و شێوەیە کە دەبوو وابێ، لە سێدارە درا وەک ئەو کەلوپەلە عەیبدارەی خەسڵەتی چاکی تێدا نییە و نێوی کارخانەکەی پێ



دەزرِێ. بێگومان مەرسۆ لەسەر ئەوە محاکەمە و ئیعدام نەکرا (تەوس و توانجی کامۆ ئا لێرەدایە) کە ئینسانێکی دی کوشت، بەڵکو زیاتر لەسەر ئەوە محاکەمە و ئیعدام کرا کە بەپێی داب و دەستووری پیاوماقوڵان ڕەفتاری نەکرد.

هەموو نرخێکی تاوانە ڕاستەقینەکەی ئەوەیە، کە ڕێگای خۆش کرد بۆ ئەوەی دادگای بۆ دابنرێ و دەستی لێ بوەشێنرێ، نەک لەبەر ئەوەی پیاوکوژە، بەڵکو لەبەر ئەوەی (هەست سزە، یاخییە، دوژمنی مەسیحە) کامۆ ڕەفزی هەڵوێستی پیاوماقوڵان دەکات، بەرهەمەکە بەخۆ هاوار دەکات، ئەگەر مەرسۆ لەبری جگەرەکێشان و قاوە خواردنەوە، بەسەرتەرمی دایکیدا بگریایە، ئەگەر لە کاتی ناشتنیدا وەک پێویست بوو بکرێ دەستی بەگریان کردبا، ئەگەر ڕاستەوخۆ لەگەڵ دۆستەکەیدا بۆ سینەما نەچوویایە، ئەگەر ئەمە و ئەوەی نەکردبا، سەرباری هەموو ئەمانەش ئەگەر ڕاستگۆ نەبایە نەدەچووە پای قەنارە، چ عەیبێکی نەدەبوو، لە لایەن کۆمەڵگای پیاوماقوڵانەوە، وەکو بێگانەیەک تەماشا نەدەکرا و دەرخواردی مەرگ نەدەدرا.

هەستکردنی کامۆ بەو جیاوازییە پووچەڵە، کاژە خەمێکە و بەسەر لووتکەی بەرهەمەکەوە دیارە، لەلایەکەوە سەرقاڵی پابەندی سەرقاڵییە ئەخلاقییەکەی یەکەمیەتی، بابەتی عەدالەت، لەلایەکی دیکەوە لایەنێکە لە لایەنە ماندووەکانی بێهوودەیی، لێ تەنیا کامۆ هەستی پێ ناکات، مەرسۆش هەستی پێ دەکات و ئێمەش لەگەڵیا هەستی پێ دەکەین، سۆزمان بۆی دەجووڵێ، بێ ئەوەی بەخۆمان بزانین لە تەکیا دەوەستین، نووسەر بەزەبری پیشەکەی و لە ڕێگای بەکارهێنانی زمانەوە توانی بمانخاتە هەڵوێستێکی ئەوتۆوە، کە لایەن و تای پاڵەوانەکەی بگرین، وای لێ کردین ڕوانین و بۆچوونی ئەو پاڵەوانە وەک مەسەلەیەکی سەلماو وەربگرین، لەگەڵیدا یەک دەکەوین کە تاوانبار نییە، وێڕای ئەوەی خەڵکانی دی تاوانباریان کردووە- کە لە ڕووی یاساوە شیاوە- ئەوەی سەیرە، ئەو خۆی قینیان لێ هەڵناگرێ بەڵام ئێمە – وەک خوێنەر قینیان لێ هەڵدەگرین و بەپیاوکوژیان دەژمێرین.

وێڕای ئەمەش هەر ئەو مەرسۆیەی کە ئێمە بەزەییمان پێدا دێتەوە، گومان لە بکوژی ناگرێ، ژیانی زەلامێکی دی سڕیەوە، کە ئەو مافەی نییە، لە ڕاستیدا کە حوکم درا لەسەر تاوانێکی ئاڵۆز و نادیار حوکم درا، (چونکە هەست سز و دوژمنی مەسیحە) ئاسایی بوو تاوانەکەی لە بیر بکات و بپرسێت جا ئەوان حەقیان چییە کە من لەسەر گۆڕی دایکم نەگریا بم؟ ئەو – لە ناخی خۆیدا- هەست بەتاوانی کوشتن ناکات، ئەو تاوانە ڕاستەقینەیەی کە کردی، بەڵام گشت ئەمانە ئەوە ناگەیەنن کە پیاوکوژ نییە، ئەی چۆن ئێمەی خوێنەر هاوسۆزی لەگەڵدا بکەین، تاوانەکەی ئەو فەرامۆش بکەین و قازیەکانی تاوانبار بکەین؟

ئەوە پیشەکەی کامۆیە و لە پشت پەردەی پیشە بەبرِشتەکەیەوە ڕوانگە ئینسانییە- ئەخلاقییەکەی ڕامان دەکێشێتە پاڵ خۆی، لە ڕێگای تەوس و توانجەوە، لە ڕێگای تاوانبارکردنی ڕەواوە بەتەواوی وەعزەکەی هەڵگێڕایەوە، تێکڕای مەکینەی ڕژێمی کۆمەڵایەتی گۆڕی و بەشێوەیێ تاوانباری کرد کە تاوانی پاڵەوانەکەی لە بیرمان بردەوە و چووینە پاڵ پیاوکوژەکە و قازیەکانمان تاوانبار کرد. بۆچی؟ و

چۆن؟ چونکە چەمکی عەدالەت هەموو - لەو چوارچێوەیەدا- دوای ئەوەی قازی-یەکان بەو شێوەیە بەکاریان هێنا، لە گشت پاکانەیەکی ئەخلاقی ڕووت بووەوە. بەڵام چونکە کامۆ ڕێگایەکی ئاسایی بەکار هێنا، بەئەسپایی پاڵی پێوەناین و خستینیە دەرەوەی سنووری ئەو بیرکردنەوەیەی کە پێی ڕاهاتبووین، کەمێ جوولاندینی و وای لێ کردین لە دوورەوە شتەکان ببینین و حوکمی بەسەرا بدەین لە بری ئەوەی خۆمانی تێ فڕە بدەین و ڕامان بماڵێ، ڕوجیە کویلیو لە کتێبی (البحر والسجون)دا دەڵێ ئامانجی سەرەکی کامۆ لە چیرۆکی نامۆدا ئەوە بوو شەخسیەتێ دروست بکات کە خۆی لە چوارچێوە و ناوجەرگەی هەندێ هەڵوێستدا ببینێتەوە و بەڵێ مەرسۆی ئاشنامان پیاوکوژە عەدالەتی بەشەر تاوانباری کرد، لێ ڕوونە کە ئەو ڕووداوە تەنیا بۆنەیەکە و ڕێ بۆ نووسەر خۆش دەکات کە مەبەستە سەرەکییەکەی ئەنجام بدات، عەدالەت بخاتە قەفەزی تاوانبارییەوە و لەپاڵ ئەودا هەموو کۆمەڵ بخاتە قەفەزی تاوانبارییەوە، بەو چەشنە هەوڵی نووسەر بۆ ئەوە بوو کە نامۆکەی بکات بەئینسانێکی ئاسایی وەک ئێمە. تەبا بین لەگەڵیا، لە تەکیا بوەستین، ئەوسا کە ئەو نامۆ و بێگانە نابێت بەڵکو بەڕوانینی کامۆ کۆمەڵ بێگانە دەبێ، کۆمەڵی (نیوە شەو) کە بەبێگانەی دەزانێ لە نێو ژیاندا.

کامۆ لە (الظهر والوجه)دا دەڵێ عالەم مانای قووڵی خۆی بەدەستەوە نادات تەنیا بەخستنەڕووی ڕادەی (سادەییە بێهوودەکەی) نەبێ، مەرسۆ کە مەقسەلەکەی نزیک دەبێتەوە (... گشت شتێ زۆر سادە و ئاساییە) (ئەوەی ئێستا بەلامەوە مەبەستە ڕاکردنە لە مەکینەکە، ڕۆژنامەکان هەمیشە باسی قەرزێ دەکەن کە دەبێ بدرێتەوە بەکۆمەڵ، لێ ئەوەی ئێستا کە مەبەستە، ئەوەیە بتوانم هەڵێم، قەڵەمبازێ بۆ دەرەوەی دابودەستووری بدەم کە دانامرکێتەوە ئەوجا ڕاکردنە شێتانە، لەوانەیە هیوای ئەوە هەبێ مرۆڤ لە کاتی ڕاکردندا باڵندەیەک بەفیشەکێ لە ئاسمانەوە بخاتە خوارێ. بەڵام من ئەو لەزەتە لە کوێ بێنم، مەکینە گەمارۆم دەدات و زۆر بەئاسانی دەستم بەسەردا دەگرێ، مرۆڤ هێندە بەئاسانی لە مەقسەڵە نزیک دەبێتەوە وەک ئەوە وایە بۆ پێشوازی یەکێکی دی بچێت، بەبێدەنگی دەکوژرێ، بەشەرمەزاییەکی کەمەوە و بەشانازییەکی زۆرەوە، مەکینە خۆی هەموو شتێ دەستەبەر دەکا و گشت شتێ هەڵدەلووشێ).

ئەمە لە ڕوانینی کامۆوە دوو جاران بێ هوودەییە، بێهوودەیی بوون لە کەوندا کە تێیدا دادەنرێین بۆ ئەوەی بمرین، و بێهوودەیی ژیان لەو دەمانەدا کە دەمی لەدایکبوون لە دەمی مەرگ جیا دەکاتەوە... بەم شێوەیە بوون و ژیان تاقە ڕێگایە بۆ بەزاندنی سنووری هیوا و خۆکوژی... ئەوەیە کارەساتی ئەبسێردیەت و ئەولاتریش لە گیروگرفتەکەی مەرسۆدا، ڕەنگە هەستکردنی پڕ لە ژان بەم کێشەیە وای لە کامۆ کردبێ کە بلێ لە (نێوان بەڵێ و نە)دا،... نەک ئومێد و هیوای ڕۆژانی چاکتر، بەڵکو بێ موبالاتییەکی بێگەردی سەرەتایی بەرامبەر هەر شتێک هەیە، بەرامبەر خۆم. بەڵێ، هەموو شتێک سادە و ئاسانە، خەڵکی شتەکان ئاڵۆز دەکەن، بۆ وێنە کە یەکێ حوکمی ئیعدامی بەسەردا دەدرێ، خەڵکی چ پێویستیان بەوەیە بڵێن بۆیە دەکوژرێ، تا قەرزی کۆمەڵ بداتەوە؟ ئایا ئەوەندە بەس نییە بڵێن لەسەری دەدرێ؟

تێبینی

بڕوانە گۆڤاری گزنگ، لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد ژمارە: ٥ و ٩



# بەشی یەکەم

## ١

ئەورۆ دایکت مرد.

چ دەکرێ، ئیدی ئەوە ژیانە، نازانم ڕەنگە دوێنێ مردبێ، لە داڵدەوە ئەم تەلەگرافەم پێ گەیی، دایە مردووە، سبەینێ کفن و دفن دەکرێ و دەنێژرێ، ڕێزمان هەیە.

ئەم تەلەگرافە هیچی نەدەگەیاند، ڕەنگە دوێنێ مردبێ، داڵدەی پیر و کەنەفتەکان بیست کیلۆمەترێک لە شاری جەزایرەوە دوورە، سەعات چوار سواری ترومبێل دەبم و بۆ دوای نیوەڕۆ دەگەمە جێ، بەم تەرحە دەتوانم بەشداری پرسەکە بکەم و سبەی عەسر دەگەڕێمەوە.

داوای دوو ڕۆژان مۆڵەتم لە مەسئولەکەم کرد. نەدەهات بەخەیاڵمدا ئەم مۆڵەتە کورتە ڕەفز بکات، نایتوانی، چونکە مەسەلەی مەرگ لە ئارادا بوو، لێ دیار بوو کە پێی خۆش نەبوو، تەنانەت پێم گوت: «ئەمە ئەنجامی هەڵەیەکی من نییە» هیچ وەڵامێکی نەدامەوە بیرم کردەوە کە نەدەبوو ئەمەی پێ بڵێم، بەهەر حاڵ چارم نەبوو و نەدەبوو تەوازۆی لێ بخوازم، بەڵکو دەبوا ئەو دڵخۆشی منی دابا و سەرخۆشی لێ کردبام. هەڵبەتە کە سبەینێ بەرەشپۆشی بم بینێ، ئەمە دەکات، بەڵام ئێستا وەکو ئەوە بوو کە هێشتا دایکم نەمردبێ، کە مردوو بەخاک سپێردرا ئەو جا شتەکە ڕواڵەتێکی ڕەسمی و جدی تر دەگرێتە خۆ هەر کەسە ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا. سەعات دوو، سواری ترۆمبێل بووم، دنیا زۆر گەرم بوو، لە خواردنگاکەی سیلستدا فراڤینم خوارد، هەموویان بەخەمەوە بوون بۆم، سیلست پێی گوتم، بەڕاستی مەخابنە، مرۆڤ لە دنیادا لە دایکێ زیاتری نییە، کە ویستم بڕۆم تاکو بەردەرگا لە گەڵمدا هاتن، کەمێک نیگەران و تۆزێ خەیاڵم بڵاو بوو، چونکە دەبوایە بچمە نک ئەمانویل و بۆینباخێکی ڕەش و جلی تازیێی باری لێ بخوازم، ئەویش چەند مانگێ لەمەوبەر مامی مردبوو.

بۆ ئەوەی دوا نەکەوم، دەستم بەغاردان کرد، ئەم پەلەکردن و ڕاکردن و بۆنی بەنزین و قیر و ئەسفەلتی جادەکە هێندەی دی دە ئاڵانە باری نالەباری دەروونم و کاسیان دەکردم، بۆیە بەدرێژایی ڕێگاکە خەو بردمییەوە، کە لە خەو هەستام دیتم کەوتبووم بەسەرشانی ئەفسەرێکدا کە لەتەکمەوە دانیشتبوو، بزەیەکی بەڕووما دا و پرسی: وێ دەچێ لە دوورەوە هاتبی، بۆ ئەوەی لە کورتی بیبڕمەوە بواری درێژدادڕی نەدەم گوتم، بەڵێ.

داڵدەکە دوو کیلۆمەترێک لە گوندەکەوە دوور بوو، تەواوی ئەو ڕێگایەم بەپێ بڕی، بۆیە پەلەم کرد، تا بەر لەوەی بەخاکی بسپێرن جارێکی دی دایکم ببینم، دەرگاوانەکە ڕێی نەدام، گوتی دەبێ سەرۆکی داڵدەکە ببینم، چونکە سەری قاڵ بوو کەمێک چاوەڕوانم کرد، دەرگاوانەکە لەم ماوەیەدا سەرومر قسانی دەکرد، سەرۆکی داڵدە لە نووسینگەکەی خۆیدا پێشوازی لێ کردم و خێرهاتنێکی گەرمی کردم، پیاوێکی پیری کورتە باڵا بوو، گەلێک میداڵی شەرەف بەسەر سینگیەوە دەبریسکانەوە، بەچاوی ساف و گەشەوە

لێم ورد بووەوە، دەستەکانی بەتوندی گوشیم، بەڕادەیەک نەمتوانی دەستم دەنێو دەستی دەربێنم، ئەوجا فایلێکی دەرهێنا و گوتی: «خات مەرسۆ سێ ساڵ لەوەو بەر هاتۆتە ئێرە، تۆ تاقە پشت و پەنای بوویت».

وام زانی دەیەوێ لۆمە و سەرزەنشتم بکات، بۆیە دەستم بەباسکردنی بابەتەکە کرد، لێ قسەکەی بڕیم و گوتی: پێویست بەپاکانە ناکات، من فایلەکەی دایکتم خوێندۆتەوە، تۆ ناتوانی پێویستییەکانی دابین بکەیت، ڕەحمەتی پێویستی بەپەرستارێک هەبوو، تۆش مووچەکەت کەم بوو، بەهەمموو حیسابێک دایکت لێرە ئاسوودەتر بوو. گوتم: « بەڵێ جەنابی سەرۆک» گوتی: بەخۆت دەزانی، ئەو لێرەدا دۆستانی هاوتەمەنی خۆی زۆر بوو، دەیتوانی لەگەڵیاندا هەڵبکات، ئەو پیرێژنێکی بەساڵاچوو بوو، تۆش گەنج بوویت، گەر لەگەڵ ئەودا ژیابایت وەرس دەبوویت.»

ئەوە دۆغرییەکەی بوو، کە دایکم لەگەڵمدا دەژیا، نیگاکانی هەمیشە کاریان تێ دەکردم، کە یەکەم جار لە داڵدە گیرسایەوە بەزۆری دەگریا، بەڵام ئەوە خووبوو و بەس. تا وای لێ هات ئەگەر لە داڵدەکە دەریانکردبا دەگریا. ئەم خووەی لەگەڵدا بوو، هەموو کار و کردەوەیەکی هەر خوو، خوو پێوەگرتن بوو، بۆیە لەم دواییەدا کەمتر دەچوومە دیدەنی، بەتایبەتی چونکە ئەو دیدەنییە پشووی یەک شەممۆانی لێ دەکوشتم، ئەمە جگە لە ئەرک و ناڕەحەتی نێو ترۆمبێل و هاتوچۆی ڕێگاوبان.

دیسانەوە سەرۆک داڵدە کەوتەوە قسان لە گەڵمدا، بەڵام من گوێم لێ نەدەگرت، ئیدی پێی گوتم، «وا دێ بەخەیاڵمدا کە دەتەوێ دایکت بدینی».

بێ ئەوەی چ قسەیەک بکەم هەستام، ئەو لە پێش منەوە بەرەو دەرگا چوو، لە ڕاڕەوەکەدا پێی گوتم: «بردوومانەتە مەیتخانەکەی خۆمان چونکە دەترساین خەڵکی بەدیتنی ناڕەحەت بن، هەر کاتێ یەکێک لە دانیشتوانی ئێرە بمرێت، خەڵکی تا دوو سێ ڕۆژ نیگەران دەبن و کارکردن کەمێ زەحمەت دەبێ، «گۆڕەپانێکی بچووکمان بڕی، چەند پیرەمێردێک لە دەوری یەکدی دانیشتبوون قسانیان دەکرد، کە ئێمەیان بینی بێدەنگ بوون، کە لێیان ڕەت بووین دەستیان بەقسان کردەوە.

لە بەردەرگای تەلارێکی بچکۆلەدا، سەرۆک داڵدە جێی هێشتم و گوتی: «کاک مەرسۆ من جێت دەهێڵم و لە نووسینگەکەما و هەر دەم لە خزمەتت دام، مەسەلەی ناشتنەکەی خراوەتە سبەی بەیانی، سەعات دە، گوتمان لەم ماوەیەدا فریا دەکەوی بەدیارییەوە بمێنی و نزای بۆ بکەیت، شتێکی تریش هەیە حەز دەکەم بیزانیت، دایکی ڕەحمەتیت چەند جار بەگوێی دۆستەکانیا دابوو کە حەز دەکات بەگوێرەی دابونەریتی ئایینی بنێژرێ و بەخاک بسپێردرێ. من بەش بەحاڵی خۆم ئەوەی پێویست بوو لەبارەیەوە بکرێ بۆم ئەنجام دا، بەڵام ویستم تۆش ئەمە بزانیت.»

سوپاسم کرد. دایکم ئافرەتێکی خوانەناس بوو، هەرگیز بیرم نایەت کە پابەند و دڵبەندی ئایین بووبێت، چوومە ژوورەوە، هۆدەیەکی ڕووناک بوو، دیوارەکانی گەچکاری کرابوون، بنمیچەکەی شووشەبەند بوو، چەند کورسی و موبیلە و کەرەوێتەیەک لە ژوورەوە ڕیزکرابوون، دوو کورسیان بەرانبەر یەک دانابوو، تابووتێکیان لە سەر دانابوون، دیار بوو کە تابووتەکە تازە بوو، بزمارەکانی بەتەواوی



دانەکوترابوون. پەرستارێکی عەرەب کە کراسێکی سپی و لەچکێکی تێر ڕەنگی پۆشیبوو، لە نزیک تابووتەکەوە وێستا بوو.

لەم کاتەدا دەرگاوانەکە بەدووی مندا هاتە ژوورەوە. دیار بوو کە بەڕاکردن دوام کەوتبوو، بەهەناسەبڕکێ و بەدەمەلاڵکێ ئەم چەند گوتەیەی گوت: سەری تابووتەکەیان داخستووە، لێ دەبێ بۆتی بکەمەوە تاکو بتوانی بیبینی.

گوتم: «نەخێر پێویست ناکات» بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە، بەڕادەیەک ئیدی نەمتوانی ڕێگای لێ بگرم، جارێکی دی گوتم: « خۆت دەزانی من شارەزای داب و دەستووری ئەم شوێنە نیم» ئەویش بەدەم جوینی سمێڵە سپییەکەیەوە دەیگوت: «بەڵێ من دەزانم کە حەز دەکەیت دایکت ببینی.»

ئەم پیاوە چاو درشتە دەموچاو سوورە کورسییەکی بۆ من هێنا و خۆشی لەسەر یەکێکی دی دانیشت، کە پاسەوانەکە ئەوی بینی، لە جێی خۆی هەستا و بەرەو دەرگاکە ڕۆیی. لەم کاتەدا دەرگاوانەکە دەیگوت: «بەڕاستی دایکت شانسێکی چاکی هەبوو.»

نەمزانی مەبەستی چییە، لە ژێرەوە تەماشای پەرستارەکەم دەکرد، بەرانبەر تابووتەکە وێستا بوو، دەمامکێکی لەسەر کردبوو، لە تەوێڵی بەرەو خوارتر نەدەبینرا، ئەویش کە خۆی لە نێو ئێمەدا غەریب بینی هەستا و وەکو پاسەوانەکە چووە دەرێ، دوای ڕۆیشتنی ئەو دەرگاوانەکە پێی گوتم: «منیش دەڕۆم و بەتەنیا جێت دەهێڵم.»

من بەشێوەیەک وێستا بووم کە ئەو کەوتبووە پشتمەوە، گوێم لە قسەکانی دەبوو بەڵام لێی حاڵی نەدەبووم، خوا خوام بوو، تا زووترە ئەویش بچێتە دەرێ، ژوورەکە تەواو ڕۆشن بوو، دوو گلۆپ لە دوو لای ژوورەکەدا دەسووتان، منیش هێندە بەپێوە وەستا بووم شەکەت بوو بووم و حەزم بەئیسراحەت دەکرد، بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە بەدەرگاوانەکەم گوت: دەمێکە لێرە کار دەکەیت.

وەک ئەوەی دەمێ بێ چاوەڕێی ئەم پرسیارەی من بێ، گورج وەڵامی دایەوە و گوتی: «پێنج ساڵە» ئیدی دەستی بەقسان کرد و چەنەبازییەکی زۆری کرد. قسەکانی لەو بابەتانە بوون کە کەڵکی منیان نەدەدا و هیچیان نەدەبەخشی، تەنیا ئەوەم لە قسەکانی هەڵکڕاند کە دەمێکە دەرگاوانە و خەڵکی پاریسە. چونکە باسی پاریس هاتە پێشەوە ناچار بووم لە وەڵامی ئەودا بڵێم کەواتە تۆ خەڵکی پاریسیت، وام دەزانی خەڵکی ئەم ناوەیت، دوایی بیرم کەوتەوە کە بەر لەوەی بمباتە لای سەرۆک داڵدە، ئەم پیاوە هەندێ شتی دەربارەی دایکم گوتبوو، پێی گوتم: «پێویستە تا زووترە بنێژرێ، چونکە ئەم بیابانە زۆر گەرمە، بەتایبەتی ئەم شارە»، دوای ئەم قسانەبوو زانیم خەڵکی پاریسە و دەیگوت لە پاریسا عادەت وایە خەڵکی دوو- سێ ڕۆژ بەدیار مردووی خۆیانەوە دادەنیشن، بەڵام لێرەدا دەرفەتی ئەم کارە نییە و ناچارن سەبارەت بەگەرمی هەوا زۆرتر کارەکان ئەنجام بدەن. لێرەدا ژنەکەی لێی هاتە قسان: «ووس بە، ئەمانە شتێک نین. شایانی ئەوە بن کە بۆ کاک... بگێڕدرێنەوە» هەڵم دایێ و گوتم: «بەڵام نا بەڵام نا.» قسەکانیم بەلاوە دروست و بەکەڵک بوون. لە مەیتخانەکەدا پێی ڕاگەیاندم کە وەکو

سوالکەرێک هاتۆتە ئەم دالدەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەپێچەوانەی ئەو خەڵکانەوە کە لێرەدا دەژیان و هەموویان سەقەت و نەخۆش و گۆج بوون. من ساغ و سەلامەت بووم، کاری دەرگاوانیم لە ئەستۆ گرت. پێم گوت: ڕاستە و دەست و پێت ساغە، بەڵام چونکە ئێرە مەڵبەندی گۆج و کەنەفتەکانە، تۆش لە خانەی ئەواندایت، کەچی نەی دەویست ملکەچی ئەم قسەیە بێ و دەیگوت من کاری دەرگاوانیم لە ئەستۆدایە و چونکە دەست و پێم ساغە، لە هەموو خەڵکە نەخۆش و پەککەوتەکانی دی حالم چاکترە.

لەم کاتەدا پاسەوانەکە هاتە ژوورەوە. کتوپڕ و بەخێرایی شەو خێوەتی ڕەشی خۆی هەڵدا. تاریکی شەو لە پشت شووشەی پەنجەرەکانەوە هێندەی دی چڕ خۆی دەنواند. دەرگاوانەکە سویچی کارەباکەی کردەوە، ڕۆشناییەکی بەهێز و کتوپڕ گشت سووچێکی ژوورەکەی داگیر کرد، بردمییە ژووری نانخواردن. لێ برسیم نەبوو، خولکی کردم کە با فینجانێ قاوە و شیرم بۆ بێنێ. چونکە حەز لە قاوە و شیر دەکەم پێشنیازەکەیم ڕەفز نەکرد. فرێ، دوانم خواردەوە دڵم چووە سەر جگەرەیەک، بەڵام سڵم کردەوە، چونکە نەمدەزانی ئاخۆ ئەم کردەوەیە بەرانبەر بەتابووتەکەی دایکم دروستە! تۆزێ بیرم کردەوە، لە ڕواڵەتدا ئەمە کارێکی گرنگ نەبوو، جگەرەیەکم دایە دەرگاوانەکە و بەدووقۆڵی کەوتینە جگەرەکێشان، لەم کاتەدا گوتی: دەزانیت بڕیارە دۆستەکانی دایکیشت ئەوشۆ بێن، ئەمە عادەتی ئێرەیە، دەبێ بچم چەند کورسییەک و هەندێ قاوە بێنم.

لێم پرسی کە ئاخۆ ناکرێ یەکێک لە گلۆپەکان خامۆش بکات، چونکە شەوقی گلۆپەکە بەسەر دیوارە سپییەکەوە چاوی مرۆڤی ماندوو دەکرد.

لە وەڵاما گوتی: نەخێر، جۆری دامەزراندنی کارەباکە وایە یان دەبێ هەموو بکوژێتەوە یان دەبێ هەمووی هەڵبێ، گوێم نەدایێ. چووە دەرێ، دوای ماوەیەک بەچەند کورسییەکەوە هاتەوە، کۆمەڵێ فینجان و جەزوەیەکی لەسەر مێزێک ڕیز کرد. دیسان بەرانبەرم دانیشتەوە.

پاسەوانەکەش لە ژوورەوە بوو، پشتی لە ئێمە و بەپێوە وێستا بوو. چاوم لێ نەبوو کە سەرقاڵی چ کارێکە، بەڵام بزووتنی دەستەکانی ئەوەیان دەنواند کە خەریکی چنینی شتێکە.

هەوا خۆش بوو، نۆشینی فینجانە قاوەکە کەمێ ئاسوودەی کردمەوە و هێنامییەوە سەر دەماخ. بۆنی شەو و گوڵەکان لە دەرگا وازەکەوە دەهاتە ژوورەوە. پێم وایە چاوم چووبووە خەو. لەپڕ خشپەیەک بێداری کردمەوە. کە چاوم هەڵێنا ڕۆشناییەکی سپی و تیژباڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو، کەسم لە بەرانبەر نەبوو، سێبەری شتومەکی نێو هۆدەکە ئاوێتەی ڕووناکی گلۆپەکە بوو بوو و تاپۆی سەیریان دەنواند. لەم کاتەدا دۆستەکانی دایکم گەیشتنە جێ، دوانزە کەس بوون، بەئەسپایی و بەبێدەنگی هاتنە ژوورەوە، بەبێ بچووکترین سرتە لەسەر کورسیەکان دانیشتن، کەسیانم نەناسی بەڵام بەوردی لێیان ڕامابووم. هێندە بێدەنگ و کڕ بوون بەزەحمەت، باوەڕم بەئامادەبوونیان کرد، هەموو ژنەکان بەرهەڵبێنەیان بەستبوو پشتێنەکانیان هێندەی دی ورگی پەڕاندبوون. پیاوەکان، بەگشتی لاواز و گۆپاڵ بەدەست بوون. ئەوەی سەرنجڕاکێش بوو. چاویان دیار نەبوو، لەبری جووتێ چاو دوو کونی ڕووناک لە سەرووی کەپۆیانەوە دەبریسکایەوە. کە دانیشتن زۆربەیان سەیریان کردم و سەری خەمبارییان لەقاند. لێویان چوو بوو بەناو



دەمی بێ ددانیانەوە. ڕەفتاریان هێندە سەیر بوو نەمدەزانی سڵاوم لێ دەکەن یان هەر عادەتیان وایە. ڕەفتاریان هێندە سەیر و نیگەرانی بەخش بوو، دەتگوت بۆ موحاکەمەکردنی من هاتوون.

دوای تۆزێ یەکێک لە ژنەکان دەستی بەگریان کرد. ئەم ژنە لە ڕیزی دووەما لە نێو ژنەکانی دیدا ون بوو، بەدروستی نەمدەبینی لەسەرخۆ و بەکوڵ دەگریا، وام دەهاتە بەرچاو کە ئیدی وەستانەوەی بۆ نییە، کەچی ئەوانی دی گوێیان پێ نەدەدا. هەموو چووبوونە جیهانی بێدەنگییەکی خەم ئامێزەوە. هەندێ جار تەماشای تابووتەکەیان دەکرد و هەندێ جار دەیان ڕوانییە گۆپاڵەکانیان و شتی دی. ئەو ژنەش بێ وچان دەگریا. سەرم لەمە سوڕما بوو، چونکە نەدەمناسی و نە حەزیشم دەکرد دەنگی بژنەوم. لە گەڵ ئەوەشدا زاتم نەبوو ئەمەی پێ بێژم.

دەرگاوانەکە لێی نزیک بووەوە. سەری خستە بناگوێی و هەندێ ورتە ورتیان کرد. دووبارە درێژەی بەگریانەکەی دا. ئەوجا دەرگاوانەکە گێڕایەوە بۆ لای من و لە نزیکمەوە دانیشت. دوای ماوەیەک بێ ئەوەی تەماشام بکات پێی ڕاگەیاندم: زۆر پابەندی دایکت بوو، تاقە دۆستی بوو، دوای مەرگی ئەو کەس شک نابات.

ماوەی چەند سەعاتێ بەم جۆرە تێپەڕی. ناڵە و گریانی ئەو ژنە وردە وردە کەم بووەوە خەوی لێ کەوت. خەوم نەدەهات. لێ گەلێک شەکەت بووم. گورچیلەکانم دەیەشان. لەو کاتەدا بێدەنگی ئەو خەڵکەش ئازاری دەدام. ناو بەناو دەنگێکی سەیر و نیگەرانبەخش دەهاتە گوێم. هەرچەند ورد دەبوومەوە هۆی ئەمەم بۆ هەڵنەدەهات، دوای ماوەیەک زانیم کە پیرەمێردەکان بەبێدەنگی دەگرین و چاویان هەڵدەگلۆفن. ئەمە تاقە دەنگێک بوو کە دەهاتە گوێ، هێندە چووبوونە دنیای خەم و پەژارەی خۆیانەوە کە ئاگایان لە هیچ نەمابوو. وام هەست دەکرد ئەو مردووەی کە لە ناوەندیاندا ڕاکشابوو لە دیدی ئەواندا هیچی نە دەگەیاند و تەنیا خەمێکی نادیاری لە مێشکیاندا جێ هێشتبوو.

تەواوی ئامادەبووان کەوتنە قاوە خواردنەوە، نەمزانی ئەو شەوەمان چۆن بەسەر برد. کە چاوم کردەوە سەیرم کرد پیرەکان هەموو لاڵ و پاڵ لێی کەوتوون و خەوتوون. تەنیا یەکێکیان نەبێ کە خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا و چەناگەی خستبووە سەر هەردوو دەستی و ئەبڵەقانە دەیڕوانییە من، وەک ئەوەی چاوەڕوانی هیچ نەبێ تەنیا بێداربوونەوەی من نەبێ، بەڵام هێندە شەکەت بووم خەوم لێ کەوتەوە، بەئازاری گورچیلەوە بێدار بوومەوە.

ڕووناکی بەیان لە پەنجەرەکانەوە خۆی دەنواند، دوای تۆزێ یەکێک لە پیرەمێردەکان هەستا، بەکۆکەکۆک ئەوانی تریشی خەبەر کردەوە. دەرگاوانەکەش هەستا، گوتی دەبێ بڕۆن، وەختێ کە دەرچوون یەک یەک دەستیان گوشیم، سەرم لەوە سوڕما وەک بڵێی ئەم شەوە درێژەی کە تاقە قسەیەکمان تێیدا لەگەڵ یەکدا نەکرد و کردبینی بەدۆستی گیانی بەگیانی.

زۆر ماندوو بووبووم، دەرگاوانەکە بردمییەماڵی خۆیان. توانیم لەوێ دەست و دەموچاوم بشۆم و تۆزێ خۆم ڕێک بخەم. قاوە و شیرێکی دیم خواردەوە، زۆر بەلەزەت بوو. لەسەر ئەو گردۆڵکانەوە کە مارانگوی لە دەریا جیا دەکردەوە، ئاسمان، ئاسمانی وەنەوشەیی نازی بەسەر زەویدا دەکرد و بایەکی فێنکی دەهات

و بۆن و بەرامەیەکی خۆشی پەخش دەکردەوە، ڕۆژێکی خۆش و ناسک بوو، دەمێ بوو گوێ چەمەکانم نەدیبوو، ئەم دیمەنە خۆشەویستییەکی تایبەتی لەلام هەبوو، دەمویست گەشتێک بەم هەوا ئازادەدا بکەم بەڵام ئەفسووس لەو ڕۆژەدا دایکم لەگەڵدا نەبوو.

بەم حاڵەوە چەند ماوەیەک لە کەنار چەمەنەکەدا وێستام و لەزەتم لە بۆن و بەرامەی گوڵان وەردەگرت، ئیدی خەوم ڕەوییەوە... بیرم لە برادەر و هاوکارەکانی خۆم کردەوە، لەم ساتەدا بوو کە کرێکاران لە خەو ڕادەبوون و هەر کەسە و دەچووە سەر کاری خۆی، ئەم ساتانە بۆ من ناڕەحەتترین کات بوون، کەمێکی دی بیرم کردەوە، لێ زەنگی کلیساکە لە نزیکەوە دەهاتە گوێ، گێژی کردبووم... خەڵکی لە پشت پەنجەرەکانەوە کەوتنە جموجۆڵ، دوای ماوەیەک خامۆشی باڵی بەسەر قەرەباڵغییەکەدا کێشا، هەتاو بەرزتر بووەوە. وردە وردە قاچم گەرمتر بووەوە، دەرگاوانەکە بەحەوشەدا تێپەڕی و پێی گوتم کە سەرۆک داڵدە کاری پێمە. بەپەلە خۆم گەیاندە نووسینگەکەی، بەئیشارەی دەست چەند دەستە جلێکی ڕەشی نیشان دام، خۆشی جلێکی ڕەش و پانتۆڵێکی میلداری لە بەرکردبوو.

تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، بەدەم تەلەفۆن کردنەوە پێی گوتم کرێکارانی مەیتخانەکە ئامادە بوون و پێویستە دەستووریان بدەمێ کە سەری تابووتەکە دابخەن و دایبکوتنەوە، ویستم پێت ڕابگەیەنم کە ئاخۆ حەز ناکەیت جارێکی دی دایکت ببینی؟ گوتم: نەخێر. لە تەلەفۆنەکەدا و بەدەنگی نزم دەستووری دانێ: کە دەتوانن بڕۆن.

ئەوجا پێی گوتم کە ئامادەی ناشتنەکەی دەبێت. سوپاسیم کرد. لەپشت مێزەکەوە دانیشت و لاقی خستە سەر لاق، لە قسەکانیا ئەوەی دەرخست کە ئەو و پەرستارە ژنەکە لێرەدا بەتەنیان و دەستووراتی ئێرە، ڕێ نادات کە کاربەدەستانی کارگێڕ بەشداری ناشتنی مردوو بکەن. یا دەبێ تەنیا چاودێر بن یا شەوانە بەدیارییەوە بن. لەسەری ڕۆیی کە ئەمە ئەرکێکی مرۆڤایەتییە و لەگەڵ ئەم حاڵەشدا ڕازی بووە کە لە نێوان دۆستەکانی دایکمدا ڕێی داوە کابرایەک کە نێوی «تۆماس پیرز»ە لە ناشتنی تەرمەکەدا بەشداری بکات. سەرۆکی داڵدە لێرەدا خەندەیەکی کرد و پێی گوتم: خۆت دەزانیت ئەمە هەستێکی منداڵانەیە، بەڵام ئەو و دایکت بەبست لە یەکدی جودا نابوونەوە، لە داڵدەکەدا خەڵکی بەشۆخییەوە دەیانگوت: تۆماس... ئەو دەنکتە، بەبیستنی ئەم شۆخییە گەشکەی دەکرد و خۆشحاڵ دەبوو، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە کە مەرگی خات مەرسۆلت تەواو نیگەرانی کردبوو، بۆیە نەمتوانی ڕێگای لێ بگرم، بەڵام بەگوێرەی ئامۆژگاری پزیشک ماوەم نەدا شەوێ بەدیارییەوە بمێنێ.

ماوەیەک بەخامۆشی و بێدەنگیماینەوە، سەرۆک هەستا و لە پەنجەرەکەوە ڕوانییە دەرێ، دوای تۆزێ گوتی تەماشاکە ئەوە قەشە مارنکۆیە، ئەوەتا لە پێش هەموویانەوە دەڕوات، ئەوجا پێی ڕاگەیاندم کە تا دەگەینە کلیسای گوند بەلای کەمەوە دەبێ چارەکە سەعاتێ بەپێیان بڕۆین، پێکەوە دابەزین. لە بەرانبەر تەلارەکەدا قەشەکە لەگەڵ دوو منداڵدا کە مارشی پرسەیان لێ دەدا وێستابوو. یەکێک لە منداڵەکان ئامێرێکی مۆسیقی بەدەستەوە بوو. قەشەکە بەدیارییەوە دانەوی بووەوە و شتە پێویستەکانی فێر دەکرد. وەختێ ئێمە گەیشتین قەشەکە سەری هەڵبڕی و گازی کردم «کوڕم» چەند وشەیەکی پێ گوتم و کەوتمە



شوێنی، لە ژوورەوە چوار زەلامی ڕەشپۆشم بینی لە کەنار تابووتەکەدا وەستابوون، بەسەرنجێکی خێرا بۆم سەرکەوت کە سەری تابووتەکەیان داکوتاوەتەوە. لەو دەمەدا گوێم بەدەنگی سەرۆک داڵدەکە زرینگایەوە کە دەیگوت، گالیسکەکە چاوەڕێمان دەکات و دەبێ قەشەکە دەستووری نزاکردن ئەنجام بدات، لەو ساتەوە هەموو شتێک بەپەلە ئەنجام درا، زەلامەکان لە تابووتەکە چوونە پێشەوە، قەشەکە و هاوڕێکانی و من و سەرۆک داڵدە کەوتینە شوێن ئەوان و یەک یەک چووینە دەرێ. ژنێک لەبەر دەرگاکە وێستابوو، نەمناسی، سەرۆک داڵدە پێی گوتم کاک مەرسۆ منیش ئەم خانمم نەدیوە، بەڵام وەک دەڵێن پەرستاری تایبەتی مردووانە، ژنەکە کە گوێی لەمە بوو بێ ئەوەی پێ بکەنێ سەری ڕێزی دانەواند. ئیدی هەموو لاکەوتین تا ڕێگا بۆ هەڵگرانی تابووتەکە بکەینەوە. دوایان کەوتین و داڵدەمان بەجێ هێشت لەبەر دەرگادا گالیسکەیەکی ڕەش باوی چەورکراوی درێژکۆڵە وەستابوو. پیاوێکی کورتە باڵا لە تەکیا وێستا بوو ڕێگای بەخەڵکەکە نیشان دەدا، لە تەک ئەوەوە پیرەمێردێکی لاوازی پێکەنین هێنەر وێستابوو، چاکەتێکی کورتی قۆڵ درێژی لەبەردابوو، ڕەفتارەکانی سەیر دەهاتە بەرچاو بەڕواڵەتیدا زانیم کە هەمان تۆماسە، کە بۆیان باس کردبووم. سەرکلاوێکی لبادی تووکنی بەسەرەوە بوو، پانتۆڵێکی دەلبی لە بەردا بوو. دەلنگەکەی پێڵاوەکانی داپۆشیبوو، پارچە پەڕۆیەکی ڕەشی لەسەر ملیوانی کراسە سپییەکەیەوە، لە ملیدا گرێ دابوو، لێوە ئەستوورەکانی لەژێر لووتە درێژەکەیەوە تەتەڵەیان دەکرد. قژی سپی و بەجۆرێ شانە کرابوو کە گوێچکە سوورەکانی دەرکەوتبوون، ئەم سوورییە هێندە زیاد بوو کە لەگەڵ سپێتی و پەڕیوی ڕەنگیا بەراوردم دەکرد دەیهەژاندم. ڕێنماکە جێی هەر کەسەی دیاری کرد، قەشەکە لە پێشەوە دەڕۆیی و گالیسکەکە لە دوایەوە بوو، چوار شاگرد لە دەوری قەشەکە بوون و بەئەسپایی دەهاتنە پێشێ و من لە دوای سەرۆک داڵدەکەوە و کاک تۆماس و پەرستارەکە لە دوای ئێمەوە دەهاتن.

ئاسمان ساف و بێگەرد، هەتاو گەرم و بەتین بوو، هەوا وردە وردە گەرمتر دەبوو، گەرما ناڕەحەتی کردبووم، نەمدەزانی بۆ تا ئەم درەنگانە کاروانەکەیان دواخستبوو، هەرچەند جلکەکانم هاوینە بوو، بەڵام گەرما تەنگەتاوی کردبووم، ئەو پیرەمێردەی کە لە تەنیشت ئێمەوە دەڕۆیی ناچار بوو شەپقەکەی داکەنێ، ئاوڕم دایەوە و تەماشام کرد لەم کاتەدا سەرۆک داڵدەکە سەری خستە بنا گوێم و گوتی: دایکم زۆر جار لەگەڵ تۆماسدا و لەگەڵ پەرستارەکەدا بەپیاسە دەهاتن بۆ نزیکی ئەم گوندە، لەو دەمەدا کە گوێم بۆ قسەکانی سەرۆک ڕادەدێرا، چاوم لە دار سەرووەکانی کەنار جادەکە بوو، زەوی سەوز و ڕازاوە دڵداری لەگەڵ ئاسمانی شیندا دەکرد. بەچاوی خەیاڵ دایکم دەبینی شاد و خۆشحاڵە لە تەک ئەم درەختانەدا، هەڵبەتە ئێوارانی ئەم شارۆچکەیە لە هودنەیەکی خەمبار دەچوو، ئەوەتا، هەتاوی بەدەسەڵات دیمەنەکەی بەرەو دیمەنێکی نامرۆڤانەی نزم هەڵگێڕاوەتەوە، کاروان درێژەی بەڕۆیشتن دا، تەنیا لەم کاتەدا هەستم کرد مستەر تۆماس کەمێ دەلەنگێ... کاروان دەڕوات و ئەویش ناچار بوو دوامان بکەوێت، گالیسکەکە جار لە جار خێراتر دەبوو، ئەویش بەزەحمەت پێمان دەگەیشتەوە، یەکێک لە ڕێبوارەکان ڕێگای بۆ چۆل کرد، ئەوەتا لە دوای ئێمەوە دەڕوات.

هەتاو بەخێرایی بەرەو ناوەندی ئاسمان هەڵدەکشا و تینی گەرما بێزارکەر بوو، لەو ماوە درێژەدا کە

ڕێگامان دەپێچایەوە گیزەگیزی مێروو هاژەی گەڵای گیا و پەلکی درەختان لای لایەیان بۆ ڕێبواری ماندوو دەکرد. ئارەقە لە نێو چەوانمانەوە دەچۆڕا، چونکە شەپقەکەم پێ نەبوو، دەستەسڕەکەم بەسەرما دا و کردم بەسێبەر، لەم کاتەدا کارمەندی ناشتنی تەرمەکە شتێکی بەگوێمدا چرپاند، بەڵام حاڵی نەبووم، بەو خەیاڵەوە کە من لێی حاڵی بوو بووم، سەری لەقاند و بەدەستەسڕەکەی ئارەقەی دەموچاوی سڕی و شەپقەکەی کرد بەسێبەر بۆ چاوی تا لە تینی هەتاوەکە بیپارێزێ و گوتی: چ هەوایەکی گەرم و ناخۆشە... گوتم چۆن؟ ئاسمانی نیشان دام و گوتی خەریکە بمرم. لە وەڵامدا گوتم: بەڵێ هەواکەی زۆر گەرمە، دوای تۆزێ پرسی: ئەمە دایکی تۆیە لەو تابووتەدا، گوتم، بەڵێ، پرسی: پیر بوو؟ گوتم بەڵێ پیر بوو، چونکە من تەمەنی ڕاستی دایکم نەدەزانی، ئەویش ڕووی خۆی وەرگێڕا و بێدەنگ بوو، لەو لاوە مستەر تۆماسم بینی کە پەنجا شەقاوێ کەتبووە دوامانەوە، شەپقەکەی خستبووە ژێر باڵی و بەهەناسەبڕکێ بەرەو پێش دەهات، تەماشایەکی سەرۆک داڵدەم کرد، بەجۆرە ویقارێکی تایبەتییەوە دەڕۆیی و دڵۆپە ئارەقە بەسەر تەختی تەوێڵییەوە دەبریسکایەوە بێ ئەوەی بیسڕێت، وام دەهاتە بەرچاو کە کاروانەکە خێراتر دەڕوا. لەم کاتەدا گەیشتینە پارچە زەوییەک کە دیار بوو تازە پڕ کرابووەوە، تینی هەتاو و بۆنی قیرڕ بەکەپوا دەدا، شوێن پێڵاوەکان لەسەر زەوییە تەڕەکەدا دەچەسپی، کڵاوی ڕانندەی گالیسکەکە وەک هەویری ترشاوی لێ هاتبوو، من لە نێو ئەم بەزم و ڕەزم و لەژێر ئاسمانی شین و لە نێو قەرەباڵغی خەڵکەکەدا ون بوو بووم، بۆنی قیری ڕەش و جلوبەرگی ڕەش... ماندوێتی شەوێ چاویان لێڵ و بیریان پەشێو کردبووم، جارێکی دیش ئاوڕم دایەوە: مستەر تۆماس زۆر دواکەوتبوو، لە نێو هەوا گەرم و غومار ئامێزەکەوە وەکو تاپۆیەک دەینواند. چەند هەنگاوێکی دی چوومەوە پێشێ و ئەوم لە چاو ون بوو. چاوم بۆ گێڕا، سەیرم کرد پیری بێچارە لە ڕیزەکە دەرچووە و پەنای بردۆتە بەر هەوای ئازاد و کێڵگەکان، لە هەمان کاتدا هەستم کرد کە جادەکەی بەلای ڕاستدا پێچی کردۆتەوە، زانیم کە مستەر تۆماس بەڵەدە و کورتترین ڕێگا دەگرێتە بەر، تا پێمان بگاتەوە، لە پێچەکەدا گرتینیەوە، جارێکی دی لە چاو ون بوو، ڕێیەکی دی گرتەبەر، بەڵام من لەم کاتەدا بەجۆرێ داغ بووبووم، خەریک بوو مێشکم بتەقێت. ئیدی هەموو شتەکان بەکارامەیی و خێرایی ئەنجام درا، بەڕادەیەک وردەکارییەکانم بیر نەماوە. تەنیا یەک شت سەرنجی ڕاکێشام، کە چووینە گوندەکەوە پەرستارەکە لەگەڵمدا دەستی بەقسان کرد. دەنگێکی تایبەتی هەبوو، دەنگێ کە بەهیچ کلۆجێ لە گەڵ ڕوخسار و قەڵافەتیدا نەدەگونجا، دەنگی لەرزان و ئاواز بەخش بوو، گوتی: ئەگەر بەهێواشی بڕۆین هەموومان لە گەرما دەپروکێین، لێ ئەگەر تۆزێ پەلە بکەین زووتر دەگەینە کلیساکە و هەوای ئەوێ تۆزێ چاکترە.

ڕاستی دەکرد، هەموو خەڵکەکە لە گەرمانا کلافە بووبوون، هەندێ بیرەوەری ئەو ڕۆژەم لە بیر ماوە، بیرم دێ بۆ دواجار مستەر تۆماس لە ئێمە نزیک بووەوە، ئەشکی خەم و شەکەتی ڕوومەتیان بەسەر دەکردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی چرچ و لۆچی زۆر لە دەموچاویا بوو، فرمێسکەکان تا خوارەوە ناهاتن و لەم لۆچانەدا دەگیرسانەوە و بەدەم تیشکی هەتاوە گەرمەکەوە دەبریسکانەوە، گەلێ شتی دی جگە لە قەڵافەتی خەڵکەکە سەرنجیان ڕادەکێشا، هاتوچۆی فەلاکان، توولە ڕێگاکان، گوڵی سوور و سپی سەر



گۆڕەکان، بەتایبەتی ناڵە و کەسەری مستەر تۆماس و جادەی پڕ لە گولیکە کێوی. ئەو خەڵکانەی لەبەر چاخانەکاندا چاوەڕوان بوون و گەلێ شتی تریش سەرنجیان ڕادەکێشا، ئەگەر بمەوێ لەسەر هەموو شتەکان بنووسم، ئەوا دەبێ چەند کتێبێک ڕەش بکەمەوە. لەگەڵ ئەم هەموو شتانەدا، کاتێ گەیشتینە گۆڕستانەکە و تابووتەکەیان خستە سەر زەوی، شادییەکی لەباس نەهاتوو باڵی بەسەرما کێشا، چونکە گەیشتن خۆی لە خۆیدا جاڕدانێ بوو بۆ کۆتایی هاتنی شەکەتی و ئەرکی سەرشانمان و پێویست بوو بەلای کەمەوە دوانزە سەعات پشوو بدەم.

## ٢

کاتێ کە بێدار بوومەوە زانیم کە مەسئولەکەم بۆ ناڕەحەت بوو، دوای دوو ڕۆژ مادونی، ئەوڕۆ شەممەیە، بیرم نەبوو چ ڕۆژێکە، بەڵام کاتێ لە خەو ڕابووم لەپڕ ئەوەم بەبیرا هات، مەسئولەکەم لە دڵی خۆیدا لێکی دابووەوە کە بەیەک شەممەوە مادونییەکەم دەبێ بەچوار ڕۆژ. ئەمە کەمێک ناڕەحەتی کردبوو. بەڵام ئەمە گوناحی من نەبوو، خۆ ئەگەر لەبری ئەمڕۆ، دوێنێ دایکمیان ناشتبا ئەوا بەلای کەمەوە پتر کەڵکم لە مادونییەکە و یەک شەممە وەردەگرت و یەک شەممەم بەفیڕۆ ناڕۆیی.

بەزەحمەت ڕابووم، چونکە هێشتا هیلاکی دوێنێ لە لەشم دەرنەچوو بوو، بەدەم ڕدێن تراشینەوە لە خۆم دەپرسی دەبێ چ بکەم، دوایی بڕیارم دا کە بچم مەلە بکەم، سواری ترام بووم بەو نیازەی بچم بۆ گەرماوەکانی کەنار. ویستم مەلە بکەم، گەلێ کیژی جوانی لێ بوون، لە نێو ئەوانەدا چاوم بەماری کارۆلین کەوت، ماری یەکێک بوو لە تایپستەکانی جارانی دایەرەی ئێمە، ماوەیەک بوو حەزم دەکرد ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا بکەم، وا بزانم ئەویش بێ مەیل نەبوو، لێ دوای ماوەیەکی کەم لە دایەرەی ئێمە نەما و ئیدی ڕێکەوتێکی وەها نەڕەخسا یەکدی ببینین.

پێکەوە سواری بەلەم بووین، لە کاتی سواربووندا بەئانقەست دەستم بەسەر مەمکی داهێنا، من هێشتا لە ئاوەکەدا بووم کە ئەو دوای کەمێ مەلەکردن، خۆی گەیاندبووە کەنارەکە و لە سەر لمەلانەکەدا ڕاکشابوو، ئاوڕی لێ دامەوە، قژە پەخشانەکەی بەرچاوی گرتبوو، بەشێوەیەکی تایبەتی پێم پێدەکەنی، خۆم گەیاندە تەکی و لە پاڵیا ڕاکشام، هێندە لەبار ڕاکشابوو کە بەهاسانی سەر بخەمە سەر سکی نەرم و گۆشتنی چ قسەیەکی نەکرد، منیش بەو حاڵەوە مام و دەمڕوانییە ئاسمانی زێوین، لەژێر سەرمەوە هەستم بەهەناسەدانی ماری دەکرد، ماوەیەک بەو دەقەوە ماینەوە، کە هەتاو گەرمتر بوو ئەو خۆی خستە ئاوەکەوە و منیش بەدوایا، خۆم پێی گەیاند، باسکم لە قەدی ئاڵاند و ماوەیەک پێکەوە مەلەمان کرد. بەردەوام پێدەکەنی، لە کەنارەکەدا و بەدەم خۆ وشککردنەوەوە پێی گوتم: من لە تۆ ئەسمەرترم، لێم پرسی: ئایا مەیلی لێیە پێکەوە بۆ سینەما بچین، دیسان بەپێکەنینەوە گوتی: حەزم لە فیلمی «فرناندیل»ە کە خۆم لەبەر کرد و بینی بۆینباخی ڕەش دەبەستم، بەسەرسوڕمانەوە پرسی کە ئایا تازێبارم. وەڵامم دایەوە کە دایکم مردووە. پرسی: کەی... گوتم دوێنێ مرد. کەمێ دوودڵ بوو، ئیدی هیچی نەگوت، حەزم دەکرد پێی بڵێم کە ئەمە گوناحی من نییە... بەڵام خۆم گرت، چونکە بیرم کەوتەوە کە هەمان قسەم بەمەسئولەکەم

گوتبوو کەچی ئامادە نەبوو مادونی(اجازە)م بداتێ، ئەم وەڵامە بۆ ئەو هیچ مانایەکی نەبوو بەهەر حاڵ مرۆڤ هەرچییەک بڵێ هەمیشە تا ڕادەیەک هەڵەیە و خەتاکار.

ئێوارێ ماری تەواوی ئەم مەسەلانەی فەرامۆش کردبوو، فیلمەکە یەکجار خۆش بوو، پێکەنین هێنەر بوو، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لاقی بەمنەوە چەسپاند بوو، منیش یاریم بەمەمکەکانی دەکرد و لە ئاخر و ئۆخری فیلمەکەدا دەمم دەنێو دەمی خست و لە ئامێزم گرت، بەڵام لە باوەش گرتنێکی بەدئەنجام. دوای سینەما لە گەڵمدا هاتەوە بۆ ماڵێ.

کە لە خەو ڕابووم ماری ڕۆیی بوو، بۆی ڕوون کردبوومەوە کە پێویست بووە بۆ ماڵی پووری بچێت، ئەو ڕۆژە یەک شەممە بوو، تەنیایی هێندەی دی بێزاری دەکردم، خۆم هەر بەسروشت حەز لە یەک شەمموان ناکەم، ناچار چوومەوە نێو جێگاکە، لە نێو جێگاکەدا بۆ بۆن و بەرامەی قژی ماری دەگەڕام. تا سەعات دە نووستم. بەم چەشنە جگەرە لە دوای جگەرەم کێشا و تا نیوەڕۆ لەنێو جێگادا مامەوە. حەزم نەدەکرد لەلای سیلست نیوەڕۆژە بکەم، چونکە دەمزانی هەندێ پرسیارم لێ دەکات و منیش تاقەتی ئەم شتانەم نییە. هێلکەیەکم کوڵاند و بەڕووتی خواردم، چونکە نانم نەبوو و حەزیشم نەدەکرد بۆ نان بچمە دەرێ.

دوای نیوەڕۆش هەستم بەبێ تاقەتی کرد. کەمێ لە ماڵەوە هاتوچۆم کرد، کە دایکم مابوو ڤیللاکە خۆش و دڵگیر بوو، بەڵام ئێستا لێم بووە بەقەفەزێکی گەورە ناچاربووم خوانەکە لە ژووری نانخواردنەوە بۆ ژوورەکەی خۆم بگوێزمەوە. ئەم تەلارە گەورەیە جگە لە چەند شڕە کورسییەک و بۆفییەک کە ئاوێنەکەی زەرد هەڵگەڕابوو و مێزێکی تەوالیت و کۆنە چەرپایەک چیدی تێدا نەبوو.

بۆ بێ تاقەتی پارچە ڕۆژنامەیەکم بەدەستەوە گرت و هەندێ وێنەم لێی دەرهێنا و خستمە دوو توێی دەفتەرێکەوە کە ئەو بابەتە شتانەی تێدا دەپارێزم. ئەوجا دەستم شت و بۆ ئەوەی خۆم بەشتێکەوە بخافڵێنم چوومە سەر بانێژەکە. پەنجەرەی ژوورەکەم دەیڕوانییە سەر جادەیەکی گەورە و قەرەباڵغ، دوانیوەڕۆیەکی خۆش بوو. جادەکان داغ بوو بوون، هاتوچۆی خەڵکی زۆر کەم بوو، هەندێ خێزان دەچوونە گەڕان و سەیران. دوو کوڕی چکۆڵە کە جلی مەلەوانیان پۆشیبوو، پانتۆڵەکانیان تا ڕادەیەک کۆن و کورت، پێڵاوەکانیان بۆیاخکراو و بریقەدار بوو لێرەوەوە تێدەپەڕین، دایکێکی قەڵەو، کراسێکی ئاوریشمی وەنەوشەیی لەبەر بوو، لەگەڵ مێردەکەیدا کە پیاوێکی کورتە باڵای لاواز بوو، بەدوایانەوە بوون... ئەم ژن و مێردەم لە دوورەوە تۆزێ دەناسین. کابرا جلی مەلەوانی پۆشیبوو، بۆینباخێکی گچکەی لە مل و گۆچانێکی بەدەستەوەبوو، کە بەم حاڵەوە لەگەڵ ژنەکەیدا دیتم، بیرم کەتەوە و زانیم بۆچی لەم گوندەدا هەمیشە باسی موعتەبەری ئەویان دەکرد، دوای کەمێک، لاوانی گوند بەقژی شانەکراو و بۆینباخێکی سوور و جلی بەدەن چەسپ و پێڵاوی بۆیاخکراو و بریقەدارەوە بەر پەنجەرەکەدا تێ پەڕین. بیرم کەوتەوە کە بەرەو سینەما دەچن، بۆیە بەپەلە و بەپێکەنینەوە بێ ئەوەی ئاوڕ لە کەس بدەنەوە بەرەو مەیدانە گەورەکە دەچوون.

دوای ڕۆشتنی ئەوان وردە وردە جادەکە چۆل بوو، چ شتێکی سەرنجڕاکێش بەدەرەوە نەبوو، جگە لە دوکاندارەکان و هەندێ پشیلە کە لێرەوە بۆ ئەوێ ڕایان دەکرد... ئاسمان شین و ساف بوو، لە شۆستەکەی



ئەو بەرەوە دوکاندارێک، دوکاندارێکی جگەرە فرۆش کورسییەکی هێنایە دەرەوە و لەسەری دانیشت و پشتی پێوە دا، گالیسکە پڕەکانی تۆزێ لەمەوبەر، ئێستا پاکیان خاڵی و چۆڵن، لە چاخانە بچکۆڵەکەی تەنیشت جگەرە فرۆشەکەوە، گارسۆنە لاوەکە خەریکی ماڵینی وردە دارەکان بوو، بەڕاستی یەک شەممەیەکی خۆش بوو، ڕووی کورسییەکەم کردە کابرای دوکاندار، وام پێ خۆشتر بوو، دوو جگەرەم داگیرساند، دووەمیان تاڵ بوو، چوومە ژوورەوە کە چکلێتێک بخەمە دەممەوە، لەبەر پەنجەرەکەدا خەریکی خواردنی بووم. پەڵە هەور بەری ئاسمانی گرت، پێم وابوو دووچاری گەردەلوولێکی هاوینە دەبین، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم هەورەکە ڕەوییەوە، هەورەکان سێبەریان بەسەر کوچە و بازاڕەکەدا پەخش کرد، دنیا کەمێک تاریک بوو، وێ دەچوو هەڕەشەی بارانی پێ بێ، ماوەیەک ڕوانیمە ئاسمان. لە سەعات پێنجدا ترامەکان گەڕانەوە، لاوان خۆیان پێوە هەڵواسیبوو، کاروانەکەی دوای ئەوان کۆمەڵە گەنجێکی وەرزشکاری لە یاریگاکەوە هێنابووەوە بەجانتاکانیاندا ناسیمنەوە. بەدەم گۆرانی و چەپڵە ڕێزانەوە هورایان دەکێشا کە تیپەکەیان نادۆڕێنێ. هەندێکیان ئیشارەتیان بۆ دەکردم، یەکێکیان پێی گوتم: بردمانەوە... ئیدی ترۆمبێل سەری کرایەوە و بازاڕ بەرەو گەرمبوون دەچوو.

ڕۆژ چووە پێشەوە، ئاسمان لە سەربانەکانەوە سووری دەنواند، جادەکان ئاوەدان بوونەوە. سەیرانکەران دەگەڕانەوە... زۆری نەبرد دەرگای سینەماکان ڤە بوو. ئەو خەڵکانەی چووبوونە سینەما، کەوتنە سەر جادەکان لە نێوان ئەوانەدا لاوانی چالاک و بەدەماخ خۆیان دەنواند، لە ڕەفتاریاندا دیار بوو کە فلیمی مغامەراتیان دیوە، ئەوانەی کە چووبوونە سینەمای ناو گوندەکە کەمێ دێرتر تێکەڵ بەقەرەباڵغییەکە بوون، بەڵام لەوان سەلاتر و قورستر دیار بوون... دەستەیەک لە کوچە و کۆڵانەکانەوە دەهاتن و دەچوون و خەریکی عەیش و نۆش بوون، کچۆڵانی گەڕەک دەستی یەکیان گرتبوو و بەپیری کوڕانەوە دەچوون، شانیان لە یەکدی دەدا و شۆخیان دەکرد و بەدەنگی بەرز پێدەکەنین. هەندێ لە کچۆڵەکان کە ئاشنایەتییەکی کەمیان لەگەڵ مندا هەبوو لە خوارەوە ئیشارەتیان بۆ دەکردم.

لەپڕ گلۆپی سەر جادەکە هەڵبوون، ئەستێرەکانی سەرەتای شەویان لە ورشە و جریوە خست. هەستم کرد کە چاوم لە ڕوانین ماندوو بوو. جادەکە لەبەر ڕۆشنایی گلۆپەکاندا دەبریقایەوە. تیشکی لە قژی خانمان دەدا و هێندەی دی ڕەونەقی دەدانێ. وردە وردە کاروانی ترامەکان کز بوو، شەوێکی تاری و ڕەش گشت شوێنەکانی گرتەوە... کۆڵانەکان بەرەو چۆل بوون دەچوون، لەم کاتەدا پشیلەکان دەیان توانی بەهاسانی هاتوچۆ بکەن... کەوتمە بیری شام کردنەوە، هێندە لەسەر کورسییەکە دانیشتبووم هەستم دەکرد ملم کەمێک ڕەق بووە، لە پلەکانەوە هاتمە خوارەوە تا نان بکڕم، چووم و نانێکی سەرپێیم ئامادە کرد و خواردم، ئەوجا دوو جگەرەم بەسەریەکدا کێشا و چوومە بەر پەنجەرەکە و چاوم بڕییە دەرەوە. هەستم کرد سەرمایە، پەنجەرەکانم داخست، لەبەر ئاوێنەکەدا هەندێ نانی وشک و قاپێکی خاڵی بەسەر مێزەکەوە بوون. بەخۆمم گوت، یەک شەممەیەک بوو و بڕایەوە، یەکەم یەک شەممەیە کە دایکم لە باوەشی خاکدایە، پێویستە بگەڕێمەوە سەر کارە ڕۆژانەکانی خۆم بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێ لە ژیانمدا ڕووی دابێ.

## ٣

ئەورۆ لە نووسینگەکەی خۆمدا کارێکی زۆرم کرد، سەرۆک دایەرەکەشم لەگەڵمدا میهرەبان و گەرم بوو، لێی پرسیم ئاخۆ زیاد لە پێویست ماندوو نیم، چەند جارێ پرسیاری تەمەنی دایکمی لێ کردم لە وەڵاما گوتم شەست ساڵ و شتێکە، وا دیار بوو بەوەڵامەکەم ڕازی بوو، وەک ئەوەی لەم تەمەنەدا ئیدی کاری مرۆڤ تەواو بێ.

گەلێک لە دۆستان لە دەورم خڕ بوونەوە و ناچار بووم چەند وەڵامێکی بێ سەروبەری هەموویان بدەمەوە، پێش ئەوەی لە دایەرە دەرچم، دەست و دەموچاوم شت. وەکو خوویەک نیوەڕوانم بەلاوە خۆشە... بەڵام ئێواران وا نیم. ڕۆژێک ئەوەم بەمەسئولەکەم گوت، وەڵامی دایەوە: بەباوەڕی من تێپەڕبوونی ڕۆژێک بۆ مرۆڤ مایەی داخە، بەڵام شتێکە و دەبێ ئەنجام بدرێ و لە ژیانی ئادەمیزادا هیچ بایەخێکی نییە... ئەو ڕۆژە کەمێ زووتر لەگەڵ ئەمانۆیل دا کە لە بەشێکی دیدا کاری دەکرد، لە دایەرە دەرچووین، دایەرەکەمان دەیڕوانییە سەر دەریا، ماوەیەکمان بەتەماشاکردنی بەلەم و پاپۆر و قەیاغەوە گوزەراند، لەم کاتەدا ترێلەیەکی گەورە بەهاڕەهاڕ لە پێشمانەوە وەستا، ئەمانۆیل لێی پرسیم، بڕۆین، بێ وەڵامدانەوە و بەغار شوێن ترێلەکە کەوتم، بەڵام ترێلەکە بەخێرایی دەرچوو و ئێمەش شوێنی کەوتین، تۆز و گەردێکی چڕ جادەکەی گرتبوو، بەڕادەیەک ئێمە هەردووکمان لە نێو گەرد و تۆزەکەدا ون بووین، هیچمان نابینی، هیچ دەنگێ جگە لە هاڕەهاڕی ترومبێل و ماشێن نەدەهاتە گوێ.

بەزەحمەت خۆم گەیاندە ترێلەکە و خۆم پێدا هەڵواسی و ئەوجا یارمەتی ئەمانۆیلیشم دا و سوار بوو لە تەک منەوە ئارامی گرت. هەناسە برکێمان پێ کەوتبوو، ترێلەکە باڵندە ئاسا بەسەر جادە تاریکەکەوە هەڵبەزو دابەزی دەکرد... ئەمانۆیل لە کانگای دڵەوە پێدەکەنی. بەپەلە خۆمان گەیاندە خوارنگاکەی سیلست، ئازای گیانمان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو، سیلست وەکو هەمیشە بەورگە زلەکەیەوە لەوێ وێستا بوو، لێی پرسیم: کارەکان باش دەڕۆن، گوتم بەڵێ، بەڵام زۆرم برسییە، بەپەلە بەنێورۆژەم کرد، قاوەیەکم بەسەریا کرد و ئەوجا بۆ ڤیللاکەم گەڕامەوە، کەمێک نووستم، چونکە زۆرم خواردبووەوە کە لە خەو ڕابووم زۆرم حەز لە جگەرە بوو. چونکە کات دێر بوو بەڕاکردن خۆم گەیاندە ترامەکە، ئەو دوا نیوەڕۆیەم بەکارکردن بەسەر برد. هەوای نووسینگەکەم زۆر گەرم بوو، دەمەو ئێوارێ کە دەرچووم هەوا تۆزێ فێنک بوو بوو، ماوەیەک لە کەنار دەریاکە و لە هەوای ئازادا پیاسەم کرد. کاژە هەورێکی تەنک بەری ئاسمانی گرتبوو، هەستم بەشادی کرد، بەڵام بەپەلە بۆ ماڵ گەڕامەوە، چونکە دەمویست پەتاتە بکوڵێنم، لەو دەمەدا کە بەپلە تاریکەکاندا سەردەکەوتم، تەقیم بەڕووی سالامانۆی دراوسێمدا... سالامانۆ بیست ساڵێک بوو لەگەڵ ئەو سەگەدا هاوڕێ و هاودەم بوو. سالامانۆ جۆرە نەخۆشییەکی پێستی هەبوو، پێستی بەدەنی سوور بوو، زۆربەی خەڵک پارێزیان لێ دەکرد، ئەو جووتە دەمێ بوو لە یەک ژووردا پێکەوە دەژیان. دەتوانرێ بگوترێ کە سالامانۆش شێوە سەگێکی دەنواند، ئەویش وەکو سەگەکەی پەڵەی سوور کەوتبووە سەر دەموچاوی. مووەکانی بەدەنی وەک کلکی گیانداران هەڵدەوەری، سەگەکەش هەندێ



خروی خاوەنەکەی وەرگرتبوو، وەک ئەو لە ڕۆیشتنا لاسایی ئەوی دەکردەوە، قەپۆزی دەبردە پێشەوە و ملی درێژ دەکرد، وا دەهاتنە بەرچاو کە هەردووکیان لە یەک نەژاد بن، سالامانۆ ڕۆژی دوو جاران لە سەعات دە و یانزدەدا لەگەڵ سەگەکەیدا دەچووە گەشت... ئەم عادەتە هەشت ساڵی ڕەبەق درێژەی کێشاو بەهیچ جۆرێ نەهاتە گۆڕان. هەشت دانە ساڵ هەمیشە لە جادەی لیوندا دەبینران. سەگەکە خاوەنەکەی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشا، سالامانۆ بەزەحمەت هەنگاوی دەنا، هەندێ جار تووڕە دەبوو و جنێوی بەسەگەکەی دەدا.

سەگی بەدبەخت لە ترساندا دەخیلی زەوی دەکەت و ناچار بوو دوای خاوەنەکەی دەکەوت، کاتێ ئەو گیاندارە ڕێگای لێ دەگۆڕا، خاوەنەکەی بەرەو خۆی ڕای دەکێشا، لەم کاتانەدا جنێوی پێ دەدا، هەردووکیان لە ڕێگا دەوێستان و ماوەیەک مۆڕەیان لێکدی دەکرد. نیگای سەگەکەش هی ترس بوو، هی خاوەنەکەی نیگای تووڕەیی و کینە بوو، هەموو ڕۆژێ ئەم بەرنامەیە دووبارە دەبووەوە، کاتێ سەگەی بەدبەخت بییویستایە میز بکات خاوەنەکەی بواری نەدەدا و بەدووی خۆیدا بکێشی دەکرد، خۆ ئەگەر بەرێکەوت لە ژوورێدا ئەم کارەی کردبا حەسیر مەیدانێکی چاک دەکرا... هەشت ساڵی تەواو ئەم بەرنامەیە بێ زیاد و کەم دووبارە دەبووەوە.

سیلست دەیگوت: ئەمەش بەدبەختییەکە، بەوەی باشە جگە لە خۆی هیچ کەسی دی ناتوانێت سەگەکە بەخێو بکات، ئەو شەوە کە لە سەرپلەکان دیتم، جنێوی بەسەگەکەی دەدا و دەیگوت، تۆ پیسیت، تۆ چەپەڵیت... لەو دەمەیدا کە سەگەکەی دەینالاند پێم گوت: شەو باش... بەڵام ئەو هەر سەرگەرمی جنێوی خۆی بوو، لێم پرسی: سەگەکەت چی کردووە؟ بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و مژولی جنێودانی خۆی بوو، ئیدی بێ هیچ قسەکردنێک گرتی بەقرێتەکەیدا و بەقاڵدرمەکاندا سەرکەوت.

لەم کاتەدا هاوسێی دووەم بەسەراهات، لە گەڕەک و باندا پێیان دەگوت «گەواد»، ئەمە خەڵکی بۆیان دروست کردووە، هەندێ جار دەهاتە لای من و قسانی دەکرد، چونکە دەیزانی من گوێی لێ دەگرم، چ هۆیەک لە ئاردا نەبوو کە قسانی لەگەڵدا نەکەم. ناوی «رایموند سانتس»ە کابرایەکی کورتە باڵای، ناو شان پانی لووت فش بوو، هەمیشە جلوبەرگی ڕێک و جوانی دەپۆشی، دەربارەی سالامانۆ پێی گوتم: ئەمە بەدبەخت نییە؟ ئەوجا لێی پرسیم: ئایا ڕقم لەم کابرایە نییە، گوتم: نەخێر.

بەدوو قۆڵی بەسەر قاڵدرمەکاندا سەرکەوتین، کە ویستم لێی جوێ ببمەوە پێی گوتم: لە ماڵەوە شەراب و خواردنم هەیە ئەگەر تەشریف بینی پێکەوە پارووییەک بخۆین، بیرم کردەوە کە ئەگەر بچم بەلای کەمەوە لە ئامادەکردنی خواردن دەخەڵەسێم، بۆیە چووم، ئەویش تاقە ژوورێکی هەبوو، موبەقەکەی پەنجەرەی تێدا نەبوو، گەلێ وێنەی بەدیواری ژوورەکەیدا هەڵواسیبوو، زۆربەیان وێنەی ژنانی ڕووت بوون، ژوورەکە پیس، جێگاو بانەکەی پەرپووت و بەیەکادراو بوو، لە سەرەتادا چراکەی هەڵکرد، ئەوجا پارچەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و مەچەکی پێچا، کە لیم پرسی: ئەمە چییە؟ گوتی: لەگەڵ یەکێکدا کە دەیویست ڕێی پێ بگرێ بەشەڕ هاتووە، لەسەری ڕۆیی: جەنابی مەرسۆ خەیاڵ نەکەی من کابرایەکی خراپم، بەڵام کەمێک توندە تابیەتم، ئەو برادەرەی کە لەگەڵیا بەشەڕهاتم، کە منی بینی بەشۆخییەوە

گوتی: تۆ بنیادەم نیت، وەڵامم دایەوە کە واز لە شۆخی بێنێ کەچی سوورتر بوو و گوتی کەوایە تۆ هەر بنیادەم نیت، منیش نەمکردە نامەردی و بۆی دابەزیم و گوتم ئێستا واز لەم قسانە دێنی یان چارت بکەم. گوتی چۆنم چار دەکەیت. ناچار مستەکۆڵەیەکم لە دوڕ دەوی دا و لەسەر عەردەکە خپ بوو، ویستم هەڵی بستێنمەوە، بەدەموچاوی خوێناوییەوە لەقەیەکی پێدا ماڵیم، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ڕایموند سەرقاڵی بەستنی دەستی بوو، منیش لەسەر جێگاکەم دانیشتبووم، پێی گوتم دەبینی کە ئەو شەڕی پێ فرۆشتووم، خەتای من نەبوو.

ڕاستی دەکرد، من شارەزای ڕەوشتی ئەو بووم، ئەوجا گوتی حەز دەکەم دەربارەی ئەم بابەتە گوێم لە ئامۆژگاری تۆ بێ، پیاو دەبێ چی بکات، ئایا دەکرێ پیاو بەرانبەر هەڕەشە و شەڕ پێ فرۆشتنی خەڵکان بێدەنگ بێ.

ئەوجا خواردنەکەی هێنا و لەسەر مێزەکەی دانا، پەرداخی تەرتیب کرد، قاپ و چەقوو و چەتاڵی هێنا و هەر یەکەیانی لە جێی خۆی دانا. تەواوی ئەم کارانە بەبێدەنگی ئەنجام درا، ئەوجا هەردووکمان لە پشت مێزەکەوە دانیشتین و دەستمان بەخواردن کرد.

بەدەم نانخواردنەوە باسی خۆی هێنایە پێشەوە، لە سەرەتادا دوودڵ بوو لە گوتنی هەندێ مەبەست، دوایی هاتە قسان و گوتی: ناسیاویم لەگەڵ ژنێکدا پەیدا کرد، ئیدی بوو بوو بەدۆستی تایبەتیم، ئەو پیاوەی کە شەڕم لە گەڵدا کرد برای ئەم ژنە بوو.

پێی گوتم: براکەی پێی زانیبوو، ڕۆژی یەکەم پێی گوتم، بەڵام خۆم گێل کرد، بەهەر حاڵ دوای ماوەیەک زانیم کە ئەم ژنە تەفرەم دەدات، من خەرجیم دەکێشا، ڕۆژێ بیست فرانکم دەدایێ، ئەگەر حیسابی ورد بکەم سێ سەد فرانک کرێی خانوو، ناو بەناو جووتێ گۆرەویم بۆ دەکڕی. بەهەمووی مانگێ هەزار فرانکێک لەسەرم دەکەوت، ئەم ژنە کاری نەدەکرد، هەمیشە دەیگوت کە ئەو پارەیەی لە منی وەردەگرت بەشی ناکات... پێم دەگوت: بۆ تاقێ کار ناکەیت. ئەگەر کار بکەیت بەلای کەمەوە دەتوانیت شتە پێویستییەکانی خۆت دابین بکەیت. من لەم مانگەدا هەموو شتێکم بۆ کڕیوت، ڕۆژێ بیست فرانک خەرجیم داویتێ، کرێ خانووم بۆ داویت، قاوەی عەسرانت لەسەر من بووە، لەوەی پتر چیت گەرەکە، من زۆر لەگەڵتدا باش بووم، بەڵام تۆ لەبری ئەوە ئازارم دەدەیت، بەڵام ئەم قسانەی بەگوێدا ناچوو، ئامادەی کارکردن نەبوو، بۆیە وام بەبیرا دێ کە هەڵم دەخەڵەتێنێ.

پێی گوتم، ڕۆژێ بلیتێکی یانەسیبم لە جانتاکەیدا بینی، جارێکی دی کاغەزێکم لە جانتاکەیدا بینی، سەیرم کرد بازنگی خستۆتە بارمتەوە، کە ئەم شتانەم بینی بەتەواوی بۆم دەرکەوت و دڵنیا بووم کە فریوم دەدات، ناچار وازم لێی هێنا، تێروپڕم دارکاری کرد و یەک یەک کارەکانیم بەڕوویدا دایەوە. پێم گوت کە دەیەوێ بەم قسانە تەفرەم بدات، تۆ نازانیت، خەڵکی بەخیلی بەژیانی تۆ دەبەن، کە لە من جیا بوویتەوە ئەوجا دەزانیت، چ خۆشی و شادییەکەت لە دەست داوە.

جاران لێم نادا، خۆ ئەگەر ئەمە جارێ ڕووی دابا، ئەوا تەنیا بۆ ترساندنی بوو و هەندێ بۆڵە بۆڵم بەسەریا دەکرد و پەنجەرەکانم دادەخست و ئیدی چیم ویستبا دەمکرد، بەڵام ئەوڕۆ شتەکە جیاواز بوو،



بەباوەڕی من گشت ئەم کارانە بۆ ئەو بەس نەبوو، تەواو تەمێ نەبووە.

دوای گوتنی گشت ئەم بەسەرهاتانە گوتی لەبەر ئەمە بوو پەنام بۆ تۆ هێنا تا لەم بارەیەوە کۆمەکێکم پێ بکەیت.

لەم ماوەیەدا پتر لە قاپێکم خواردبووەوە، سەرم گەرم بوو بوو، چونکە خۆم جگەرەم نەما بوو، پەیتا پەیتا جگەرەی ئەوم دەکێشا، وردە وردە سەر و سەدای دەرەوەش کەم بوو، ڕایموند دەستی بەقسان کردەوە، شتێکی گرنگ وای لێ کردبوو قسان بکات، ئەویش ئەوەبوو هێشتا دۆستەکەی خۆش دەویست، بەڵام دەیویست تەمێی بکات، لە سەرەتادا بیری کردبووەوە کە بیباتە ئوتێلێک و خەڵکی بەسەردا پرژێنێ و ڕیسوای بکات و ئەوجا بەگرتی بدات، ئیدی بۆ ئەمە پەنای بردبووە بەر ئاشنا و دۆستانی گەڕەک، لێ کەس ئامادە نەبوو لەم بارەیەوە کۆمەکی پێ بکات، تەنیا هەندێک پێیان گوتبوو کە بۆ تەمێکردن داغی بکات. بەڵام دڵی نەدەهات ئەم کارە بکات و پێی گوتبوون دەبێ بیر بکاتەوە، هەوەڵ جار ویستی ڕای من لەم بارەیەوە بزانێت، پێش ئەوەی ڕام بزانێ پرسی ئایا تەگبیری چییە، لە وەڵاما گوتم من لەم بارەیەوە ڕام نییە. ئەوجا پرسی: تۆ فریودان لە مەسەلەکەدا نابینی، بیرم دەکردەوە کە ئەگەر فریودانیش لە گۆڕێ دابێ گرنگ نییە، گوتم لەم بابەتە شتانەدا سەلیقەی خەڵکی جیاوازە، هەرچەن وەڵامەکانی من بێ سەروبەر بووون بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پێویستە بەهەر شێوەیەک بێ ئەو ژنە سزا بدرێ.

کەمێکی ترم خواردەوە، جگەرەیەکی بۆ پێ کردم، ئەو ڕای وابوو نامەیەکی بۆ بنووسێت و هەر کە هاتەوە جارێکی دی دارکاری دەکات و تۆڵەی خۆی لێ دەستێنێ.

لە قسەکانیا دەیگوت، کە جارێکی دی هاتەوە ماڵەکەم لەگەڵیدا دەنووم و کە کاری خۆم تەواو کرد تفێک دەکەمە چارەی و دەری دەکەم.

بیرم کردەوە کە لە ڕاستیدا ئەم شێوە سزایە گەلێک سەختە، بەڵام ڕایموند پێی گوتم: کە من ناتوانم نامەیەکی وەهای بۆ بنووسم.

من بێدەنگ بووم، داوای لێ کردم ئاخۆ دەکرێ من نامەیەکی بۆ بنووسم، لە وەڵاما گوتم بۆ نە، پەرداخێکی هەڵدا، هەستا، قاپە بەتاڵەکە و پاشماوەی خواردنەکەی خستە لاوە، مێزەکەی پاک کردەوە. ئەوجا کاغەزێکی سپی و زەرفێکی زەرد باو و پەڕەمووچێک و شووشەیەک مەرەکەبی لە چەکمەجەی مێزەکە دەرهێنا، قەڵەمەکەی دایە دەستم کە نامەیەکی بۆ بنووسم، منیش بەئارەزووی ئەو و چیم بەبیرا هات نووسیم و ئەوجا بەدەنگی بەرز نامەکەم بۆی خوێندەوە، بەدەم جگەرەکێشان و سەرلەقاندنەوە گوێی گرتبوو، تکای لێ کردم کە جارێکی دی بۆی بخوێنمەوە، کە دوو جارانم بۆ خوێندەوە و پێ دەچوو ڕازی و شاد بێ، ئەوجا پێی گوتم: دەمزانی کە تۆ واتای ژیان دەزانیت... بەڵام ئاگام لەوە نەبوو کە لەبری ئێوە پێی گوتم تۆ. لە کۆتایی قسەکانیا گوتی: بەڕاستی تۆ مرۆڤێکی چاکیت.

نامەکەی خستە زەرفەکەوە، تۆزێکی دی مژولی جگەرەکێشان بووین و چ قسانمان نەدەکرد. بێدەنگی باڵی بەسەر دەرێدا کێشا بوو، گوێمان لە دەنگی نزیکبوونەوەی ترومبێلێک بوو، پێم گوت: درەنگە.

ڕایموندیش زانی کە هەق بەمنە، کات بەخێرایی دەڕۆیی، سیمای منیش ئەوەی دەنواند کە زۆر ماندووم، لە قسەکانیا پێی گوتم: من مەرگی دایکتم بیست، بەڵام گرنگ نییە، مەرگ شتێکە هەر دەبێ ببێ جا درەنگ یا زوو.

هەستام، ڕایموند دەستی گوشیم، گوتی بەڕاستی مرۆڤی تێگەیشتوو زووتر لە یەکدی تێدەگەن، یەکدی دەناسن. کە دەرچووم لە دوای خۆمەوە دەرگاکەم داخست. ماوەیەک بەتاریکی لەسەر قاڵدرمەکە وێستام، بێدەنگی باڵی بەسەر خانووەکەدا کێشا بوو، جار جارێ شنەی با لق و پۆپی درەختەکانی دەهەژاند. بەهاسانی گوێم لە هاتوچۆی خوێنی نێو دەمارەکانی لاجانگم دەبوو، ماوەیەک بێدەنگ و بێ جووڵە مامەوە. لە ژوورەکەی سالامانۆی پیردا سەگە بێچارەکە هێشتا دەی قرووسکاند.

## ٤

لەم هەفتەیەدا زۆرم کار کرد، ڕایموند هاتە دیدەنیم و ئاگاداری کردمەوە کە نامەکەی خستووەتە پۆستەوە، هەر لەم هەفتەیەدا دوو جاران لەگەڵ ئەمانۆیل دا چوومە سینەما، ئەمانۆیل کابرایەک بوو سەری لە سینەما دەرنەدەچوو، دەبوو هەموو مەبەستەکانی دوو جاران بۆ ڕوون بکەمەوە و باسی بکەم تا تۆزێکی لێ حاڵی ببێ.

دوێنێ شەممە بوو، وەک بڕیار بوو ماری هاتە دیدەنیم، ئەو ڕۆژە زۆرم تاسە دەکرد، بەتایبەتی کە کراسێکی جوانی مەقەلەمی سوور و سپی لەبەر کردبوو، پاپووجێکی نایاب و ناسکی لە پێ کردبوو، لە پشت کراسەکەیەوە گۆی مەمکە سفت و تورتەکانی شەڕیان بەهەوا دەفرۆشت و چزووی بەنیگادا دەکرد، تیشکی هەتاو گۆناکانی درەخشانتر دەنواند، سواری ترومبێل بووین، لە دووری بیست کیلۆمەترێک لە شاری جەزایرەوە بەرەو کەناری دەریا کەوتینە ڕێ، تاشەبەرد لە ڕۆخی کەنارەکەدا بێ باک ڕاکشابوون، درەختی سەوزیش لە نێوانیانەوە سەریان بەرز کردبووەوە، هەتاوی سەعات چواری ئێوارێ زۆر گەرم نەبوو، بەڵام ئاوی دەریا شیرتێن بوو، خۆی دابووە دەم وردە شەپۆڵەوە، ماری فێری جۆرە یارییەکی کردم کە بریتی بوو لەوەی بەپشتە مەلە خۆمان بدەینە دەم ڕەوتی شەپۆڵەکانەوە و دەممان پڕ لە ئاو بکەین و بەئاسماندا بیپرژێنین و لە شێوەی بارانا بێتەوە بەسەروچاوماندا، دوای کەمێک هەستم کرد کە خوێیاوی دەریاکە دەم دەزوورێنێتەوە. ئیدی ماری خۆی گەیاندمێ، سواری پشتم بوو دەمی دەنێو دەمم خست و بەزمان لێوی فێنک دەکردمەوە، دوای چەند ماوەیەک وەکو دوو ماسی خز یەکدیمان لە باوەشی یەکتردا هەڵدەگلۆفت و دەگەوزاند، کە لە کەنارەکەدا خۆمان لەبەر کرد، ماری بەدووچاوی درەخشانەوە تێی ڕوانیم. دەستم لە ملی کرد، نووساندم بەخۆمەوە، ماچێکی تەڕ و گەرمم لێی ستاند، ئیدی چ قسەیەکمان نەکرد... بەو حاڵەوە کەوتینە ڕێ کە ترومبێل پەیدا بکەین.

گەیشتینەوە ماڵێ، لەسەر جێگاکەمدا یەکمان دەگەوزاند، پەنجەرەکەمم بەوازی جێ هێشتبوو، هەوای پاک دەهاتە ژوورەوە و زێدەتر لەزەتی بەرۆح و لەشمان دەبەخشی.



ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی ماری لەلای من مایەوە، پێم گوت کە نیوەڕۆژە پێکەوە دەکەین، چوومە خوارەوە کە هەندێ گۆشت بکڕم، لە ژوورەکەی ڕایموندەوە دەنگی ئافرەتێکم هاتە گوێ، دوای تۆزێکی دی گوێم لە جنێودانی سالامانۆ بوو کە سەگەکەی سەرزەنشت دەکرد، هەردووکمان گوێمان لە بەیەکدا کەوتنی هەندێ شت بوو، دوای چەند چرکەیەک سالامانۆ و سەگەکەی ڕۆیشتن، بەسەرهاتی سالامانۆم بۆ ماری گێڕایەوە، زۆر پێکەنی، ماری بێجامەیەکی منی لەبەر کردبوو، قۆڵەکانی هەڵکردبوو، کە ماری پێکەنی پتر لە دڵمدا شیرین بوو، ئارەزووی بزواندم، دوای تۆزێک لێی پرسیم، ئایا خۆشیم دەوێ، لە وەڵاما گوتم پێویست ناکا ئەم شتانەی بەزاردا بێ، بەڵام لە ناخا هەستم بەپێچەوانەی ئەوە دەکرد، بەم وەڵامە کەمێک غەمگین بوو، لێ کە خواردن ئامادە بوو قسانی دی هاتنە گۆڕێ دیسان دەستی بەپێکەنین کردەوە، لە خۆشیاندا لە ئامێزم گرت و ڕاموسی.

لەم کاتەدا دەنگی شەڕ و ئاژاوە لە ژوورەکەی ڕایموندەوە بەرز بووەوە، لە سەرەتادا دەنگێکی ناسکی ژنانە بەرگوێ کەوت، دوایی ڕایموند بەدەنگی بەرز هاواری کرد و دەیگوت: تۆ ناپاکیت لەگەڵدا کردوم، ئێستا پێت نیشان دەدەم کە چۆن ناپاکی دەکەیت، ئیدی هاواری پەی دەرپەی ژنێک بەرز بووەوە، ئەم هاوارە هێندە بەرز بوو کە تەواوی دراوسێکانی ئاگادار کردەوە، من و ماریش چووینە دەرەوە، ژنەکە بەردەوام هاواری دەکرد و ڕایموند لە پشتەوە لێی دەدا.

ماری دەیگوت بەڕاستی دیمەنێکی ترسناک و ناخۆشە، داوای لێ کردم کە پۆلیس ئاگادار بکەمەوە، پێم گوت باش نییە پۆلیس دەست بخەنە ئەم کارانەوە، لەم کاتە پۆلیسێک لەگەڵ یەکێک لە دراوسێکاندا گەیین و بەتوندی لە دەرگایان دا، بەڵام کەس وەڵامی نەدانەوە، جارێکی دی لە دەرگایان دا. دەنگی گریانی ژنەکە بەرز بووەوە، ڕایموند دەرگاکەی کردەوە، جگەرەیەکی بەلالێوەوە بوو، ئارام و هێدی دەهاتە بەرچاو. ژنەکە خۆی دەرباز کرد و لە ژوورەکە هاتە دەرێ و سکاڵای خۆی کرد و گوتی کە ڕایموند لێی داوە.

پۆلیسەکە پرسی: نێوت چییە. ڕایموند ویستی وەڵام بداتەوە، پۆلیسەکە نەڕاندی، کە ویستت لەگەڵ مندا قسان بکەیت جگەرەکەت فڕێ بدە و کەمێ بەئەدەب بە، ڕایموند نیگایەکی سەیری تێ بڕی و تەماشایەکی منی کرد، جگەرەکەی بەدەستەوە گرت، لەم کاتەدا پۆلیسەکە زللەیەکی توندی پێدا کێشا، جگەرەکە لە دەستی پەڕی و چەند مەترێ لەو لاترەوە کەوت، ڕوخساری ڕایموند گۆڕا، بەڵام لەو کاتەدا هیچی نەگوت، تەنیا ئەوە نەبێ کە داوای لە پۆلیسەکە کرد کە ئەم ژنە حەشەرییە لێرە بەرێ.

پۆلیسەکە گوتی قەیدی نییە، بەڵام دەبێ جارێکی دیش ئەوە بزانیت کە نابێ ڕەفتارت لەگەڵ پۆلیسدا وەکو ڕەفتارت لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا بێ.

ژنەکە بەردەوام دەگریا و دەیگوت: ئەو لێی دام، کابرایەکی خەتەرناکە.

رایموند هاتە قسان و گوتی کاکی پۆلیس دەبێ ئێوە ئەوە بزانن کە بەگوێرەی یاسا کەس بۆی نییە تۆمەتی خەتەرناکی بداتە پاڵ کەسێکی دی.

پۆلیسەکە هاواری کرد، بەسە، دەمت داخە. ڕایموند چ وەڵامێکی نەدایەوە، ڕووی کردە ژنەکە و گوتی: ئەمجارە ڕۆیی، کەسێ نەمرێ جارێکی دی یەک دەبینینەوە.

پۆلیسەکە گوتی: ژنەکە دەتوانێ بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی، و تۆ دەبێ لە ماڵەوە بمێنیتەوە تاکو پۆلیس دەنێرین بەشوێنتدا، تۆ دەبی شەرمەزار بی کە ئەوەندە مەستیت و لە نێو خەڵکیدا قسەی بێ سەروبەر دەکەیت. ڕایموند گوتی: نەخێر من مەست نیم، ئەگەر دەبینی گیانم دەلەرزێ ئەوە لە حیرساندایە نەک لە مەستیدا، ئیدی دەرگاکەی داخست و خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد.

من و ماری نیوەڕۆژەمان ئامادە کردبوو بەڵام ماری برسی نەبوو، سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ خواحافیزی کرد و ڕۆیی، منیش کەمێک لەوە دوا نووستم.

دەوروبەری سەعات سێی پاش نیوەڕۆ بوو کە لە دەرگا درا، ڕایموند هاتە ژوورەوە، من تا ئەو کاتە نووستبووم، لە قەراخێکی قەرەوێڵەکەمەوە دانیشت. ماوەیەک بێدەنگ بوو، لێم پرسی شتەکە چۆن بوو، گوتی ئەوەی دەیویست کردی، بەڵام ئەویش دەستەوسان نەبوو لێی هەڵگەڕایەوە و زللەیەکی توندی پێدا کێشا، و پاشماوەکەشی بەچاوی خۆم بینم، گوتم بەڕای من بەتەواوی بەسزای خۆی گەیی و پێویستە ئەم بەمە ڕازی و خۆشحاڵ بێ، خۆشی هەر ئەمە ڕای بوو، ئەوەشی دەرخست کە کردەوەی پۆلیسەکە زۆر ناپەسەند بوو، دەیویست بڵێ کە ئەو پۆلیس باش دەناسیت و دەزانێت دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ.

پرسی ئایا دەبوو وەڵامی زللەی پۆلیسەکە بدەمەوە یان بێدەنگ بم، پێم گوت: من ڕام وایە نابێ لە دوای ئەم شتانە بڕۆی، پێ دەچوو ڕایموند بەم وەڵامانەی من خۆشحاڵ بێ، داوای لێ کردم کە لەگەڵیدا بچمە دەرێ، هەستام، سەرم شانە کرد. لێم پاڕایەوە کە لە دادگادا گەواهی بۆ بدەم، بۆ من چ جیاوازییەکی نەبوو، بەڵام نەمدەزانی دەبێ لەوێدا چ بڵێم. ڕایموند دەیویست ئەوە بڵێم کە ژنەکە ناپاکی لێ کردووە، بۆیە ئامادە بوو کە ببم بەشایەتی. لەگەڵ ڕایموندا چووینە دەرێ و ماوەیەکمان بەیاری بلیاردەوە بەسەر برد، دەیویست یارییەکی دی بکەین، بەڵام چونکە حەزم نەدەکرد ڕێی گەڕانەوەمان گرتە بەر. لە ڕێگادا بۆی باس کردم کە چەند خۆشحاڵە بەوەی کە توانی دۆستەکەی سزا بدات. ڕەفتاری لەگەڵ مندا یەکجار چاک بوو، چونکە لەم کارەدا کۆمەکم پێ کردبوو.

لە دوورەوە سالامانۆم بینی. لەبەردەرگا وێستا بوو، بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە و چاوی بەدەوروبەری خۆیدا دەگێڕا. کە لێی نیزک بووینەوە سەیرمان کرد سەگەکەی لە گەڵیدا نییە و خێرا خێرا دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی. چاوەکانی بڕیبووە ڕاڕەوە تاریکەکان و لە بەرخۆیەوە ورتە ورتێکی نامەفهومی دەکرد و ئەوجا چاوی بڕییە کۆڵانەکان و ئەو ناوەی دەپشکنی. کە ڕایموند لێی پرسی چی بووە، وەڵامی نەدایەوە. گوێمان لێ بوو کە لەبەر خۆیەوە منجە منجی دەکرد و دەیگوت ئەی گیانداری نارەسەن. دیسان کەوتە پشکنین. لێم پرسی کە سەگەکەی چی لێ هاتووە، دەسبەجێ وەڵامی دامەوە، نازانم بۆ کوێ چووە. ئەوجا بەخێرایی گوتی: وەکو هەمیشە بردبووم بۆ مەیدانی وازی، خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆ بوو بوونەوە و من لە بەر دوکانێکدا وێستا بووم و تەماشای تفاقی یارییەکانم دەکرد. کە ویستم بگەڕێمەوە سەگەکە نەما بوو.



ماوەیەک لەوەپێش بیرم لەوە دەکردەوە کە قرێتەیەکی گچکەتری بۆ بکڕم. چوزانم ئەم نارەسەنە بەم ئاسانییە لە دەستم هەڵدێ.

رایموند گوتی لەوانەیە سەگەکەت ون بووبێ و هەر دێتەوە، گەلێک بەسەرهاتی سەگانی بۆ باس کرد کە چەندین کیلۆمەتر دوور کەوتوونەتەوە و ئاقیبەت گەڕاونەتەوە، کابرای پیرەمێرد نارەحەت بوو، دەیگوت ئاخری ئەم سەگەیان لە چنگم دەرهێنا. لەوانەیە یەکێک لێمی وەربگرێ بەڵام کەس ڕای ناگرێ، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە ڕەفتاری ناپەسەندی وەرس دەبن، لەوانەیە پۆلیس بیگرن. ئەم مەسەلەیە گومانی تێدا نییە، پێم گوت ڕەنگە بردبیتیان بۆ بنکەی ئاگاداری گیانداران و دەتوانیت بەجەزایەکی کەم وەری بگریتەوە. لێی پرسیم ئایا ئەم سزایانە یاساییە یان ئەمە نەماوە. گوتم نازانم، بەهەر حاڵ بەپارە هەموو شتێک دەکرێ، دیسان پەست بوو گوتی: پارە لەم گیاندارە نارەسەنەش خەرج بکەم، خەریکە لە داخا بمرم... دیسان دەستی بەجنێودان کردەوە، ڕایموند پێی پێکەنی و خۆی بەژوورەکەی خۆیدا کرد. منیش لە دوای ئەوەوە سەرکەوتم و لەسەر پلەکان لە یەکدی جودا بووینەوە.

دوای تۆزێ گوێم لە دەنگی پێی کابرای پیرەمێرد بوو، هێندەی پێ نەچوو لە دەرگاکەی دام، کە دەرگام کردەوە تۆزێ بەبێدەنگی لەبەر دەرگادا وێستا و ئەوجا گوتی: ببوورە مزاحمت بووم.

خوڵکم کرد کە بێتە ژوورەوە، لێ نەهات، تەماشای پێڵاوەکان و دەستە لەرزۆکەکانی خۆی دەکرد، بێ ئەوەی سەرهەڵبڕێ و تەماشام بکات گوتی: کاک مەرسۆ ڕاستیم پێ بڵێ ئایا ئەوانە ئەم سەگەم لەدەست دەرنایەنن، ئاخۆ دەم دەنەوە، ئەگەر پەیدا نەبێتەوە تەگبیرم چییە.

وەڵامم دایەوە، بنکەی ئاگاداری گیانداران بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سەگەکان لە لای خۆ دەپارێزن تا خاوەنەکەی پەیدا دەبێ و دەیدەنەوە، لە سێ ڕۆژە بەدواوە ئیدی ئارەزووی خۆیانە چی لێ دەکەن یان نەکەن.

ماوەیەک بەبێدەنگی تەماشای کردم، ئەوجا ئێوارەباشی لێ کردم و چووە ژوورەکەی خۆی، گوێم لێ بوو تا ماوەیەک بەژوورەکەیدا هاتوچۆی دەکرد، دەنگێک لە قەرەوێڵەکەیەوە هات، ئەوەی سەیر بوو، لە کپی شەودا و لە پشت تیغە دیوارەکەوە دەنگی گریانیم بەر گوێ کەوت. نازانم بۆ لەم کاتەدا دایکم بیر کەوتەوە. بەهەر حاڵ چونکە دەبوایە بەیانی زوو لە خەو ڕابم، و برسیم نەبوو، بەبێ شام خەوتم.

## ٥

رایموند تەلەفۆنی بۆ دایەرە کرد و پێی گوتم کە یەکێک لەو برادەرانەی کە منیش دەیناسم داوەتی کردووم کە ڕۆژی یەک شەممە لە کابینەکەی ئەودا و لە نزیک جەزایردا بگوزەرێنم، گوتم ناتوانم چونکە بۆ ڕۆژی یەک شەممە لەگەڵ دۆستەکەمدا ژووانم هەیە، ڕایموند بێ ماوەدان گوتی کە ئەویش داوەت دەکات، هەڵبەتە ژنی برادەرەکەی ئەو زۆر خۆشحاڵ دەبێ کە ژنێک لەگەڵ مندا بێت و لە نێوان چەند پیاوێکدا کە دەچنە ماڵی ئەوان هاودەمێکی هەبێ، چونکە دەمزانی سەرۆک دایەرەکەم حەز ناکا فەرمانبەرەکان

تەلەفۆن بکەن ویستم تەلەفۆنەکە دابخەمەوە. بەڵام ڕایموند تکای لێ کردم کە تۆزێ سەبر بکەم، ئەوجا گوتی دەربارەی داوەتەکە ئێواریێ قسانم لەگەڵدا دەکات. چونکە شتی تری هەیە و دەبێ باسی بکات، شتەکەش ئەوەبوو کە ئەو ڕۆژە چەند کابرایەکی عەرەب دوای کەوتوون، برای دۆستەکەشی لە گەڵیاندا بووە، پێی گوتم ئەگەر عەسر لە ڕێگا بینیت ئاگادارم بکەوە، وەڵامم دایەوە و تەلەفۆنەکەم داخست.

دوای چەند چرکەیەک سەرۆک کارەکەم گازی کردم، کە بەرەو ژوورەکەی ئەو دەچووم زۆر ناڕەحەت بوو بووم، چونکە وام دەزانی بۆ مەسەلەی تەلەفۆنەکە بانگم دەکات و لەوانەیە لە چۆنێتی کارکردنی من ناڕازی بێ، بەڵام چ شتێک لەم بابەتەوە نەبوو، گوتی دەیەوێ دەربارەی پرۆژەیەکی زۆر گرنگ قسانم لەگەڵدا بکات و دەیەوێ ڕای من دەربارەی ئەو پرۆژەیە بزانێت. دەیویست لقێک لە پاریسدا بکاتەوە و لە ڕێگای کۆمپانیا گەورەکانەوە کاڵاکانی خۆی بفرۆشێت، دوای درکاندنی ئەم مەبەستە پرسی کە ئاخۆ من ڕازیم بۆ پاریس بڕۆم، ئەگەر ئەم کارەم پەسند بکردایە، دەبوایە لە پاریسدا بژیم زۆربەی کات لە مامووری و سەفەردا بوومایە، دەیگوت تۆ گەنجیت و لام وایە ئەم کارە ڕازیت بکات. بەڕواڵەت پێشنیازەکەیم پەسەند کرد، بەڵام لە ناخدا بۆ من چ جیاوازییەکی تێدا نەبوو. لێی پرسیم ئایا خۆشحاڵ نیت بەگۆڕینی ژیانت. گوتم ژیانی ئادەمیزاد بەهیچ جۆرێ ناگۆڕێت و هەموو یەکسانە، بەڵگەش ئەوەیە لێرە زۆر لە ژیانی خۆم ناڕەحەت نیم، کەمێک ناڕازی هاتە پێش چاو، گوتی کە قسەکانم هەمیشە لاوەکی و یەک لایەنە، هیچ هەڵپەیەکم نییە و ئەمەش بۆ کەسانێ کە بیانەوێ کار بکەن زۆر پەسەند نییە.

گەڕامەوە سەرکارەکەی خۆم، حەزم دەکرد دڵی نەشکێنم، بەلام لە لایەکی ترەوە هیچ پاساوێکم بۆ گۆڕینی ژیانم نابینی، کە بەچاکی بەژیانی خۆمدا چوومەوە، هیچ جۆرە خراپییەک یان بەدبەختییەکم تێدا نەدەبینی.

کاتێ کە دەمخوێند لەم جۆرە هەڵپە و ئارەزووانەم زۆر بوو، بەڵام کە دەستم لە خوێندن هەڵگرت، بۆم دەرکەوت کە لە ڕاستیدا تەواوی ئەم شتانە هیچ بایەخ و نرخێکیان نییە.

ئەو عەسرە ماری هات بۆ لام لێی پرسیم ئایا دەمەوێ بیخوازم. گوتم بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە، ئەگەر ئەو حەز دەکات منیش ڕازیم.

پرسی، لە سەرەتادا دەبێ بزانم ئایا منت خۆش دەوێ، هەمان وەڵامم دایەوە کە چەند جارێک بۆم دووبارە کردبووەوە و گوتم ئەم قسانە هیچ مانایەکیان نییە. بەڵام بێگومان خۆشم ناویست، پرسی کەوایە بۆچ دەمخوازیت، بۆم ڕوون کردەوە کە ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگ نییە و ئەگەر ئەو مەیلی لەسەر بێ من چ قسەیەکم نییە و دەیخوازم، جگەلەوەش ئەم پێنشیازە لەلایەن ئەوەوە بوو، من بەوەندە خۆم ڕازی دەکرد کە موافەقەت بکەم. ئەو ڕوونی کردەوە کە بەپێچەوانەوە شووکردن و ژن هێنان مەسەلەیەکی گرنگە، گوتم نەخێر وا نییە.

کەمێک بێدەنگ بوو، تەماشای دەکردم و ئەوجا دەستی بەقسان کرد. دەیویست بزانێ ئەگەر ئەم پێشنیازە لەلایەن کیژێکی ترەوە بوایە ڕازی دەبووم، هەمان مامەڵەم لە تەکیا دەکرد، گوتم چ گومانێک



لەم مەسەلەیەدا نییە.

گوتی: ئەگەر تۆم خۆش بوێ بۆ تۆ چ جیاوازییەکی نابێ، سەری لە وەڵامەکەم کە بەڵێ بوو، سوڕما و گوتی لە ڕاستیدا مرۆڤێکی سەیری.

هەر لەبەر ئەمەشە تۆم خۆش دەوێ و دڵنیام ڕۆژێک دێ لێم تێر دەبیت. چونکە دیسان بێدەنگ بووم و چ شتێکم نەبوو بیڵێم، بەپێکەنینەوە قۆڵی بەقۆڵمدا کرد و گوتی لەگەڵ ئەم حاڵەتەشدا دەمەوێ شووت پێ بکەم، گوتم هەر کاتێ بتەوێ من ڕازیم، ئەو جا پێشنیازەکەی سەرۆک کارەکەمم بۆی باس کرد، ماری گوتی: زۆر حەز دەکەم پاریس ببینم، گوتم من ماوەیەک لە پاریس بووم، حەزی دەکرد ڕای من دەربارەی پاریس بزانێ بۆیە گوتم، جێیەکی پیسە. کۆتر و گیاندارانی پیس و چەپەڵی هەیە و خەڵکەکەی سپی پیست و بێ تامن. دوای ماوەیەک کەوتینە پیاسەکردن بەجادە گەورەکانی شارا، ژنانی شۆخ بەبەردەمماندا تێدەپەڕین، لە ماریم پرسی ئایا سەرنجی ئەو ژنانە دەدەیت، گوتی بەڵێ و دەیزانی مەبەستم چییە و چ دەڵێم، ماوەیەکی دی چ قسەیەکمان نەکرد. حەزم دەکرد لە گەڵم دابێ، پێشنیازم کرد کە پێکەوە شام بکەین بەڵام کاری هەبوو بۆیە کە نزیکی ماڵ بووینەوە خوا حافیزیم لێ کرد.

سەیرێکی کردم و گوتی ناتەوێ بزانی چ کارێکم هەیە. لە کارەکەیم پرسی. چونکە هەستم دەکرد بەم خەمساردییەی من کەمێک ناڕەحەتە، لە ئاستی ئەم کەمتەرخەمی و ساردییەی مندا دەستی بەپێکەنین کردەوە. بەجۆرێ بزوابوو دەیویست دەمی بێنێ و دەنێو دەمی بنێ. بەڵام کەمێ سڵی کردەوە. لە خوارنگای سیلستدا شێوم کرد، هێشتا خواردنەکەم تەواو نەکردبوو، لەپڕ ژنێکی کورتە باڵای سەیر لە مێزەکەم نزیک بووەوە و تکای لێ کردم کە لەسەر مێزەکەی من دانیشێت، مۆڵەتم دا، ئەم ژنە ڕەفتاری سەیری هەبوو، چاوە بچووکەکانی لە تەختی دەموچاوە سێو ئاساکەیدا دەدرەوشانەوە. چاکەتەکەی داکەند و لەسەر کورسییەک دانیشت، لیستەی خواردنەکانی بەدەستەوە گرت و دەستی بەخوێندنەوەی کرد. سیلستی گاز کرد و بەدەنگێکی گڕ داوای خواردنی کرد، تا هێنانی خواردنەکە جانتاکەی کردەوە. پارچە کاغەزێکی چوار گۆشە و قەڵەمێکی دەرهێنا و چەند ژمارەیەکی لەسەر نووسی و بەخشی گارسۆنەکەی خستە سەر و کۆی کردەوە. پارەکەی لە سەر مێزەکە و لەبەردەم خۆیدا دانا. لە سەرەتادا خواردنێکی سووکیان بۆ هێنا. بەتاسەوە نای بەسەرەوە. لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی هێنانی خواردنی دی دەکرد، دیسان قەڵەم و گۆڤارێکی دەرهێنا. گۆڤارێ کە وێنەی خواردنی جۆراوجۆری لەسەر نەخشێنرابوو، بەوردی چاوی پێدا خشان، هەرچەند گۆڤاری نێو براو لە دوانزە لاپەڕە کەمتر بوو، بەڵام دەستی لە خوێندنەوەی هەڵنەگرت تا دوا دێری تەواو کرد.

من شامی خۆم تەواو کرد. بەڵام ئەو هێشتا هەوڵی بوو، ئەوجا هەستا و بەهەمان شێوەی تایبەتی چاکەتەکەی کردەوە بەری و چووە دەرێ. چونکە چ کارێکم نەبوو چوومە دەرێ و شوێنی کەوتم. لە کۆتایی جادەکە وێستا و بەپەلەیەکی تایبەتییەوە و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە کەوتە ڕێ و لە نێو قەرەباڵغییەکەدا ون بوو. ناچار بەڕێی خۆمدا گەڕامەوە. بیرم کردەوە کە ژنێکی سەیرە. لێ بەزوویی بەفەرامۆشیم سپارد.

لەبەر دەرگای ماڵەوە سالامانۆم بینی، پێکەوە چووینە ژوورەوە. پێی گوتم کە سەگەکەی ون بووە، لە

بنکەی ئاگاداری گیاندارانیشدا چ هەواڵێکی بەدەست نەکەوتبوو، کاربەدەستێک پێی گوتبوو لەوانەیە لە یەکێک لە کۆڵانەکاندا تۆپیبێت، لێی پرسیبوون ئایا ناشێت لە پۆلیسخانەدا سۆراخێکی دەست بکەوێ، وەڵامیان دابووەوە کە لە پۆلیسخانەدا ئەم شتانە ڕاناگرن و پێوەندی بەوانەوە نییە. چونکە ئەم جۆرە ڕووداوانە ڕۆژانەن و هەموو ڕۆژێک ڕوو دەدەن.

پێشنیازم کرد کە دەتوانێ سەگێکی دی ڕابگرێ، بەڵام بۆی سەلماندم کە ناتوانێت چونکە خووی بەم سەگەوە گرتبوو، من لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشابووم، سالامانۆش لەسەر کورسییەک دەستەوئەژنۆ بەرانبەرم دانیشتبوو، هەندێ جار برێ وشەی نامەفهوومی لەژێر لێوەوە و لە پەنای سمێڵە زەردەکەیەوە دەردەپەڕاند. هەڵبەت هاتنی مایەی نارەحەتیم بوو. بەڵام چیم لەدەست دێ، ئەمە جگە لەوەی هێشتا خەوم نەدەهات. بۆ ئەوەی شتێ بڵێم هەندێ پرسیارم دەربارەی سەگەکەی لێ کرد. گوتی دوای مردنی ژنەکەی ئەم سەگە هاوڕێی هەمیشەیی بووە، زۆر درەنگ ژنی هێنا بوو.

لە سەردەمی گەنجیدا حەزی دەکرد لە مەیدانی شانۆدا کار بکات، کە چووە خزمەتی سەربازی لەوێ نای لێ دەدا و ئاشنای شەیپووری سوپایی بوو، بەڵام لە دواییدا لە ڕێگای هێڵی ئاسن دامەزرا و لە کارەکەی ژیوان نەبوو، چونکە ئێستا مووچەی خانەنشینی وەردەگرت... لەگەڵ ژنەکەیدا زۆر خۆشحاڵ نەبوو، بەڵام بەهەر حاڵ بەهەموو شتێکی ئەو ڕاهاتبوو، کە ژنەکەی مرد. خۆی بەتەنیا بینییەوە، داوای لە یەکێک لە هاوکارەکانی کردبوو کە سەگێکی بۆ پەیدا بکات، بەتایبەتی دەیویست سەگێکی کەم تەمەن بێ، بەڵام چونکە سەگ تەمەنی لە ئادەمیزاد کەمترە ئەم سەگە زۆر زوو لە گەڵ سالامانۆدا پیر بوو.

سالامانۆ دەیگوت ئەم سەگە بەدڕەوشت بوو، زوو زوو شەڕ و دەم بۆڵەیان دەبوو، بەڵام بەهەر حاڵ سەگێکی چاک بوو.

پێم گوت وا دیارە ئەم سەگە لە نەژادی سەگە چاک و ڕەسەنەکان بوو، سالامانۆ بەم قسەیە خۆشحاڵ بوو گوتی وایە، بەرلەوەی نەخۆش بکەوێ تۆ نەت بینیبوو، بەتایبەتی تووکەکەی زۆر جوان و بەرچاو بوو.

لەو ڕۆژەوە کە ئەم سەگە نەخۆش کەوتبوو. سالامانۆ هەموو ڕۆژێ عەسر و بەیانی دەیشۆرد و تیماری دەکرد، بەڵام بەڕای ئەو نەخۆشی ئەم سەگە پیری بوو، پیریش دەردێکە کە هەرگیز دەرمانی نییە.

لەم کاتەدا باوێشکی تەمەڵیم دا، کە پیرەمێردەکە بەو حاڵەوە بینیمی گوتی بەیارمەتیت دەڕۆم، گوتم دەتوانی نەڕۆیت و بەمانەوەت نارەحەت نیم، خەمباری و هاوخەمی خۆم بۆی دەربڕی، سوپاسی کردم و گوتی دایکی تۆ ئەم سەگەی خۆش دەویست، کە باسی ئەوی دەکرد دەیگوت دایکە کلۆڵەکەت و دەیویست دڵم بداتەوە و بەشداری خەمم بکات. من چ وەڵامێکم نەدایەوە. بەنارەحەتییەوە دەیگوت خەڵکی گەڕەک و بان بەدگوییان سەبارەت بەتۆ دەکرد و دەیانگوت لە بری ئەوەی دایکی لەلای خۆی دابنێ و خزمەتی بکات ناردییە داڵدەی پەککەوتەکان. بەڵام ئەو منی دەناسی و دەیزانی کە دایکم زۆر خۆش دەوێ... نەم دەزانی خەڵکی بەهۆی چییەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە بەخەراپەیان باس کردبووم. لە کاتێکدا داڵدەی پەککەوتەکان بەلای منەوە جێگایەکی زۆر چاک بوو، چونکە هێندەم پارە نەبوو بتوانم



خزمەتی دایکمی پێ بکەم، ئەمە جگە لەوەی دەمێ بوو دایکم چ داوایەکی لە من نەبوو، نەیدەتوانی وەکو پێویست لەگەڵ مندا بژی. سالامانۆ گوتی: وایە، لە داڵدەی پەککەوتەکاندا دەیتوانی هەندێ دۆست و ئاشنا بۆ خۆی پەیدا بکات، ئیدی تەوازۆی خواست و حەزی کرد بڕوات پشوو بدات. ژیانی تەواو گۆڕا بوو، نەیدەزانی چی بکا. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا دەستی درێژ کرد، دەستی گوشیم و بەر لە ڕۆیشتن گوتی: خوا بکا ئەوشۆ سەگان نەوەڕن، چونکە من بەسەگەکەی خۆمی دەزانم و نیگەران دەبم.

## ٦

بەیانی یەکشەممە بەزەحمەت لە خەو ڕابووم، ماری بەدەنگەدەنگ بێداری کردمەوە. چونکە دەمانویست مەلە بکەین چمان نەخوارد، چارەم بەسەریەکدا ترشا بوو، کەمێک سەرم دەیەشا، جگەرە لە دەممدا ناخۆش بوو، ماری گاڵتەی پێ کردم، ئەو ڕۆژە کراسێکی کەتانی سپی لەبەر کردبوو، قژی بەسەر شان و ملیدا پەخش کردبوو، باسی جوانی ئەوم کرد، لە خۆشیانا پێکەنی، لەکاتی هاتنە خوارەوەماندا ڕایموندمان گاز کرد، وەڵامی داینەوە کەوا دێت. کە گەیینە سەر جادەکە لەبەر شەکەتی و چونکە تا ئەو ساتە پەنجەرەکانم نەکردبووەوە، هەوای پاک و ئازادی دەرەوە کارێکی تایبەتی بەسەرمەوە هەبوو، ختووکەی دەموچاوی دەدام.

ماری لە خۆشیاندا هەڵدەبەزییەوە و بەردەوام دەیگوت هەواکەی گەلێ خۆشە، دوای تۆزێ هەستم کرد کە حاڵم چاکترە. ناچاربووین لەسەر جادەکە چاوەڕوانی ڕایموند بکەین. گوێمان لە دەنگی داخستنی دەرگاکەی بوو، پانتۆڵێکی شین باو و کراسێکی نیو قۆڵی لەبەر کردبوو، بازووە ڕەشەکانی دەرخستبوو، ماری بەبینینی ئەو پێکەنین گرتی و منیش لە پێکەنینەکەی نارەحەت بووم. بەدەم ڕێوە فیکەی دەکێشا و شەقاوی گەورەی دەنا... سڵاوی لە من کرد. بەماری دەگوت خات شەوی ڕابوردوو لە گەڵیا چوومە پۆلیسخانە و گەواهیم بۆ دا کە لەم ڕووداوەدا خەتای دۆستەکەی بوو، «ڕایموند»یان ڕەها کرد بەمەرجێ جارێکی دی ئەمە دووبارە نەکاتەوە. هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکیان لەبەر ڕۆشنایی شایەتەکەی مندا ئەنجام نەدا. وەک بڕیار بوو، ویستمان بڕۆین بۆ کەناری دەریا، کەنار زۆر دوور نەبوو، ڕایموند دەیگوت برادەرەکەی بەدیتنی ئێمە خۆشحاڵ دەبێ، لەو دەمەدا کە ڕێگامان دەکرد، ڕایموند ئیشارەتی کردمێ و سەرنجی بۆ بەرانبەرمان ڕاکێشام، چەند کابرایەکی عەرەبم بینی کە لەبەردەم موغازەیەکی تووتن فرۆشیدا کۆ بووبوونەوە، بەبێدەنگی سەیری ئێمەیان دەکرد. بەڵام وا خۆیان دەنواند کە ئاگایان لە ئێمە نییە.

ڕایموند گوتی دووەمیان بەلای چەپا، هەمان کابرایە کە بۆم باس کردیت، خێرا گوتی باوەڕ ناکەم چ هەقێکیان بەسەر ئێمەوە هەبێ، چونکە شتەکە کۆن بووە، ماری هیچ لە قسەکانمان حاڵی نەبوو، پرسیاری لێ کردم، پێم گوت ئەم عەرەبانە دوژمنایەتیان لەگەڵ ڕایموندا هەیە، ماری گوتی کەواتە با لە ڕێگایەکی دیکەوە بڕۆین. ڕایموندیش پشتگیری قسەکەی ئەوی کرد، بۆیە ڕێگاکەمان گۆڕی و بەلایەکی دیکەدا کەوتینە ڕێ، ترومبێلێک چەند هەنگاوێ لێمانەوە دوور بوو، لێی نزیک بووینەوە. ڕایموند ئاوڕێکی دایەوە و گوتی خەیاڵتان ڕەحەت بێ وێ دەچێ عەرەبەکان دەخلیان بەسەرمانەوە نەبێ، منیش ئاوڕم

دایەوە، عەرەبەکان لە هەمان جێگادا وێستا بوون و بەبێ موبالاتی و بێ بایەخییەوە دەیانڕوانییە ئێمە. هەموو سوار بووین، ڕایموند بۆ خۆش هاتن و خێرهاتنی ماری دەستی بەشۆخی کرد. هەستم دەکرد ماری خۆشی بەقسەکانی ڕایموندا دەچوو، بەڵام چ وەڵامێکی نادایەوە، تەنیا هەندێ جار بەدەمییەوە پێدەکەنی.

بەرەو بیابانی جەزایر داکشاین، کەناری دەریاکە زۆر لە وێستگای پاسەکەوە دوور نەبوو، گردۆڵکەیەک کەوتبووە نێوان بیابانەکە و دەریاوە، دەبوایە ئەو گردۆڵکەیە ببڕین، بەر لەوەی بگەینە سەر گردۆڵکەکە، گردۆڵکەکە بەردەلان بوو، بەردەکان لەژێر پێماندا خل دەبوونەوە بەسەریەکدا و دەنگیان دەدایەوە. بەهەر حاڵێ بوو خۆمان گەیاندە، سەر گردۆڵکەکە.

لەم کاتەدا و لە دوورەوە دەنگی ترومبێلێک دەهاتە گوێمان، لە دوورەوە ترومبێلێکمان بینی کە بەزەحمەت بەسەر بەردەکاندا دەهات. ماری چەپکە گوڵێکی چنیبوو کە دەمانویست بەرەو دەریاکە بێینە خوارێ چەند کەسێکمان بینی مەلەیان دەکرد. برادەرەکەی ڕایموند لە کابینەیەکدا دەژیا کە کەوتبووە قەراخ کەنارەکە. کابینەکەیان لەسەر چەند پایەیەک بوو کە نیوەی پایەکان لەنێو ئاوەکەدا بوو. ڕایموند ئێمەی ناساند، برادەرەکەی ئەو نێوی ماسون بوو، کابرایەکی باڵابەرزی چوار شانە بوو، ژنەکەی بەپێچەوانەی خۆیەوە یەکێکی کورتەبنەی قەڵەو، بەڕواڵەت ئارام و نەجیب بوو، بەدیالێکتی پاریسی قسەی دەکرد. ماسون داوای لێ کردین کە ئازادی خۆمان وەربگرین. خۆشی دەیویست بچێ بۆ کۆکردنەوەی ئەو ماسییانەی ڕاوی کردبوون، پێم گوت ماڵەکەتان گەلێ جوان و دڵگیرە. وەک خۆی دەیگوت ئەویش ڕۆژانی شەممە و یەک شەممە و پشووەکان بۆ ئێرە دێت، دەیگوت ژنەکەم میوان دۆستە و دەتوانێ وەکو پێویست پێشوازیان بکات. لەو کاتەدا ژنەکەی لەگەڵ ماریدا سەرگەرمی قسە و پێکەنین بوو، ڕەنگە ئەمە یەکەم جار بێ هەستم کرد کە بەڕاستی دەمەوێ ژن بهێنم. ماسون دەیویست لە دەریاکەدا مەلە بکات، بەڵام ئێمە هێشتا بڕیارمان نەدابوو، بەسێ قۆڵی بەسەر تاشەبەردەکانا چووینە خوارەوە. ماری خۆی خستە ئاوەکەوە، من و ماسون کەمێ چاوەڕوانمان کرد. بەکورتی باسی ژیانی خۆی بۆ کردم. دەربارەی ماری گوتی: کیژێکی خشکۆکە ئەگەر ڕاستیت دەوێ جوانییەکی تایبەتی هەیە.

لمی کەنارەکە وردە وردە لەژێر پێماندا گەرم دەبوو. نەم دەویست وا زوو بچمە ئاوەکەوە. دوای ئەوەی تینی هەتاو گەرم بوو، منیش خۆم هەڵدایە ئاوەکەوە. ماسونیش خۆی هەڵدایە دەریاکەوە، مەلەوانێکی چاک و شارەزا نەبوو، ئاوی دەریاکە زۆر سارد بوو، لەزەتم لە مەلەکردن نەبینی. دوای ماوەیەک من و ماری مەودایەکی زۆر لە کەنارەکە دوور کەوتبووینەوە. ماسون کە بینی ئێمە دوور کەوتووینەتەوە خۆی گەیاندەوە کەنارەکە و لەبەر هەتاوەکەدا ڕاکشا. هێندە کەتە و زەلام بوو لە دوورەوە دیار بوو. ماری دەیویست ماوەیەک پێکەوە مەلە بکەین. خۆم خستە پشتییەوە و خۆم پێوەی چەسپاند. لەو دەمەدا کە من خەریکی مەلە بووم، ئەو بەباسکە مەلە بەرەو پێشەوە دەچوو، چونکە زۆرم مەلە کرد هیلاک بووم. ناچار لە ماری جودا بوومەوە و خۆم گەیاندە کەنارەکە. لە کەنارەکەدا و لەتەک ماسونەوە لەسەر لمەکە ڕاکشام و دەموچاوم خستە سەر زەوییەکە، دوای ماوەیەک ماریش هات. لە دوورەوە سەیرم دەکرد. شۆڕاوکی ئاوی دەریاکە ڕەنگێکی تایبەتی پێ بەخشیبوو. بەم هاتنەوە قژەکەی بەپشتدا هەڵدایەوە و



گەلێک جوان بوو بوو. ئەویش لەسەر لا و لە پاڵ مندا ڕاکشا. هەردوو گەرمای هەتاو و لەشی ئەو لای لایەیان بۆ ڕوحم دەکرد. خەو بردمییەوە، وەختێکم زانی ماری ڕام دەتەکێنێ و دەڵێ ماسون خۆی لەبەر کردووە و چووتەوە بۆ ماڵێ. چونکە برسیم بوو دەستبەجێ هەستام، بەڵام ماری تازە کەوتبووە سەر هەوەس و دەیگوت ئەوڕۆ لە بەیانییەوە ماچیم نەکردووە. ڕاستی دەکرد. بەڵام ئیدی وەخت تێپەڕیبوو. زۆرم برسی بوو. هەستا و گوتی با جارێکی دی بچینەوە نێو ئاوەکە، ناچار خۆمان هەڵدایەوە نێو ئاوەکە و بەدەم شەپۆڵەکانەوە چەند شەقاوێک لە کەنارەکە دوور کەوتینەوە. لەو دەمەدا کە ماری بەتوندی خۆی پێمەوە چەسپاندبوو، هەستم کرد لاقەکانی لەلاقم ئاڵاوە، ئەمە هێندە بزوێنەر بوو کە بەڕاستی خستمیە سەر هەوەس. کە لە دەریاکە هاتینە دەرێ ماسون گازی کردین، گوتم زۆرم برسییە، دەمودەست دەستووری بەژنەکەی دا کە خواردن ئامادە بکات. نانەکە زۆر بەلەزەت بوو، بەشە ماسییەکەی خۆم کرد بەدوو پاروو، هەموو بێ ئەوەی ورتەیەکمان لێوە بێت سەرگەرمی خواردن بووین، ماسون جار جارێ شەرابی دەخواردەوە. بەڵام پەیتا پەیتا پەرداخەکەی منی تەژی دەکردەوە. دوای قاوە خواردنەوە سەرم قورس بوو. چەند جگەرەیەکم دوا بەدوای یەک کێشا. من و ماسون و ڕایموند بڕیارمان دا کە تەواوی ماوەی هاوین، ڕۆژانی پشوو بێینە کەنار دەریا. لە پڕ ماری گوتی: ئەرێ دەزانن سەعات چەندە، یانزە و نیو، ئێمە پتر سەرمان لەوە سوڕما کە هێشتا نیوەڕۆ نەبووە و خواردنێکی زۆرمان خواردووە.

ماری گوتی: زۆر گرنگ نییە ئەمڕۆکە کەمێ زوو نانی بەیانیمان خوارد، ئادەمیزاد هەر کاتێ برسی بوو دەتوانێ نان بخوات. ماری بەم قسانە پێکەنین دەیگرت، دەمزانی پێکەنینەکەی ئەنجامی مەستییە، چونکە ئەو ڕۆژە کەمێ زیادی خواردبووەوە، ماسون داوەتی کردین کە پێکەوە لە کەنارەکەدا گەشت بکەین و گوتی: ژنەکەم هەمیشە دوای نیوەڕوان دەنوێ، بەڵام من حەز لەم عادەتە ناکەم و دەمەوێ دوای نیوەرۆژە پیاسە بکەم. هەڵبەت ئەمە بۆ تەندروستی چاکە.

ماری گوتی: من دەمێنمەوە و یارمەتی خات ماسون دەدەم و ئامانەکانی لەگەڵ دەشۆم، خات ماسون بەشۆخییەوە گوتی کارێکی خەراپ نییە. لەم کاتانەدا دەبێ پیاوان بچنە دەرێ تا ژنان بتوانن فریای کاری خۆیان بکەون. ئێمە بەسێ قۆڵی لە ماڵ هاتینە دەرێ، تینی هەتاو هێندەی دی لمەکانی دەجۆشاند، ئاوی دەریاکەش تەواو گەرم بوو بوو. هیچ کەشتییەک لە کەنارەکەدا نەدەبینرا. لە هەندێ لە کابینەکانی دەوروبەری گردۆڵکەکەوە هێشتا تەقە تەقی ئامان و ئامان شتن دەهاتە گوێ. گەرما هەناسەی بنیادەمی سوار دەکرد. بەتایبەتی ئەو هاڵاوە گەرمەی لە چەو و لمی کەنارەکەوە هەڵدەستا لە توانادا نەبوو، لە سەرەتادا ماسون و ڕایموند دەربارەی هەندێ کەس دوان کە من نام ناسین. لەمەوە بۆم دەرکەوت کە دەمێکە یەکدی دەناسن و ماوەیەک پێکەوە ژیاون. لە دەریاکە نزیک بووینەوە و دەستمان بەپیاسە کرد. بەڕادەیەک لە دەریاکە نزیک بووینەوە هەندێ جار شەپۆڵەکان کاڵاکانمانی تەڕ دەکرد. بیرم لە هیچ نەدەکردەوە، تینی هەتاو بەتەواوی خەواڵووی کردبووم. لەم کاتەدا ڕایموند شتێکی بەماسون گوت، بەدروستی حاڵی نەبووم، لە دوورەوە دوو عەرەبم بینی کە بەخێرایی بەرەولای ئێمە دەهاتن. سەیرێکی ڕایموندم کرد، پێی گوتم خۆیەتی. کەوتینە ڕێ. ماسون پرسی چۆن توانیویانە تا ئێرە تاقیبتان بکەن. بیرم

کردەوە کە ڕەنگە دوای ئێمە سواری ترومبێل بووبن و خۆیان گەیاندبێتە ئێرە.

عەرەبەکان هێدی هێدی دەهاتنە پێشێ، تەواو لێکدی نزیک بووینەوە، بێ ئەوەی بچووکترین هەنگاو لەلایەن ئێمەوە بنرێ یان دەست بکەینەوە ڕایموند پێی گوتم ئەگەر شەڕمان بوو تۆ و ماسون دووەم بەرهەق بکەن و خۆم دەکەمە گیانی یەکەم، ئەگەر سێیەم گەیی یارمەتیتان دەدەم، گوتم زۆر چاکە... ماسون دەستەکانی خستنە نێو گیرفانی، لمی کەنار دەریاکە تەواو گەرم بوو بوو، ئێمە هێدی هێدی بەرەو عەرەبەکان دەچووینە پێشەوە، من دەمزانی کە عەرەبی جەزایر پیاوی جەنگن، بەڵام بۆ ڕۆژی تەنگانە خۆم لەوان بەکەمتر نەدەزانی، مەودای نێوانمان تەواو کەم بوو بوو. وەختێ تەواو لێیان نزیک بووینەوە، ئێمە هەنگاوەکانمان خاو کردەوە. ڕایموند بەرەو عەرەبی یەکەم چوو، نەمزانی چی پێ گوت، عەرەبی دووەم مستەکۆڵەیەکی بەسەریا کێشا و ڕایموند بەزوویی وەڵامی دایەوە و ماسونی بانگ کرد. ماسون بەرەو ئەو کابرایەی کە بۆی دیاری کرابوو چوو، دوو بۆکسی توندی بەسەرو سینگیدا کێشا. کابرای عەرەب دەمەو ڕوو کەوتە ئاوەکەوە، بۆ چەند چرکەیەک لە جووڵە کەوت، شەپۆلەکان بەسەر سەر و ڕوویدا دەڕۆیی. لەم کاتەدا ڕایموند خەریکی مشتومڕی خۆی بوو، دەموچاوی کابرای عەرەب بوو بەیەک پارچە خوێن. ئەوجا ڕایموند بەرەولای من گەڕایەوە و گوتی پێویستە تۆش ئەرکی خۆت ئەنجام بدەیت. هاوارم کرد ئاگات لە خۆ بێ چەقۆی پێیە، بەڵام پێش ئەوەی قسەکەی من تەواو بێ بازوو و دەمی ڕایموند لە خوێن هەڵکشان. ماسون بەرەو پێشەوە هەڵمەتی برد. لەم کاتەدا عەرەبەکەی دی، ئەوەی کەوتبووە ئاوەکەوە هەستا و خۆی گەیاندە پەنای برادەرەکەی کە بەچەقۆوە هەڕەشەی لە ئێمە دەکرد، هێدی هێدی کشانەوە و قوچانیان، ئێمەش وەکو خەڵکێ بەر هەورە تریشقە کەوتبێ، بێ جووڵە و واق وڕماو لە جێی خۆمان وێستابووین و ڕایموند بازووی برینداری خۆی دەگوشی.

ماسون دەیگوت من پزیشکێک دەناسم ڕۆژانی پشوو و یەک شەممووان لەم نزیکانەدا بەسەر دەبات، بەڵام ڕایموند کە کەوتە ڕێ قوڵپی خوێن لە دەمییەوە فوارەی کرد. ناچار بەهەر جۆرێ بوو ئەومان لە باوەش گرت و بەخێرایی بەرەو کابینەکە هاتین. ڕایموند کەمێ پشووی دا و گوتی زامەکەم قووڵ نییە گەر زوو خۆم بگەیەنمە پزیشکەکە چ ترسێک لە ئارادا نامێنێ. بەهەر حاڵێ بوو لەگەڵ ماسوندا کەوتنە سۆراخی پزیشک، منیش لەماڵەوە مامەوە و شتەکەم بۆ ژنەکان باس دەکرد.

خات ماسون دەگریا و ماری ڕەنگی پەڕیبوو، منیش بەزەحمەت دڵم دەدانەوە، دوای ماوەیەک لە سووچێکدا ڕاکشام و جگەرەیەکم پێ کرد و کەوتمە جیهانی بیرکردنەوە. لە سەعات یەکی دوای نیوەڕۆدا لەگەڵ ماسوندا گەڕایەوە، بازووی بەستراو و دەمی پێچرابوو، پزیشکەکە پێی گوتبوو زۆر گرنگ نییە، بەڵام ڕایموند زۆر چاک نەبوو، ماسون هەوڵی دەدا بیخاتە پێکەنین بەڵام ئەو چ قسەیەکی نەدەکرد، کە ویستی بەرەو دەریاکە بڕوات لێم پرسی بۆ دەچیت بۆ کەنار. دەیگوت دەیەوێ کەمێک هەوای پاک و ئازاد هەڵمژی، ماسون و من پێشنیازمان کرد لە گەڵیدا بچین، بەڵام ئەو تووڕە بوو، سوور بوو لە سەر ئەوەی بەتەنیا بڕوات. ماسون ویستی بەرهەڵستی نەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر لەگەڵیدا چووم. ماوەیەک بەهێمنی پیاسەمان کرد، تینی هەتاو لەو ساتەدا گەرمتر بوو. بیرم دەکردەوە کە ڕایموند



مەبەستێکی تایبەتی هەیە، بەڵام نەمدەزانی مەبەستی چییە. لەم کاتەدا لە کۆتایی کەنارەکەوە گەیشتینە جێیەک کە کانییەک لە پشت گابەردێکەوە هەڵدەقوڵا. ئەو دوو کابرا عەرەبە لەوێ بوون و بەهەمان جلوبەرگی شین باویانەوە لە پەنای یەکدیدا ڕاکشابوون. کاتێ ئێمە گەیشتینە ئەوێ بەهیچ کلۆجێ نەگۆڕان. ئەو کابرایەی چەقۆکەی لە ڕایموند دابوو بێ ئەوەی قسەیەک بکات سەیری دەکرد، ئەوەی دی بەخەیاڵی ئاسوودەوە شمشاڵێکی بەدەستەوە گرتبوو، بەدەم ژەنینەوە گۆشەی چاوی بڕیبووە ئێمە.

ئاگام لێ بوو ئەوەی کە سەرگەرمی شمشاڵ ژەنین بوو بەئەسپایی لاقەکانی لێک جیا دەکردەوە وەک کەسێک بیەوێ خۆی ئامادە بکات. ڕایموند گوتی هەر ئێستا دەیکەم بەقوربانی گوللەیەک، بیرم کردەوە ئەگەر بڵێم نە شێتگیرتر دەبێ و تەقەی لێ دەکات. ناچار پێم گوت ئەو هێشتا چ قسەیەکی لەگەڵ نەکردوویت، چاک نییە کەسێک بەرگری لە خۆی نەکات و بێتە کوشتن. ڕایموند گوتی زۆر چاکە جوێنی پێ دەدەم، ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەوا دەیکوژم.

رایموند وررده وردە گەرم بوو، کابرای عەرەب هەر بەو دەقەوە خەریکی شمشاڵ ژەنینی خۆی بوو. هەردووکیان بەوردی چاودێری بچووکترین جووڵەی ڕایموند بوون. گوتم نەخێر تۆ دەمانچەکەت بدە بەمن و بچۆ زۆرانی لەگەڵدا بگرە، ئەگەر ئەوی تر ویستی چەقۆکەی بەکار بێنی ئەوا من دەیکوژم، کە دەمانچەکەم لێی وەرگرت، دوو عەرەبەکە بەئاستەم بزوان، ئێمەش وەک ئەوەی هیچ شتێ نەبووبێ بێ جووڵە وێستاین. بێدەنگی باڵی بەسەر هەمووماندا کێشابوو، کەسمان جووڵەمان نەدەکرد، بەڵام گشتمان چاوەڕێی حەرەکەتی یەکدی بووین، هەموو هەر لە بیری ئەوەدا بووین کە دەبێ چ بکرێ. لە تەقەکردن دوودڵ بووم.

لەپڕ دوو عەرەبەکە خۆیان لە پەنای تاوێرێکدا حەشار دا، من و ڕایمونديش ڕێ و ڕێ گەڕاینەوە، ڕایموند تا ڕادەیەک چاکتر بوو بوو، گەیاندمەوە بەر کابینەکە. لەو دەمەدا کە ئەو بەپەیژەکەدا سەردەکەوت من لە هەمان جێدا وێستا بووم، هەستم دەکرد ناتوانم بەپەیژەکەدا سەربکەوم، بەڵام تینی هەتاوەکەش هێند گەرم بوو کە نەم دەتوانی لە هەمان جێدا بەو دەقەوە لەژێر تینی هەتاوەکە بمێنم. ئەگەر لەوێ مابام یان سەرکەوتبام بۆ من چ جیاوازییەکی نەبوو، بەهەر حاڵ هەستی نارەحەتی دەروونم سات بەسات پتر دەبوو، دوای تۆزێک گەڕامەوە و لە کەنارەکەدا دەستم بەپیاسە کرد، گەرماکە بەردەوام بوو، ئاوی دەریاکە لەژێر تیشکی هەتاوەکەدا هاتبووە جۆش. بەئەسپایی بەرەو تاشەبەردێک چووم، هەستم دەکرد نێوچەوانم ئاوساوە، گەرماکە وەکو بارێکی قورس کەوتبووە سەرشانم و هەنگاوەکانی قورس کردبووم، کە گڕەی گەرماکە بەر دەموچاوم دەکەوت لە تاوا لێوم دەکرۆشت و هەوڵم دەدا خۆم ڕابگرم و و مەستی و بێ حاڵی لە خۆم دوور بخەمەوە. گڕەی گەرماکە وەکو گوێزان دەی بڕیم، بەم حاڵەوە درێژەم بەڕێگاکەی خۆم دەدا. لە دوورەوە تاشە بەردێکی ڕەشم بەدی کرد کە لە نێوان تیشکی هەتاو و تەمی دەریاکەوە دەبریسکایەوە. کەوتمە بیرکردنەوە لە کانی پشت تاشە بەردەکە، ئارەزووی بیستنی خوڕەی ئەو ئاوەم کرد. و لە هەتاو دەرباز ببم، کە نزیک بوومەوە لە دوورەوە ئەو کابرا عەرەبەم بینی، بەتەنێ بوو و لە سەر پشت ڕاکشا بوو، دەستەکانی خستبووە ژێر سەری و سەری خستبووە بەر سێبەری درەختەکان، جلەکانی لە بەر

تیشکی هەتاوەکەدا دەبریسکایەوە، سەرم لە دیتنی سوڕما، وام دەزانی شەڕەکە تەواو بووە، تەنیا بەمەبەستی پیاسە بۆ ئەوێ چوو بووم، هەر کە چاوی بەمن کەوت، هەستا. دەستی خستە گیرفانی، منیش هەمان کارم کرد، دەستم بەسەر دەمانچەکەی ڕاپموندا هێنا. هێشتا لە گیرفانمدا بوو.

وەکو جاری پێشوو دوو جاران بەرەو دوا کشایەوە، بەڵام دەستی هەر لە گیرفانیدا بوو. من لەوەوە دوور بووم، دە مەترێکمان نێوان بوو، سەیری چاوەکانیم کرد، بینیم پێڵوەکانی بەیەکدا دەدا، سەدای شەپۆڵەکان بەچاکی دەبیسترا، هەمان هەتاو هەمان تیشکی ڕووی چەو و لمە گەرمەکان لە جۆشدا بوو. لە ئاسۆوە تەمێکی چڕ لە بەرزبوونەوەدا بوو. پەڵەیەکی ڕەش کەوتە بەرچاوم. بۆیە نەموێرا بۆ نیونەخت چاو لە کابرای عەرەب بگوێزمەوە. بیرم دەکردەوە کە بەکەمترین جوولە دەستی دەگەیەنێتە چەقۆکە و کار لەکار دەترازێ، چونکە تاوی هەتاوەکە تینی بۆ دەهێنام ناچار هەنگاوێکم بەرەو کانییەکە نا... کابرای عەرەب لە جێی خۆی نەجوولا بوو، ئەو سێبەرەی کە لە ڕووی دەدا حاڵەتێکی پێکەنیناوی پێ دابوو، دیسان چاوەڕوانم کرد. تاوی هەتاوەکە بەگۆناکانمەوە دەچزا. هەستم دەکرد دڵۆپە ئارەقە بەسەر برۆکانمدا دەچۆڕایەوە، گەرمی هەتاوەکە وەک ئەو ڕۆژە بوو کە دایکم تێدا ناشت. وەکو ئەو ڕۆژە تەوێڵم دەیەشا. هەموو دەمارەکانی لەشم کەوتبوونە پلدان. بەهۆی ئەم گەرمایەوە ناچار بەرەو پێشەوە جوولام، ئەمەیان گەوجێتی بوو کە لەبەر ئەو هەتاوەدا وێستابووم و خۆم ڕزگار نەدەکرد، بەم حاڵەوە تاقە هەنگاوێک چوومە پێشەوە، ئەم جارەیان عەرەبەکە بێ ئەوەی لە جێی خۆی ببزوێ چەقۆکەی دەرهێنا و بەبەرچاوی منەوە دایە بەر تیشکی هەتاوەکە... هەتاوەکە شێوەیەکی ئەوتۆی بەچەقۆ ڕووتەکە دەدا کە کاری کردە سەر مێشکم، لەم کاتەدا ئەو ئارەقەیەی کە لەسەر برۆکانم کۆ بوو بووەوە هاتە خوارێ و سێبەری خستە سەر برژانگەکانم، ئەم پەردەیە بینایی تاریک کردم، چەقۆ ڕووتەکەی لەبەرچاوم گەورەتر کرد. ئەم چەقۆ بریقەدارە وەک ئەوە بوو برژانگەکانم ببڕێ و لە قووڵایی چاوەکانم بچەقێت، لەم کاتەدا بوو هەموو شتەکان لەبەرچاوم وێنەیەکی تری گرتە خۆ، گڕەیەکی گەرم لە دەریاوە هەڵی کرد. وام دەزانی کە ئاسمان لە باڵیەک ترازاوە و وەکو بارانی ئاگر بەسەر سەر و ڕووما دەڕژێ، ئازای بەدەنم کرایەوە، دەسکی دەمانچەکەم گوشی، زامنەکەی کرایەوە. بەتوندی دەسکەکەیم دەگوشی، نەمزانی چی بوو، ئارەقە، باران ئاسا بەسەر و ڕووما دەڕژا، لەگەڵ یەکەم تەقەدا هاوسەنگی هەوا و ئەو بێدەنگییەی کە ئەوێی داگیر کردبوو سەنگە لا بوو. چوار تەقەی تریم کرد، گوللەکان یەک یەک  لە لەشی ئەودا، کە بەبێ جووڵە و بێ گیان کەوتبوو، گیرسانەوە. دەتگوت چوار گوللەی بانەوبانی یەک لە دەرگای کلۆڵی و بەدبەختییان دا و عالەمێکیان ژێر و ژوور کرد.



## بەشی دووەم

### ١

دوای گرتنم، دەستبەجێ چوار جاریان لێ پرسیمەوە، بەڵام پرسینەوەکان لە مەڕ ناسنامەکەم بوو، زۆری درێژە نەکێشا، هەوەڵ جار لە پۆلیسخانەدا وەزعم زۆر سەرنجڕاکێش و گرنگ نەبوو، دوای هەشت ڕۆژ بەپێچەوانەوە، قازی بەچاوی پشکنینەوە تێی ڕوانیم، بەڵام لە سەرەتادا تەنیا پرسیاری ناو و ئەدەرس و بەرواری لە دایکبوونمی کرد. دوایی ویستی بزانێت ئاخۆ ئەوقاتی بەرگریم بۆ خۆ دیاری کردووە یان نا، گوتم نەخێر، ئیدی پرسیم ئاخۆ دیاریکردنی ئەوقاتی بەرگری پێویستە... مەسەلەکەم، بەخەیاڵی خۆم هێندە سادەیە کە پێویست بەم شتانە ناکات... بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: ئەمە ڕای خۆتە، بەڵام لێرەدا یاسا هەیە و ئەگەر بەخۆت ئەوقاتێک دیاری نەکەیت، بەخۆمان ئەوقاتت بۆ دیاری دەکەین.

وام بەچاک زانی کە دەزگای داوەری بەخۆی ئەم ئەرکە لە عۆدە بگرێ... ئەمەم پێی گوت. ئەویش سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاندم و گوتی یاسا بەچاکی دروست کراوە.

شتەکەم زۆر بەگرنگی وەرنەگرت، قازی لە ژوورێکی ڕازاوەدا پێشوازی کردم، گلۆپێک مێزەکەی ڕووناک دەکردەوە، من کە بەرانبەری دانیشتبووم کەوتبوومە بەر ڕووناکییەکە و ئەویش لە تاریکییەکەدا بوو، من ئەم بابەتەم لە کتێباندا بەرچاو کەوتبوو، دوای ئەوەی پرس و جۆیەکەم تەواو بوو، تەماشام کرد پیاوێکی میهرەبان هاتە بەرچاو، چاوەکانی شین و بەقووڵا چوو، باڵا بەرز، سمێڵی زەرد و سەری ماش و برنج بوو، پیاوێکی بەهۆش و تێگەیشتوو دەهاتە بەرچاو، هەرچەند هەندێ جار تووڕە دەبوو، بەڵام لەسەرخۆ و نەرم و ئارام بوو، وەختی ڕۆیشتن ویستم تەوقەی لەگەڵدا بکەم، بەڵام چونکە بیرم کەوتەوە کە بەم دەستە مرۆڤم کوشتووە ژیوان بوومەوە.

بۆ سبەینێ ئەوقاتێک هاتە زیندان بۆ دیدەنیم، کابرایەکی کورتە باڵای قەڵەوی گەنج بوو، قژی بەڕێکی شانەکرابوو، هەرچەند هەوا گەرم بوو، بەڵام جلوبەرگێکی تاریکی لەبەر بوو، یەخەکەی کرابۆوە، بۆینباخێکی سەیری میل میلی لە مل بوو، گوڵی سوور بەسەر تەختەکەیەوە بوو. جانتاکەی لەسەر تەختەکە دانا، دوای خۆ ناساندن پێی گوتم کە فایلەکەمی موتالا کردووە. مەسەلەکەم زۆر ورد بوو، بەڵام ئومێدی زۆری بەسەرکەوتن هەبوو... ئەگەر من یارمەتی بدەم... سوپاسیم کرد. پێی گوتم با هەنووکە بچینە سەر بابەتە سەرەکییەکە، لە قەراخ تەختەکەم دانیشت، لە سەرەتادا دەبێ بزانی کە زۆر شت دەربارەی ژیانی تایبەتیت کۆ کراوەتەوە و زانراوە. زانیویانە کە زۆر نییە دایکم لە داڵدەی کەنەفتەکاندا مردووە و لە مارنگۆدا پرس و جۆ کراوە و ئەوانە گەواهیان داوە کە من لە مەرگی دایکمدا چ هەستێکی ناخۆشی وام نەبووە. ئەوقاتەکەم گوتی: هەرچەند ئەم پرسیارانە کەمێک نارەحەتم دەکات، بەڵام پێویستە بیزانم، ئەگەر بەدروستی وەڵامم نەدەیتەوە، مەسەلەی بەرگریکردن تۆزێک زەحمەت دەبێ. دەیویست لەم کارەدا کۆمەکی پێ بکەم، لێی پرسیم ئاخۆ لەو ڕۆژەدا نارەحەتی فکریم هەبووە. ئەم پرسیارە مایەی

سەرسوڕمانم بوو. وام دەهاتە خەیاڵ کە ئەگەر منیش ئەم پرسیارەم کردبا ناڕەحەت دەبووم، بەهەر حاڵ وەڵامم دایەوە کە لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژە زۆر لەسەرخۆ نەبووم و خۆم نەناسی، بێگومان من دایکم خۆش دەویست. بەڵام خۆشەویستی من بەڵگەی هیچ شێتک نەبوو، هەموو خەڵکانی سەر زەوی چاوەڕوانی مەرگی خۆشەویستانی خۆیانن لێرەدا ئەوقاتەکەم قسەکەی پێ بڕیم، ناڕەحەت بووبوو، پێی دەگوتم کە ئەم قسەیە لە هیچ جێیەک نەکەم و تەنانەت نابێ لای قازیش ئەم قسەیە بکەمەوە. پێم گوت من عادەتێکم هەیە کە هەندێ جاران ماندوویەتی کار دەکاتە سەر سۆز و هەستم. ئەو ڕۆژەی دایکم نێژرا. زۆر شەکەت و خەواڵوو بووم بەڕادەیەک ئاگام لە هیچ کەین و بەینێ نەبوو، تاقە شتێ کە دەتوانم بیلێم ئەوەیە خۆزێ دایکم نەدەمرد. پێ نەدەچوو ئەوقاتەکەم بەم قسانە خۆشحاڵ بێ و دەیگوت هێندە بەس نییە و پێویستە شتی دی بڵێی.

کەمێک بیری کردەوە و لێی پرسیم ئاخۆ لەو ڕۆژەدا حاڵەتێکی وەهام هەبوو کە نەتوانم کۆنترۆڵی هەستی خۆم بکەم، وەڵامم دایەوە نەخێر ئەم بۆچوونە ڕاست نییە.

بەناڕەحەتییەوە گوتی: بەهەر حاڵ سەرەک داڵدە وەکو شایەتێک بانگ دەکرێ و ئەم مەسەلەیە لەسەر من قورس دەکەوێتەوە، پێم گوت ئەگەر واش بێ ئەم مەسەلەیە پێوەندییەکی ئەوتۆی بەمەسەلەکەی منەوە نییە، بەپێکەنینەوە گوتی ڕاستە، بەڵام وا دیارە تۆ تاکو ئێستا دەزگای عەدالەتت نەدیوە، بچووکترین ڕووداوی ژیانی تاوانبار بایەخی خۆی هەیە.

بەتوڕەییەوە بەجێی هێشتم، ویستم ڕای بگرم و ئاگاداری بکەمەوە. نەک بۆ ئەوەی بەچاکی بەرگریم لێ بکات بەڵکو بۆ ئەوەی خەراپ لێم تێ نەگات و بەمرۆڤێکی بەد و ئاڵۆزم لە قەڵەم نەدا، هەستم دەکرد کەمێک لە قسەکانم ڕەنجا بوو، ویستم پێی بڵێم کە منیش وەکو هەموو خەڵکانی دیم و چ جیاوازییەکم لەوان نییە، هەستم کرد بێ سوودە، ئیتر تەمەڵیم کرد و دەستبەرداری بووم.

دوای چەند ڕۆژێک دیسان بۆ نووسینگەکەی قازی گاز کرامەوە. سەعات دووی دوای نیوەڕۆ بوو، ئەمجارەیان بەپێچەوانەی جاری پێشوو، ژوورەکەی ڕووناک و پەردەکانی درابوونە لاوە. هەوا گەرم بوو، داینام و ڕێزێکی زۆری گرتم و گوتی ئەوقاتەکەم لەبەر هەندێ گرفتاری تایبەتی نەیتوانیوە ئامادە بێت و منیش هەقم هەیە وەڵامی پرسیارەکانی ئەو نەدەمەوە چاوەڕێی هاتنی بکەم، گوتم بەپێچەوانەوە ئامادەم هەر خۆم وەڵام بدەمەوە پەنجەی بەزەنگی سەرمێزەکەیەوە نا. دەمودەست کابرایەکی گەنج، کە پێ دەچوو سکرتێری بێ، هاتە ژوورەوە و ڕێزی نواند، لە تەک منەوە لەسەر کورسییەک دانیشت، پرسوجۆ «تحقیق» دەستی پێ کرد. سەرەتا سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشام کە من مرۆڤێکی کەم دوو، و بێدەنگ و ئاڵۆزم. دەیویست ڕوونکردنەوەیەک لەم بارەیەوە بخەمە بەردەست، وەڵامی من ئەمەبوو، چونکە شتێکی گرنگ لە مندا نییە و قسەیەکی زۆرم پێ نییە، ئیدی ناچارم بێدەنگ و کەم دوو بم.

وەکو جاری پێشوو بزەیەکی کرد کە نیشانەی ڕازیبوونی بوو، گوتی ڕاستە ئەم شتە زۆر گرنگ نییە.

بێدەنگ بوو، ماوەیەک تێی ڕوانیم... ڕاستەوخۆ گوتی: من تەنیا تۆم بەلاوە مەبەستە، هەڵبەتە حاڵی نەبووم کە مەبەستی لەم ڕستەیە چییە، بۆیە چ وەڵامێکم نەدایەوە و دەیگوت: هەندێ خاڵی تاریک لە



مەسەلەکەدا هەن و ئومێدەوارم کە یارمەتیم بدەیت لە ڕوونکردنەوەیاندا، گوتم هەموو شتەکان سادە و بێ پەردەن. ئیدی ناچاری کردم کە ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژەی بۆ بگێڕمەوە.

رایموند، کەناری دەریا، دەریا و مەلەوانی، شەڕ، کانییەکە، گەرمی هەتاو پێنج گوللەکە لەو مەسەلانە بوون کە بۆم ڕوون کردنەوە. لەگەڵ هەر ڕستەیەکدا دەیگوت، چاکە. چاکە.

کە گەیشتینە کۆتایی ئەوانە، سەری ڕەزامەندی بۆ ڕوونکردنەوەکانم لەقاند، منیش لە ئاخافتن بێ تاقەت بووم و بیرم نەدەهات کە لە ژیانمدا ئەوەندەم قسە کردبێت.

دوای بێدەنگییەکی کەم هەستایە سەر پێ و پێی گوتم کە دەیەوێت یارمەتیم بدات. چونکە خۆشی دەوێم و بەپشتیوانی خوا شتێکم بۆ دەکات، بەڵام لە سەرەتادا دەیویست چەند پرسیارێکی دی بکات. بێ پێشەکی و کوتوپڕ پرسی ئاخۆ دایکم خۆش دەویست، وەڵامم دایەوە بەڵێ وەکو گشت خەڵکێک. سکرتێرەکەی، کە تا ئەو کاتە قسەکانی ئێمەی تایپ دەکرد، ناچار بوو سووکە هەڵوەستەیەکی بۆ بکات.

ئەوجا لێی پرسیم ئایا ئەو پێنج گوللەیەم دوا بەدوای یەک تەقاند.

کەمێک بیرم کردەوە، ئەوجا وەڵامم دایەوە دوای ئەوەی یەکەم گوللەم تەقاند، دوای تۆزێک چوارەکەی ترم بانە و بانی یەکدی تەقاند، پرسی بۆ ماوەت خستە نێوان یەکەم گوللە و ئەوانی ترەوە، جارێکی دی کەناری دەریام هاتەوە بەرچاو. هەستم کرد تەوێڵم لە گەرمادا داغ بووە، بۆیە نەمتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە. لە ماوەی ئەو بێدەنگییەی کە کەوتە نێوانمانەوە، قازییەکە ناڕەحەت دەهاتە بەرچاو.

لە جێییەکەی خۆی دانیشتەوە، دەستی خستە نێو قژەکەی. ئانیشکەکانی لەسەر مێزەکەدا دا... بەشێوەیەکی سەیر پرسی: باشە بۆ تەقەت لە جەستەیەکی ڕاکشاو کرد.

دیسان نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە.

قازییەکە دەستی بەتەوێڵیدا هێنا و پرسیاری کردەوە و گوتی: بۆ؟ پێویستە هۆی ئەوە بڵێی.

بەهەمان شێوە بێدەنگ بووم. لەپڕ لە جێی خۆی هەستا. چەند هەنگاوێکی بەژوورەکەدا نا. چەکمەجەی مێزەکەی کردەوە و خاچێکی دەرهێنا. کە بەرەو لای من گەڕایەوە، خاچەکەی لە ئاستی مندا ڕاگرت و گوتی: ئەمە دەناسیت؟

– بەڵێ... هەڵبەتە.

ئیدی بەگەرمییەوە ئەوەی دەرخست کە هەر کەسێک باوەڕی بەخوا بێ، هێندە گوناحکار نییە کە خوا نەیبەخشێت، بەڵام ئادەمیزاد دەبێ لە حاڵەتی پەشیمانیدا وەکو منداڵێک بێ و بەگیانی پاکەوە هەموو شتێ پەسەند بکات و وەربگرێ.

لەم کاتەدا بەتەواوی بەسەر مندا نوشتابووەوە و خاچەکەی بەسەر سەرمەوە ڕاگرتبوو، لە ڕاستیدا من مەبەستیم نەدەزانی و هیچی لێ حاڵی نەدەبووم. چونکە هەوای ئەوێ گەرم بوو، مێش پەیتا پەیتا دەموچاوی بەسەر دەکردمەوە، جگەلەوەی کە هەستم بەترسیش دەکرد، بۆیە ئەوەی کە دەمبیست بەلامەوە گاڵتەبازاڕ بوو. وێڕای هەموو ئەمانەش من تاوانبار بووم و پیاوم کوشتبوو.

ئەوەم زانیبوو کە تەنیا یەک خاڵی تاریک و نادیار لە مەسەلەکەی مندا هەبوو، ئەوەش ئەوەبوو بۆ دوای یەکەم گوللە، گوللەکانی دیم تەقاند، بەڵام ئەمە چ پێوەندییەکی بەئەسڵی مەسەلەکەوە هەیە.

دەمویست بڵێم کە بێهوودە پێ لەسەر ئەم خاڵە دادەگرێ و ئەم خاڵە ئەوەندەش بەبایەخ نییە، بەڵام ئەو قسەکەی پێ بڕیم و بەهەمان سووربوونەوە دەیپرسی: ئایا بەڕاستی باوەڕم بەخوا هەیە، وەڵامم دایەوە: نەخێر.

بە تووڕەییەوە لە جێیەکەی خۆی دانیشتەوە و گوتی ناشێت، هەرگیز ئەمە ناشێت و نابێ، گشت خەڵکی باوەڕیان بەخوا هەیە، تەنانەت ئەو کەسانەی کە خواش ڕووی لێ وەرگێڕاون هەر خوا دەناسن. ئەمە باوەڕی ئەو بوو، بۆیە دەیگوت ئەگەر کەسێک باوەڕی بەخوا نەبێ و گومان لە بوونی بکا ژیانی بێ مانا دەبێت، گوتی ئایا دەتەوێ ژیانت بێ مانا بێ، گوتم نازانم ئەگەر واش بێ چ پێوەندییەکی بەمنەوە هەیە.

دیسان لە پشت مێزەکەیەوە خاچەکەی بەرەو لای من درێژ کرد و گوتی: من بابایەکی مەسیحیم، ئەگەر گوناحێکت کردبێ لە خاوەنی ئەم خاچە دەپاڕێمەوە کە بت بەخشێت. چۆن دەبێ نەزانیت کە مەسیح لە پێناوی تۆدا ڕەنجی کێشاوە.

هەستم دەکرد کە بووین بەئاشنا. لێ ئیدی لەم گاڵتەبازارە بێزار بوو بووم، گەرمای ژوورەکە دەیقە بەدەیقە زێدەتر دەبوو، وەکو عادەتی هەمیشەییم کە بموێ لە دەست کەسێک ڕزگار بم گوێی لێ ناگرم، گوێم نەدایە. هەوڵم دا ئەمجارەش بەهەر شێوەیەک بووە خۆم ڕزگار بکەم. ئەو دەیگوت: بینیت قسەکەم ڕاستە، ئێوە باوەڕتان بەخوا هەیە بۆیە دەبێ پشت بەمن ببەستی، جارێکی دی گوتم نەخێر باوەڕم پێی نییە. کە ئەم قسەیەی بیست جارێکی دی خۆی دایەوە بەکۆڵی کورسییەکەدا، شەکەت و ماندوو دیار بوو، لەو ماوەیەدا کە تایپەکە بەو خێراییە قسەکانی ئێمەی چاپ دەکرد، کەمێکی دی بێدەنگ بوو، ئەوجا نیگایەکی قۆڵی تێ بڕیم و بەغەمگینییەوە گوتی: من هەرگیز خەڵکی وەک تۆ سەرسەختم نەدیوە، تەواوی ئەو تاوانبارانەی کە هاتوونەتە بەر ئەم مێزە کەوتوونەتە گریان، کەچی تۆ...

ویستم وەڵامی بدەمەوە کە ئەوە لەبەر ئەوە بووە کە بەڕاستی تاوانبار بوون، بەڵام بیرم کردەوە کە منیش وەکو ئەوانم، ئەم بیرە هەمیشە مێشکی دەگوشیم و خۆم بەگوناحکار دەزانی.

قازی لە جێی خۆی هەستا، پێ دەچوو پرسوجۆ تەواو بووبێ، بەڵام بەهەمان سیمای شەکەتەوە لێی پرسیم ئایا ژیوان نیم، دوای تۆزێ بیرکردنەوە گوتم پەشیمان! لەبری پەشیمانی زۆر ناڕەحەت و نیگەرانم.

هەستم کرد لێم تێ نەگەیی، بەڵام ئەو ڕۆژە ئیدی ماوەی ئەوە بەدەستەوە نەما کە لەوە پتر مەسەلەکە یەکالا بکەمەوە.

لەو ڕۆژە بەدواوە گەلێک جاران ئەو قازییەم دیت، بەڵام هەموو جارێ من لەگەڵ ئەوقاتەکەمدا بووم، هەوڵیان دەدا ڕوونکردنەوەی پتر بخەمە سەر قسەکانی پێشووم، تەنانەت قازییەکە و ئەوقاتەکە ئەوەیان کردبوو بەخەم کە ڕێگایەک بۆ ڕزگاربوونم بدۆزنەوە.



مەسەلەکە ئاوەڕۆ و ڕەوتی خۆی وەرگرت، شێوەی پرسوجۆ گۆڕانی بەسەرداهات، وێ دەچوو کە ئیدی قازییەکە چ بایەخێکم پێ نادات و بەئارەزووی خۆی فایلەکەمی ڕێک خستووە، ئیدی چ قسەیەکی دی لە مەڕ باوەڕبوون بەخوای لەگەڵا نەکردم، ئەو هەڵچوون و سوور بوونەوەی ڕۆژانی هەوەڵی نەما، بۆیە ئیدی یەکتربینیمان لایەنێکی ڕەسمی گرتە خۆ، دوای چەند پرسیار و گفتوگۆیەک، موحاکەمەکەم ڕەوتی ئاسایی خۆی وەرگرت.

هەندێک جاران کە قسەکان عادەتی و گشتی بوایەن، منیشیان بەشدار دەکرد، تا ڕادەیەک ڕەحەت بووم و کەسیان ڕەفتاریان لەگەڵما خراپ نەبوو، گفتوگۆکان زۆر ئاسایی بوون، هێندە هێدی و ئارام ڕەفتاریان لە تەکما دەکرد دەتگوت بووم بەیەکێک لە خۆیان.

لە ماوەی یانزدە مانگی ئەم موحاکەمەیەدا، دەتوانم بڵێم لە ژیانمدا چ ساتێکی شیرینتر لەو ڕۆژانەم نەبینی کە دۆستانە لەگەڵ قازیدا قسەم دەکرد و بەمیهرەبانییەوە دەستی دەخستە سەر شانم و دەیگوت:

– ئەمڕۆ بەسە.

ئیدی بەپۆلیسەکانیان دەسپاردم.

## ٢

دەربارەی هێندێ مەسەلەی دی تا ئێستا هیچم نەگوتووە، کاتێ کە چوومە زیندانەوە، دوای چەند ڕۆژێک زانیم کە نابێت باسی هەندێ تایبەتمەندی ژیانی خۆم بکەم.

ئیدی مەسەلەکان چ بایەخێکیان لەلام نەما و بەدبینیم بەرانبەر بەمەسەلەکان کەمتر بوو، لە ڕاستیدا ڕۆژانی هەوەڵ وەها بوو کە خۆم بەزیندانی نەدەزانی، بەتایبەتی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆژانە هێندە کەم بوو پێویست بەگێڕانەوە و باسکردن ناکات، بەڵام دوای یەکەم دیدەنی ماری، مەسەلەی ژیان لەلای من شێوەیەکی نوێی وەرگرت. ماری دەیگوت مۆڵەتی نادەن بێتە دیدەنیم، چونکە بەڕەسمی شووی پێ نەکردبووم. بەهەر حاڵ لەو ڕۆژەدا بوو کە هەستم کرد ژیانم لێرەدا وەستاوە. ڕۆژی یەکەم خستمیانە ژوورێکەوە کە چەند زیندانییەکی دی تێدا بوو، زۆربەیان عەرەب بوون.

کە منیان بینی پێکەنین، ئەوجا پرسیاریان لێ کردم کە چ گوناحێکم کردووە، پێم گوتن عەرەبێکم کوشتووە. کە ئەمەیان بیست بێدەنگ بوون.

شەو هات، باس باسی ئەوەبوو ئەو پارچە حەسیرەی کە دەبوو لەسەری بنووین چۆنی بەش بکەین، بەدرێژایی ئەو شەوە مێش و مێشوولە دەموچاویان دەکێلام. دوای چەند ڕۆژێک بردمیانە ژوورێکی تەنیا، شرە چەرپایەکی تێدا بوو، و لەسەری دەنووستم، ژوورێکی بچکۆلەی بەتەنیشتەوە بوو بەناو ئاودەست بوو، زیندانەکە کەوتبووە سەر گردۆڵکەیەکەوە، دەمتوانی لە پەنجەرە بچووکەکەوە تەماشای دەریا بکەم.

ڕۆژێک لەبەر پەنجەرەکەدا وێستا بووم، گاردیانەکە هاتە ژوورەوە و پێی گوتم یەکێک هاتۆتە

دیدەنیت. لە دڵی خۆمدا گوتم دەبێ ماری بێ، هەرواش بوو، خۆی بوو. ڕاڕەوێکم بڕی تا بگەمە هۆڵی دیدەنی ئەوجا لە قاڵدرمەیەکەوە دابەزیم و چوومە سەر ڕاڕەوێکی دی. ئەوێ هۆڵێکی گەورە و ڕووناک بوو، هۆڵەکە کرابوو بەسێ بەشەوە. مەودای نێوان زیندانی و میوانەکان یازدە میترێک دەبوو. ماریم بەهەمان کراس و دەمی بەپێکەنینەوە بینی، دە، دوازدە زیندانیم بەدەورەوە بوون، زۆربەیان عەرەب بوون. «ماری»ش کەوتبووە نێوان چەند گاردیانێک و میوانەکانەوە. لە نێو میوانەکاندا دوو ژنم بینی، یەکێکیان پیر و لێو هەڵقرچاو ڕەشپۆش بوو، ئەوی تریان قەڵەوێک بوو کە بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد. چونکە مەودای نێوان زیندانییەکان و میوانەکان زۆر بوو، ناچار دەبوون بەدەنگی بەرز قسە بکەن، کە چوومە ژوورەوە غەڵبە غەڵب و دەنگدانەوەی هاتوهاواری خەڵکەکە و تیشکە بەهێزەکەی نێو هۆڵەکە تووشی سەرەگێژکەیان کردم.

ژوورەکەی من کپ و تاریک بوو، بەڵام ئێرە تەواو پێچەوانە بوو، بۆیە پێویستم بەچەند دەقیقەیەک هەبوو تا بتوانم لەگەڵ ئێرەدا ڕابێم، بەهەرحاڵ توانیم شتەکان لێک جیا بکەمەوە، گاردیانێکم بینی کە لە پاینی ڕاڕەوەکەدا دانیشتبوو، زیندانییە عەرەبەکان خۆیان بەسەر شیشەکاندا دابوو، و لەگەڵ میوان و کەسوکارەکانیاندا قسەیان دەکرد، لەگەڵ ئەو هەموو غەڵبە غەڵبەدا زیندانییە عەرەبەکان دەیانتوانی بێ ئەوەی دەنگ بەرز بکەنەوە قسە بکەن... بەدەم بەپیرەوە چوونی ماری تەواوی ئەم شتانەم بەسەرنجی نیگا سپارد. ماری خۆی بەشیشەکانەوە چەسپاندبوو، بزە دەیگرت، لەو کاتانەدا یەکجار جوان بوو بوو، بەڵام نەمتوانی ئەمەی بۆ دەرببڕم، بەدەنگی بەرز گوتی:

– دەنگت هەڵبڕە.

–ئەوەیە کە دەی بینی.

– باشیت

– زۆریش.

هەردووکمان بێدەنگ بووین، ماری هەر بەو دەقەوە پێدەکەنی. ژنە قەڵەوەکە بەدەنگی بەرز قسەی بۆ مێردەکەی دەکرد. مێردەکەی پیاوێکی بەخۆوە بوو... من لێرەدا هەندێ لە قسەکانیان دەگێڕمەوە.

ژنەکە هاواری دەکرد جاران ڕازی نەبوو بیبەی.

پیاوەکە گوتی: ڕاستە.

ژنەکە لەسەری ڕۆیی: پێم گوت کە دەرچوویت دەی بەیت، بەڵام ڕازی نەبوو بیبەی.

ماری بەدەنگی بەرز دەیگوت: ڕایموند سڵاوی لێ دەکردیت، سوپاسیم کرد. بەڵام دەنگی من لە نێو هاواری هاوسێکەمدا ون بوو.

ئەو دەیگوت: حاڵی چۆنە.

ژنەکە بەپێکەنینەوە گوتی: زۆر چاکە.

هاوسێکەی دەستەچەپم کە گەنجێکی قۆز بوو قسەی نەدەکرد. ئاگام لێ بوو کە بەرانبەر پیرێژنێک



وەستاوە و هەردووکیان بێدەنگ و نیگەرانن. بەڵام نەمتوانی زیاد سەرنجی بدەم، چونکە لەم کاتەدا ماری هاتە قسە و گوتی: پێویستە ئومێدت هەبێ، گوتم، بەڵێ، نائومێد نیم.

لە هەمان حاڵدا چاوی نەوسنم دەیویست لەژێر کراسەکەوە هەمووگیانی بخاتەبەر نیگای ئارەزوو، من هەمیشە ئارەزووی بەدەنیم دەکرد، بەڵام نەمدەزانی جگە لە بەدەنی دەبێ چاوەڕێی چی بم، بزەکانی ماری بۆ من لەزەت بەخش بوو، ڕەنگدانەوەی ناخی بوو، جگە لە بریسکەی ددانی و تیشکی چاوەکانی چی دیم نەدەبینی.

دیسان بەدەنگی بەرز گوتی: نیگەران مەبە، دەردەچیت و شاییەکەمان دەکەین.

بۆ ئەوەی شتێک بڵێم، گوتم تۆ بڵێی؟

بەدەنگی بەرز و ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵێ تەبرێ دەبیت و پێکەوە دەڕۆین بۆ دەریا.

ژنەکەی تەنیشتمان بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد: بیرت نەچێ، زەمیلە خواردنەکەم داوەتە دەست دەرگاوانەکە، خۆراکەکانی نێو زەمیلەکەی بۆ دەژمارد و دەیگوت: ئیدی خۆت بچۆ بەسۆراخییەوە چونکە پارەیەکی زۆرم پێ داوە، دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵبی عەرەبەکان گوێیان کەڕ دەکرد، تیشکی هەتاویش لە دەرێڕا تا دەهات بەهێزتر دەبوو.

کەمێک ناڕەحەت بووم، دەمویست زووتر بڕۆم، ئەم غەڵبە غەڵب و دەنگە دەنگە بوو بووە مایەی ناڕەحەتی و سەریەشە بۆ من، لەلایەکی ترەوە حەزم دەکرد پتر لەزەت لە هاتنی ماری وەربگرم. ماری بێ وچان باسی کارەکانی خۆی دەکرد و پێدەکەنی.

غەڵبە غەڵب، هات و هاوار، گفتوگۆی خەڵکەکە تێکەڵ بەیەکدی بوو بوون، تاقە جێیەک کە بێدەنگ و کپ بوو، ئەو جێیە بوو کە کوڕە گەنجەکە و پیرە دایکەکەی لێی ڕاوەستا بوون و بەبێدەنگی نیگایان دەگۆڕییەوە، وردە وردە عەرەبەکانیان بەرەو ژوورەکانی خۆیان وەپێش دان. یەکەم کەس کە چووە دەرێ، بووە مایەی بێدەنگبوونی هەمووان. ئەو پیرێژنە کورتە باڵایە لە شیشەکان نزیک بووەوە، لە هەمان کاتدا گاردیانێک لێیان نزیک بووەوە، کوڕەکە گوتی خواحافیز دایکە، دایکی لە نێوان شیشەکانەوە دەستی دوعاخوازی درێژ کردبوو.

لەو کاتەدا کە پیرێژنەکە دەچووە دەرێ، کابرایەک کە شەپقەکەی بەدەستەوە گرتبوو، داخڵ بوو.

زیندانییەکی دییان هێنایە ژوورێ، پێکەوە کەوتنە قسان، قسەکانیان زۆر بەئەسپایی بوو، چونکە هۆڵەکە چۆڵ بوو بوو.

هاتن بەلای ژنەکەی هاوسێمەوە، ژنەکە بێ ئەوەی دەنگی خۆی نزم بکات، وەک نەیزانیبێ غەڵبە غەڵبەکە کەم بووە بەدەم خواحافیزییەوە دەیگوت: ئاگات لە خۆت بێ، ئەوجا نۆرە هاتە سەر من، ماری بەئیشارەت ماچێکی تێ گرتم، بەر لەوەی ون بم ئاوڕم دایەوە، هێشتا ڕوومەتی بەشیشەکانەوە چەسپاند بوو، هەمان بزەی لە خاچدراو بەسەر لێوەکانییەوە سەمای دەکرد. ماوەیەک بەسەر ئەم دیدەنییەدا تێپەڕی. نامەیەکی بۆم نووسی، لەو ڕۆژەوە هەندێ گۆڕانم بەسەرداهات، ئەم گۆڕانە بەجۆرێ بوو کە نەم

دەتوانی بۆ کەسی بگێڕمەوە. بەهەر حاڵ نابێ زیادەڕۆیی بکەین و پێویستە بڵێم ڕەنگە ئەم گۆڕانە و ناڕەحەتییە بۆ من لە کەسانی دی هاسانتر بووبێ.

لە سەرەتای گرتنمدا ئەوەی پتر ئازاری دەدام، ئەوە بوو کە وەکو کەسێکی ئازاد بیرم دەکردەوە. بۆ وێنە حەزم دەکرد بچم بۆ کەنار دەریا. مەلە بکەم، ئەوەم بەبیرا نەدەهات کە دە زیندانێ دام، هەمیشە وام هەست دەکرد کە سەدای شەپۆلی دەریا دەژنەوم. گژوگیای کەناری دەریا لە ژێر پێمدا دەشنایەوە. تەنانەت هەستم بەساتە خۆشەکانی نێو دەریا دەکرد و گشت ئەمانە بەگشتی دەهاتنە بەرچاوم، لەپڕ چوار دیواری زیندان خەیاڵەکانمی باڵ دەکرد و لە پەلوپۆی دەخست.

ئەم حاڵە لە چەند مانگێک پتری نەخایاند. لەوە دوا ئیدی هەمیشە بیرم لە چوار دیواری زینداندا دەسووڕایەوە، هەموو ڕۆژێ چاوەڕێی پیاسەی ڕۆژانە بووم، ئەو ڕۆژانە پیاسەیەش زیاتر لەو کاتانەدا بوو کە ئەوقاتەکەم دەهاتە زیندان بۆ لام و پێکەوە لە گۆڕەپانەکەدا پیاسەمان دەکرد. پاشماوەی کاتەکانم بەرێکی دەگوزەراند. هەندێ جار بیرم دەکردەوە کە ئەگەر بخرامایەتە توێی توێکڵی درەختێکەوە کە دەم توانی تەماشای میوەکان بکەم و ئاسمان و ئەستێرە ببینم ڕەنگە زووتر ڕاهاتبام. ئەو کاتە دەمتوانی فڕین و تێپەڕبوونی باڵندەکان ببینم، لێکدان و تێکەڵبوونی هەورەکان لە بری بینینی گوڵی بۆینباخی ئەوقاتەکەم، کە هەموو ڕۆژێ دووبارە دەبووەوە تەماشا بکەم، بەڵام وەک جاران بوو کە لە عالەمێکی دیدا ژیانم دەگوزەراند و هەموو ڕۆژێ چاوەڕێی یەک شەممە بووم تا ماری بێتە دیدەنیم و لە باوەشی بگرم. بەڵام دۆغرییەکەی ئەمە بوو کە تەواوی ئەم شتانە ڕۆیین و لە دەستم چوون... هەرچیم بۆ بکەن، تا لێرەدا بم هەندێ جار هەر هەست بەکلۆڵی و بەدبەختی دەکەم.

هەندێ جاریش دایکم بیر دەکەوتەوە. چونکە ئەو باوەڕی وا بوو کە ئادەمیزاد لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕادێ و خووی پێوە دەگرێ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش بیر بڕی نەدەکرد. ڕۆژانی هەوەڵ زۆر بەسەختی و ناخۆشی تێپەڕی... پەریشان بووم. بۆ وێنە دەڵێم زۆرم تاسەی ژن دەکرد. ئەمە شتێکی ئاسایی بوو، چونکە گەنج بووم... وە نەبێ هەر بیر لە ماری بکەمەوە بەڵکو تەواوی ئەو کیژ و ژنانەی دیتبوومن و ئاشنایەتیم لەگەڵدا هەبوون و خۆشم ویستبوون یەک یەک دەهاتنەوە بەرچاوم، بەشێوەیەک دیوارەکانی ژوورەکەم پڕ بوون لەو یاد و یادگارانە، لەلایەکەوە ئەم بیرەوەریانە مێشکیان دەورووژاندم و لەلایەکی دیکەوە بۆ من چاک بوون، چونکە وەختەکەم لە تەکیاندا بەسەر دەبرد. لە ماوەیەکی کەمدا خۆشەویستی سەرۆک زیندانەکەم بۆ لای خۆم ڕاکێشا. هەموو ڕۆژێ لە گەڵ شاگرد ئاشپەزەکەدا دەهاتە لام، هەر خۆی لە ڕۆژەکانی هەوەڵەوە باسی ژنی کرد و پێی دەگوتم ئەمە تاقە شتێکە کە مایەی گلەیی و ناڕەزایی پیاوانە. پێم دەگوت منیش وەکو ئەوم و مەسەلەکە بەڕاستی وەردەگرم.

گوتی بەهەمان هۆ بوو کە ئێمەیان دە زیندانێ خستووە، پرسیم چۆن لەبەر هەمان هۆ بوو.

– بەڵێ ئازادی ئەم سوودانەی هەیە، لە ئازادی بێ بەشت دەکەن و تاقە شتێ کە تۆ دەڕەنجێنێ دوورییە لە ژنان. من هەرگیز بیرم لەمە نەکربووەوە، قسەکەیم سەلماند و گوتم، ڕاستیان گوتووە سزای ڕاستەقینە لێرەوە دەست پێ دەکات، گوتی: ئێستا تۆ دەرک بەمەسەلەکان دەکەیت، بەڵام خەڵکی لەم



شتانە تێ ناگەن و ناچار دەبن خۆیان ڕابێنن. دوای ئەم قسەیە سەرۆک زیندانەکە چووە دەرێ و ڕۆیی.

جگەرەش مەسەلەیەکی تری زیندان بوو، وەختێ کە خزامە زیندانەوە، پشتێنەکە و قەیتانی قۆندەرەکانم و بۆینباخەکەم و چیترم لە گیرفاندا بوو لێیان سەندم، بەتایبەتی جگەرەکانم، تکام لێ کردن کە جگەرەکانم بدەنەوە، کەچی گوتیان قەدەغەیە، ڕۆژانی هەوەڵم بەسەختی لێ بەسەرچوون، ڕەنگە ئەمەیان لە هەموو شتەکان بۆ من سەختتر بووبێ، لە تاوا وردە دارم لە قەرەوێڵەکەم دەشکاند و دەمجوو، ڕۆژ تا ئێوارێ وەکو ژنی سەر کاستە هاتوچۆم دەکرد. نەم دەزانی بۆ ئەم شتانەی کە زیانیان بۆ کەس نییە لێمی قەدەغە دەکەن، دوایی حاڵی بووم کە ئەمەش جۆرە سزایەک بوو، بەڵام دوای ماوەیەک لەگەڵ جگەرە نەکێشانیشدا ڕاهاتم و کارێکی ئەوتۆی بەسەرمەوە نەما.

جگە لەم ناڕەحەتیانە، زۆر خۆم بەکلۆڵ و بەدبەخت نەدەزانی، ئەوەی مابووەوە گوزەراندنی وەخت بوو، ئیدی خووم بەوەوە گرت کە بەهیچ شتێ نیگەران و ناڕەحەت نەبم، هەندێ جار بیرم لە ژووەکەم دەکردەوە بەخەیاڵ لە سووچێکەوە بۆ سووچێکی دی دەچووم، چیم هاتبا ڕێ دەم ژمارد. لە سەرەتادا ئەمە زوو بەسەرچوو، بەڵام هەر جارێ کە لە سەرەوە دەستم پێ دەکردەوە وەختەکە درێژتر دەبووەوە، ئیدی کەوتمە ژماردن و بەسەرکردنەوەی هەموو شتەکانی ناو ژوورەکەم، لە هەمان کاتدا هەوڵم دا ژمارەکانی خۆم لەبیر نەچێت، دوای ماوەیەک وام لێ هات چەند سەعاتێکم بەژماردنی کەلوپەلی نێو ژوورەکەمەوە دەبوراند، هەرچەند زیاتر بیرم دەکردەوە، شتی ناشناس و لەبیرچووم دەدۆزییەوە، ئەنجام ئەوەم بۆ دەرکەوت کە هەر کەسێک تاقە یەک ڕۆژ بژی دەتوانێت لە ڕێگای خەیاڵاتەوە سەدان ساڵ لە زینداندا بگوزەرێنێ. هێندەی بیر و بیرەوەری لا کۆ دەبێتەوە کە هیچ کاتێ وەرس نابێ، ئەمەش بۆ خۆی لایەنیکی چاکی تر بوو، مەسەلەیەکی دی ماوە ئەویش مەسەلەی خەوە، لە سەرەتادا بەشەوان کەم دەنووستم، بەڕۆژ هەر نەدەخەوتم، وردە وردە خەوی شەوانم باش بوو، تەنانەت وام لێ هات بەڕۆژیش دەنووستم. دەتوانم بڵێم لە مانگەکانی دواییدا شەو و ڕۆژی ١٧–١٨ سەعات دەخەوتم. دەمایەوە شەش سەعات ئەویشم بەنانخواردن و شتی دیکەوە بەسەر دەبرد، لە نێوان نوێنە شڕەکەمدا پارچە ڕۆژنامەیەکی کۆنە و زەرد هەڵگەڕاوم دۆزییەوە کە هەندێکی دڕابوو، لەم پارچە ڕۆژنامەیەدا بابەتێک نووسرابوو کە شوێنی ڕووداوەکەی چیکۆسلۆفاکیا بوو، کابرایەک لە یەکێک لە گوندەکانی چیکەوە بەدوای پارە پەیداکردندا دەڕوات، دوای ٢٥ ساڵ، سامانێکی چاک بەدەست دێنێ و بەژن و منداڵێکەوە، دەگەڕێتەوە. دایکی و خوشکەکەی لەو دێیەدا ئوتێلێک بەڕێوە دەبەن. کابرا بۆ ئەوەی دایکی غافڵگیر نەکات ژن و منداڵەکەی دەباتە ئوتێلێکی دی و خۆی بەتەنیا دەچێت بۆ دیدەنی دایکی. بەڵام دایکەکە کوڕەکەی خۆی نەناسییەوە، هەر بۆ گاڵتە ژوورێکی لە دایکی بەکرێ گرت و پارەکەشی نیشان دا تا خەیاڵی ئاسوودە بێت، شەوێ دایکی بەتەماحی پارەکە کوشتبووی و لاشەکەی فڕێ دابووە ڕووبارەوە.

سبەی بەیانی ژنەکەی هاتبوو، بێ ئەوەی بەمەسەلەکە بزانێ ناسنامەی ئەم ڕێبوارە نەناسەی کەشف کردبوو، دایکی لە خەفەتا خۆی خنکاند. خوشکەکەی خۆی خستە بیرێکەوە.

چەندین جار ئەم چیرۆکەم بەوردی خوێندەوە، لەلایەکەوە بەشتێکی نەشیاو و ناریالیستیم دەزانی و لە

لایەکی دیکەوە بەشتێکی شیاو و سروشتیم دەزانی. بەهەر حاڵ لە دڵی خۆمدا گوتم ئەو ڕێبوارە بەهەقی خۆی گەیی. چونکە نەدەبوو ئەم شۆخییە لەگەڵ دایکیدا بکات. بەم جۆرە کات لە نێوان خەو و بیرەوەری و خوێندنەوەی ئەو ڕووداوە و زۆرانبازی شەو و ڕۆژدا تێدەپەڕی. لە کتێباندا خوێندبوومەوە کە ئادەمیزاد دەتوانێ لە زیندانا زەمـان لەبیـر بکات، بەڵام ئەو ڕۆژانە بۆ من چ مـانایەکی نەبوو، نەمـدەتوانی بیـر بکەمـەوە کـە ڕۆژ و شـەو چەند درێژ و کـورتن. ئەوەی دیار و لەبەرچاو بـوو ژیان زۆر درێژە، بەڵام چونکە پێکەوە بەسـتراوە، سـەعـات و دەیقـەکـانی یەک لە دووی یەک لە بەین دەچن و تەنانـەت ناوەکـانیـانیش دەسوێ، ئەورۆ گـەییبوومـە حاڵەتێک کـە وشەی دوێنێ و سبـەینێ بەلامەوە یەک واتایان هەبوو، ڕۆژێ گاردیانەکە پێی گوتم کە پێنج مانگە لێرەم. باوەڕم بەقسـەکەی کرد، بەڵام نەمدەزانی مەبەستی چییە، ئەو ڕۆژە دوای ڕۆیشتنی گاردیانەکە خۆم لە شووشەی پەنجەرەکەدا بینی، ڕەنگ و ڕووم خۆش و ئاسایی بوو، بزەیەک کەوتە سەر لێوم. شووشەکەم جوولاند، تەماشای بزەکەم کرد، هەمان شێوەی خەمباری نواندەوە.

ڕۆژ گەییبووە دوا ساتەکانی، ئەمە ساتێ بوو کە ئیدی نەمدەویست قسان بکەم، ساتێکی بێ ناو، کە هەوای دەمەو ئێوارە گشت ژوورەکانی پڕ دەکرد و بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا بوو.

چوومەوە بەر پەنجەرەکە، لەگەڵ دوا تیشکی ڕۆژا جارێکی دی تەماشای خۆم کرد، ڕەنگ و ڕووم خۆش بوو، بەلامـەوە سـەیر نەبوو کە هیچ نەگـۆڕابووم، لە هەمـان کـاتدا، پاش چەن مـانگێک زیندانـی بۆ یەکەم جـار بەئاشکرا گـوێم لە دەنگی خـۆم بوو، چونکـە لە مێـژ بوو ئـەم دەنگە بەگـوێم ئاشنا بوو، زانیم کـە لەم ماوەیەدا هەمیشە لەگەڵ خۆمدا قسەم کردووە.

ئەو کـاتە قـسـەکـانی پەرسـتـارەکەی دایکم بیر کـەوتەوە کە گـوتی هەندێ جار ئادەمـیـزاد لەگـەڵ خۆیدا قسـان دەکات. بۆیە دەنگی خۆی دەناسێت. تا کەسێک شـەوانی تەنیایی زیندان نەبینێ نازانێ ئادەمـیزاد چۆن لەگەڵ خۆیدا قسان دەکات.

## ٣

هەسـتم کـرد کـە بەهار دوا ڕۆژەکـانی بەهاوین سـپـاردووە، دەمـزانی لەگـەڵ دەسـتـپـێـکردنی هاویندا ڕووداوێکی تازەم دێتە پێش. مەسەلەکەم درابوو بەدوا جەلەسەی دادگای جینایی، ئەم جەلەسەیە دەکەوتە مـانگی شەشەوە. ئەوقـاتەکەم دڵنیـای کردبووم کە ئەم موحاکەمەیە پتر لە سێ ڕۆژ نـاخایەنێ. ئەمە جگە لەوەی دادگا لەم بارەیەوە دەستوبرد دەکات، چونکە موحاکەمەکە بایەخێکی ئەوتۆی نییە و پێویستە دادگا کـاتی خـۆی بۆ ئەنجامـدانی کاری دی تەرخـان بکات. لەمـانەش گـرنگتـر ئەوەیە دەبێ تا کـۆتایی مـانگی شەش موحاکەمەی کابرایەک کە بابی خۆی کوشتووە دەست پێ بکات.

سـەعـات حـەوت و نیـوی بەیانی هاتن بەشـوێنمـا، ترومـبـێلی دادگـا بەرەو کـۆشکی دادگـەری بردین. پۆلیـسـەکـان کـردمـیـانە ژوورێکی زۆر تـاریکەوە. مـاوەیەک چاوەڕێمـان کـرد، لەتەک دەرگـایەکـەوە دانیـشـتبووین کە دەنگە دەنگ و تەق و تۆقی کورسی گوێزانەوە دەهاتە گوێ. ئەم دەنگە دەنگ و غـەڵبە



غـەڵبە ئەو ئاهەنگانەی وەبیر هێنامـەوە کە لە گەڕەکەکاندا دەگـێـڕدرێن و دوای ئاهەنـگەکە کورسییـەکان دەگوێزرێنەوە تا ماوەی سەماکردن بۆ میوانەکان خۆش بێت. پۆلیسەکان دەیانگوت دەبێ چاوەڕێی دەست پێکردنی دادگاکـە بکەین. یەکـێـکیـان جگـەرەیەکی دامێ، بەڵام وەرم نـەگرت. دوای تۆزێـک لێی پرسیم ئایا دەترسم، وەڵامم دایەوە نەخێر، بەپێچەوانەوە زۆر حەز دەکەم دادگا ببینم چونکە لە هەموو ژیانمدا بۆم ڕێک نەکەوتبوو کە دادگا ببینم، پۆلیسەکەی دی گوتی بەڵێ، بەڵام تا ئەو کاتە ماندوو دەبیت.

دوای مـاوەیەکی زۆر زەنگ لێ درا، کەلەپچـەکەیان لە دەسـتم کـردەوە، دەرگـا کـرایەوە، خسـتـمـیـانە قـەفـەزی تاوانبـارییـەوە، هۆڵەکـە پڕ بـوو لە خـەڵکی، لەگـەڵ ئەوەدا کـە پەردەکـان دادرابوونەوە هەتاو لە هەندێ شـوێنەوە دەهاتە ژوورێ، هەوای ئەوێ زۆر گـەرم و خنکێنەر بوو. پەنجـەرەکـان داخـرابوون، من لەجێی خۆم دانیشتم، پۆلیسەکان دەوریان گرتم، لەم کاتەدا بوو ڕیزێ زەلامم لەبەردەم خۆمدا دیت، هەموو سەیری منیان دەکرد زانیم کە ئەمانە ئەندامی دادگان، ناتوانم پێتان بڵێم کە چ شتێکیان سەرنجڕاکێش بوو، تەنیا ئەوەم بەخەیاڵدا هات کە لە سەر کورسییەک و لەنێو ترومبیلێکدام، تەواوی ڕێبوراە گێلەکان سەرنجی ڕێبوارە تازەکە دەدەن تا بەهاتنی ئەو پێبکەنن.

دەزانم ئەمـە بیـرێکی گـەوجـانەیە، چونکە چ کـەسـێـک لێـرەدا نەی دەویست پێـبکەنێ، یان بیـکات بەگاڵتەبازاڕ، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەکی ئەوتۆ لە لێکچواندنەکەدا نەبوو، بەهەر حاڵ ئەمە بیرێک بوو، هاتبوو بەمێشکمدا، کە ئەم هەمـوو قـەرەباڵغییـەم لە هۆڵەکەدا بینی کەمێک گێژ و ناڕەحەت بووم. لە سەرەتـادا ئاگام لەوە نەبوو کە خەڵکەکە کەوتبوونە پاڵەپەستۆ و مرخێش مرخێش تا من ببینن. هەرچەند سەرم دینا و دەبرد باوەڕم نەدەکرد من بووبمە مایەی ئەم هەراو هوریایە، ئەگەر موحاکەمەی من ساز نەبوایە ئەو خەڵکە زەحمەتی نەدەکێشا کە لێرەدا ئامادە بن. بەپۆلیسەکەم گوت: ئەو هەموو خەڵکە چییە!

وەڵامی دامەوە کە ئەمـانە پەیامنێر و ڕۆژنامەنووسن. بەپەنجە ڕیزێکی گەورەی نیشان دام کە لە نزیکی مێزی دادگاوە دانیشتبوون و گوتی: ئا ئەوانەن، گوتم ئەوانە کێن؟ دووبارەی کردەوە: ڕۆژنامەنووسەکانن. پەیامنێـرەکانـن، یەکـێک لە ڕۆژنامـەنووسـەکـانی دەناسی، بەرەو لای ئێـمـە هات، ئەم پیـاوە کـابرایەکی بەساڵاچوو بوو، ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، بەگەرمی دەستی پۆلیسـەکەی گوشی، لەم کاتەدا هەستم کرد کە حەشامـاتەکە جما و بەگـوێی یەکـیـاندا دەچپاند. بەهەرحاڵ وەکو ئاهەنگێک بوو، هەرکەسە و بۆ دۆست و ناسیاوی خۆی دەگەڕا.

ڕۆژنامەنووسەکە بەزەردەخەنەوە ڕووی کردە من و گوتی ئومێدەوارە کە ئەنجامی ئەم موحاکەمەیە بەباری بەرژەوەندی مندا بکەوێتەوە. سوپاسم کرد. ئەوجا لەسەری ڕۆیی و گـوتی کەمێک مەسەلەکەمان گەورە کرد، وەک خـۆت دەزانی وەرزی هاوین، وەرزێکی وشکە بەرێژەی ڕۆژنامـەگەرییـەوە، شـتـێکی ئەوتـۆمـان بەدەستەوە نەبوو کە شایەنی باس بێت جگە لە مەسەلەکەی تۆ و ئەو کابرایەی کە بابی خۆی کوشتووە، ئەوجا لە نێو خەڵکەکەدا یەکێکی نیشـان دام کە عەینەکێکی ڕەشی لە چاو کردبوو گوتی ئەم کـابرایە نوێنەری تایبـەتی ڕۆژنامـەیەکی پاریسـە، هەڵبـەت بۆ دیتنی تۆ نەهاتووە، بەڵام چونکە ڕاسـپـێـردراوە هەواڵی بەکەڵک لەمـەڕ دادگـای جینـاییـیـەوە ئامادە بکات بەپەلە هاتووە بۆ ئێـرە و دەیەوێ هەواڵێک

دەربارەی تۆ بۆ پاریس بنێرێ. خەریک بوو سوپاسی بکەم، بەڵام بیرم کردەوە کە ئەمە کارێکی پێکەنین هێنەرە، بەدەست خواحافیزی کرد و ڕۆیی، چەند دەیقەیەکی دی چاوەڕوانمان کرد، ئەوقاتەکەم لە ڕێوە هات، جلی ڕەسمی لەبەر کردبوو، گەلێک دۆست و هاوکارانی خۆی لەگەڵدا بوو، سەرەتا چوو بۆ لای ڕۆژنامەنووسەکان و دەستی گوشین، کەوتنە شۆخی و پێکەنین، لەوە دەچوو خۆشحاڵ بن کە زەنگ لێی دا هەر یەکەیان چووە جێی خۆی، ئەوقاتەکەم هاتە لام و دەستی گوشیم، ئامۆژگاری کردم کە زۆر بەکورتی وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە و ئەوی تری بەو بسپێرم، لەلای چەپەوە گوێم لە جیرەی کورسییەک بوو کە یەکێک دەیبردە دواوە، کابرایەکی باریکەڵەی باڵا بەرزم بینی کە جلی سووری لەبەردابوو، دووربینێکی بەدەستەوە بوو، کە دانیشت بەوریاییەوە جلەکانی هەڵکرد، ئەم کابرایە دادگەر «مدعي عام» بوو. سکرتێرەکە جاڕی دەستپێکردنی دادگای دا. سێ قازی، دوانیان بەجلی ڕەش و ئەوی تریان بەجلی سوورەوە، بەکۆمەڵێ فایلەوە خۆیان بەهۆڵەکەدا کرد. بەخێرایی بەرەو مێزی دادگا چوون، ئەو کابرایەی کە جلی سووری پۆشیبوو لە سەر کورسییەکەی ناوەڕاستا دانیشت، فێسەکەی لەبەردەم خۆی دانا. سەرە ڕووتاوەکەی سڕییەوە، جاڕی دەستپێکردنی جەلەسەکەی دا، ڕۆژنامەنووسەکان قەڵەمەکانیان بەدەستەوە گرت، گشتیان خۆیان کەمتەرخەم دەنواند. یەکێکیان کە تۆزێ لەوانی دی گەنجتر بوو، جلێکی قاوەیی لەبەر بوو، بۆینباخێکی شینی بەستبوو، قەڵەمەکەی لەبەردەم خۆی دانا و تەماشای منی دەکرد، چونکە قەلافاتی ڕێک و پێک نەبوو، جگە لە چاوەکانی کە بەوردی بڕی بوونییە من چیترم نەدەدیت. نەمدەزانی داخۆ چ بیرێ لە من دەکاتەوە وا خۆی سەخلەت کردووە، ڕەنگە من لەبەر ئەوە و لەبەر ئەوەش کە عادەتی شوێنەکەم نەدەزانی، بۆیە لەڕووداوەکان حاڵی نەبووم، نە لە ڕای قازییەکان نە لە ئەو پرسیارانەی کە سەرۆک لە ئەوقاتەکە و دادگەرەکەی کرد، لە هیچیان حاڵی نەبووم، نەمدەزانی چ نەخشەیەک بەدەوری ژیانم دا دەسوڕێتەوە. هەموو جارێ قازییەکان ئاوڕیان بۆ لای دادگا دەدایەوە. بەخێرایی پۆختەی فایلەکەیان خوێندەوە. هەندێ شتی وەک ناوی خەڵکی و شتی ترم ژنەوت کە بەلامەوە ئاشنا بوون. هەندێ پرسیاری نوێ لە ئەوقاتەکەم کران، هەموو ئەمانە بۆ من تازە بوون، لەم کاتەدا سەرۆک دادگا گوتی دەبێ شایەتەکان ئامادە بن، سکرتێرەکە ناوەکانی خوێندنەوە، سەرنجیان ڕاکێشام، کە لە نێو خەڵکەکەوە هەستان و یەک یەک لە دەرگاکە ون بوون، چەند کەسێکم لێ ناسینەوە، لەوانە سەرۆکی دالّدەی کەنەفتەکان، دەرگاوانەکەی، تۆماسی پیر، ڕایموند، ماسون، سالامانۆ و ماری. ماری لە دوورەوە ئیشارەتێکی خەمناک و دۆستانەی بۆ کردم، سەرم لەوە سوڕما کە چۆن لەمە پێش کەسیانم لە نێو خەڵکەکەدا نەبینیبوو، دوا کەسێک کە هەستا سیلست ی خاوەن خوارنگا بوو، ژنە قەڵەوەکەی خوارنگاکەشی لەگەڵدا بوو، ئەو ژنە بەخەشمەوە سەیری دەکردم، بەڵام من ماوەی بیرکردنەوەم نەما، چونکە لەم کاتەدا سەرۆک دادگا دەستی بەقسان کردبوو. لە قسەکانیا دەیگوت دادگای ڕاستەقینە ئێستا کرایەوە، پێم وایە پێویست ناکات بڵێم دەبێ تەماشاکەران بێدەنگی ڕەچاو بکەن. چونکە بەقسەی خۆی بۆیە لێرەبوو تا ئەم جەلەسەیە بێ لایەنانە بەڕێوە ببات و شتەکان بەشێوەیەکی عادیلانە ڕەوتی خۆیان وەربگرن، خۆ ئەگەر بچووکترین شت ڕووبدات ئەوا هۆڵەکە بەجێ دەهێڵێ.



دەیقە بەدەیقە هەواکە گەرمتر دەبوو، بەشێوەیەک خەڵکەکە کە ناچار بوون بەپارچە ڕۆژنامە خۆیان باوەشێن بکەن، ئەم باوەشێن کردنە سەروسەدایەکی بێ وچانی دروست دەکرد. سەرۆک دادگا ئیشارەتێکی کرد. فەڕاشەکە سێ باوەشێنی پووشی هێنا. هەر سێ قازییەکە بەکاریان هێنان. پرسیارکردن دەستی پێ کرد، سەرۆک دادگا هێمنانە و بگرە دۆستانە کەوتە پرسیار لێکردنم، وێڕای ئەوەی کە لە پرسیارە پەیدەرپەیەکانی وەرس دەبووم. دیسان بەلامەوە ئاسایی بوو کە وەڵامیان بدەمەوە... دیسان پرسیاری هەوێکەیان کردم، لە دڵی خۆمدا گوتم وا دیارە ئەم پرسیارانە ئاساییں چونکە مەحاڵە ئەندامانی دادگا یەکێک لەبری یەکێکی دی موحاکەمە بکەن. ئیدی سەرۆک دادگا هەموو ئەو کارانەی کە من کردبووم ڕوونی کردنەوە. دوای هەر ڕستەیەک ڕووی لە من دەکرد و دەیگوت وا نییە؟ هەموو جارێ دەمگوت بەڵێ جەنابی سەرۆک، هەڵبەت ئەم وەڵامانە بەگوێرەی ئەو ئامۆژگارییانە بوو کە ئەوقاتەکەم فێری کردبووم. چونکە سەرۆک دادگا زۆر لەسەر قسەکانی دەوەستا، پرسیارەکان زۆریان درێژە کێشا لەم کاتەدا هەموو ڕۆژنامەنووسەکان خەریکی نووسین بوون، ڕۆژنامەنووسە گەنجەکە زوو زوو چاوی هەڵدەبڕی و تەماشای منی دەکرد، ڕۆژنامەنووسەکان ڕوویان لە سەرۆک دادگا بوو. سەرۆک چەند کۆکەیەکی بۆ کرد. فایلەکەی هەڵدایەوە و بەدەم خۆ باوەشێن کردنەوە ڕووی کردە من و گوتی: ئێستا پێویستە بێینە سەر هەندێ پرسیاری لاوەکی ڕەنگە بەڕواڵەت دوور بن لە مەسەلەکەتەوە، بەڵام لەوانەیە بۆ شوێنی خۆی سوودبەخش بن. زانیم دیسان پرسیارەکان دەربارەی دایکم دەبن. هەستم دەکرد ئەم جۆرە پرسیارانە پەستم دەکەن. لێی پرسیم بۆ دایکم خستبووە دالّدەی کەنەفتانەوە. وەڵامم دایەوە، چونکە پارەم نەبوو بەجوانی بەخێوی بکەم. لێی پرسیم ئایا خەرجی دایکم دەکێشا. وەڵامم دایەوە کە نە من و نە دایکم پێویستمان بەیەکدی نەبوو، هەردووکمان بەم ژیانە تازەیە ڕاهاتبووین.

سەرۆک دادگا گوتی: حەز ناکەم دەربارەی ئەم مەسەلەیە پێ داگرم. لە دادگەرەکەی پرسی ئایا چ پرسیاری تری نییە.

دادگەرەکە لایەکی پشتی لە من بوو، بێ ئەوەی سەیری من بکات گوتی بەیارمەتی سەرۆک دادگا، پێویستە پرسیاری ئەوە بکرێ ئایا تاوانبار کە گەڕایەوە بۆ سەر کانییەکە بەمەبەستی کوشتنی کابرا عەرەبەکە چووبوو. وەڵامم دایەوە: نەخێر.

– باشە بۆ چەکی هەڵگرتبوو، لەبەرچی بەتایبەتی بۆ ئەوێ چوو بوو.

وەڵامم دایەوە تەنیا بەڕێکەوت بوو.

سەرۆک دادگا ئەم پرسیارەی لای خۆی تۆمار کرد و گوتی ڕەنگە تەنیا ئەم پرسیارە بۆ حاڵی حازر بەسوود بێت.

دوای چەند پرسیار و وەڵامێکی دی سەرۆک دادگا جاڕی کۆتایی جەلەسەکەی دا و دەبێ دوای نیوەڕۆ شایەتەکان ئامادە بن. بواری بیرکردنەوە نەبوو. ڕاستەوخۆ لە ترومبێلیان هاویشتم و بۆ زیندانیان گەڕاندمەوە، نانم خوارد، دوای ماوەیەکی کەم بەسۆراخمەوە هاتن، هەمان بەرنامە دەستی پێ کردەوە، خۆم لە هەمان هۆڵ و لەبەردەم هەمان سیمادا بینییەوە، ئەمجارەیان گەرماکە پتر بوو، تەواوی ئەندامان و

سەرۆک دادگا و دادگەر هەر یەکە و باوەشێنێکیان بەدەستەوە بوو. ڕۆژنامەنووسە گەنجەکە و ئەو ژنە کورتە بالآکە هێشتا لەوێ بوون. بەڵام ئەمان خۆیان باوەشێن نەدەکرد و بەبێدەنگی دەیانڕوانییە من. ئارەقەکەی سەر تەوێڵم سڕی. هێندە بێ تاقەت بووم نەمدەزانی لە کوێم، لەم کاتەدا بوو دەنگێک کە سەرۆکی داڵدەی کەنەفتەکانی گاز کرد وە ئاگای هێنامەوە. لێیان پرسی ئایا دایکم گلەیی لێم هەبووە، وەڵامی دایەوە بەڵێ و گوتی ئەمە گلەیی تەواوی ئەندامانی داڵدەکە بوو. سەرۆک دادگا داوای ڕوونکردنەوەی لێ کرد، ئایا دایکم گلەیی لەوە هەبوو کە خستوومەتە داڵدەی کەنەفتانەوە، دیسان وەڵام بەڵێ بوو. بەڵام ئەمجارە چ شتێکی دی نەخستە سەر وەڵامەکە. وەڵامی پرسیارێکی دی دایەوە و گوتی سەرم لە خەمساردی ئەم سوڕما لە ڕۆژی ناشتنی دایکیدا.

پرسی مەبەستت لە خەمساردی چییە؟ سەرۆک داڵدە گوتی: ئەو دەیگوت خۆزی دایکم نەدەدی و ناچار نەدەبووم بگریم و دەمتوانی دوای ناشتنی ئێرە جێ بهێڵم... شتێکی دی کە مایەی سەرسوڕمانی سەرۆک دادگا بوو، چونکە سەرۆک داڵدە دەیگوت کە ئەو لە وەڵامی یەکێک لە گۆڕهەڵکەنەکاندا گوتبووی من نازانم تەمەنی دایکم چەندە. دوای دەیقەیەک بێدەنگی، سەرۆکی دادگا لە دادگەرەکەی پرسی ئایا چ پرسیارێکی دیکەی نییە کە لە شایەتەکەی بکات. دادگەرەکە گوتی: نەخێر، ئەوەندە بەسە.

خەڵکەکە بەشێوەیەک چاویان تێ بڕیبووم هەر مەپرسە، لە هەموو ژیانمدا بۆ یەکەم جار هەستم کرد دڵم پڕ بووە و دەمەوێ بگریم، چونکە هەستم دەکرد ئەو خەڵکە بە چ نەفرەتێکەوە سەرنجم دەدەن.

سەرۆک دادگا ڕووی کردە ئەندامان و دادگەر و ئەوقاتەکەم و پرسی ئایا پرسیاری دیکەیان نییە لە شایەتەکەی بکەن.

ئەوجا گوێی لە دەرگاوانی داڵدەکە گرت، هەمان شت لە گەڵ ئەویشدا دووبارە بووەوە، وەختێ دەرگاوانەکە هاتە جێی شایەت، سەیرێکی منی کرد و ڕووی خۆی وەرگێڕا و کەوتە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی سەرۆک دادگا.

دەیگوت: گوایە من نەم ویستووە دایکم ببینم و لە مەرگی ئەودا جگەرەم کێشاوە و لەبری ئەوەی بەدیارییەوە دانیشم، خەوتووم، قاوە و شیرم خواردۆتەوە. هەستم کرد هێزێکی ئەفسووناوی باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشاوە، بۆ یەکەم جار هەستم کرد کە من تاوانبارم. داوا لە دەرگاوانەکە کرا کە مەسەلەی قاوە و شیر و جگەرە کێشانەکە بگێڕێتەوە.

دادگەرەکە بەنیگایەکی تایبەتی و سەیرەوە تێی دەڕوانیم. لەم کاتەدا ئەوقاتەکەم لە دەرگاوانەکەی پرسی: ئایا خۆشی لەگەڵ مندا جگەرەی کێشاوە؟

بەڵام دادگەرەکە بەتووڕەییەوە لە جێی خۆی هەستا و بەرپەرچی ئەم پرسیارەی دایەوە و گوتی: دەمەوێ بزانم کێ لێرەدا خەتاکارە و بەپێی کام یاسا هەقی هەیە شایەتەکە وا لێ بکات بەقازانجی خەتاکار شایەتی بدات. سەرۆک دادگا دەستووری بەدەرگاوانەکە دا کە هەر چی دەوێ با بیڵێ. کابرای پیرەمێرد بەخەمبارییەوە گوتی: بێگومان ملکەچم بۆ ئەوەی کە منیش هەڵە بووم. بەڵام زاتم نەکرد



جگەرەکەی ڕەت بکەمەوە. ئەوجا ڕووی پرسیارەکەیان کردە من و گوتیان ئایا چ قسەیەکی ترم نییە؟ گوتم نەخێر تەنیا دەتوانم ئەوە بڵێم کە شایەتەکە ڕاستی گوتووە و ڕاستە، کە من جگەرەم داوەتێ. دەرگاوانەکە نیگایەکی پڕ لە سەرسامی و هەقناسی بڕییە من و کەمێک بەدوودڵییەوە گوتی: ئەو قاوە و شیری بۆ هێنام. ئەوقاتەکە کردی بەهەرا و بەدەنگی بەرز گوتی: تەواوی ئەمانە جێگای سەرنجن. دادگەرەکە مشتێکی بەمێزەکەدا ماڵی و گوتی: بەڵێ جێگای سەرنجن و پێویستە ئەندامانی دادگا کەڵکی لێ وەربگرن و ئەم خاڵانە بچەسپێنن کە کابرایەکی بێگانە دەتوانێ شیر و قاوە بەیەکێکی دی بدات. بەڵام کوڕێک لە بەرانبەر تەرمی دایکیدا، دەبێ ئەوە ڕەت بکاتەوە.

دەرگاوانەکە گەڕایەوە جێی خۆی.

کە نۆرە هاتە سەر تۆماس پیرز، فەڕاشێک چووە بن باڵی، تۆماس دەیگوت کە دایکمی ناسیوە، یەک جاران منی بینیوە، ئەویش لە ڕۆژی ناشتنی تەرمەکەدا بوو، لێیان پرسی کە من لەو ڕۆژەدا چیم کرد.

گوتی: منیش ئەو ڕۆژە یەکجار ناڕەحەت و نیگەران بووم، بۆیە لە داخانا هیچم نەدەبینی، چونکە مردنی ئەم ژنە بۆ من سوێیەکی هێندە گەورە بوو، تا ئەو ڕادەیەی بوورامەوە، بۆیە هیچ شتێکم نەبینی. دادگەرەکە لێی پرسی: بەلای کەمەوە گریانەکەی منی دیوە. تۆماس وەڵامی دایەوە: نەخێر، دادگەرەکە پرسی: باشە بینیمی کە ناگریم. تۆماس بەنەخێر وەڵامی دایەوە، خەڵکەکە پێکەنین. ئەوقاتەکەم قۆڵی هەڵماڵی و گوتی: ئەمەش ڕوویەکی ئەو دراوەیە هەموو شتێ ڕاستە و هیچ شتێکیش ڕاست نییە. دادگەرەکە بەتووڕەییەوە قەڵەمەکەی بەسەر مێزەکەدا دەکێشا. دوای پێنج دەیقە پشوو، ئەوقاتەکەم لەو ماوەیەدا دڵنیای دەکردم کە شتەکان بەچاکی دەڕۆن. دەنگێک سیلستی خاوەن خوارنگاکەی گاز کرد. کە بەرەو جێی شایەتەکان هات، هەر سەیری منی دەکرد. ئەو جلوبەرگە نوێیەی لەبەردا بوو کە زۆر جاران لەبەری دەکرد و لەگەڵ مندا دەهاتە دەرێ و دەچووین بۆ تەراتێنی ئەسپان، بۆینباخی نەبەستبوو، دوگمەی کراسە سادەکەی داخستبوو، لێیان پرسی: ئایا من مشتەری ئەو بووم. وەڵامی دایەوە: نەک هەر مشتەریم بوو، بگرە هاوڕێشم بوو.

لێیان پرسی: ڕای چییە بەرانبەر من

گوتی: من پیاوێکی ماقووڵ و چاکم.

پرسییان: مەبەستت لەم قسەیە چییە؟ ئەوەی دەرخست کە هەموو کەس دەزانن مەبەستم چی بوو.

پرسییان ئەو کابرایەکی گۆشەگیر و پڕ ڕاز بوو.

لە وەڵاما گوتی: ئەو هەموو شتێکی لای من نەدەگوت.

دادگەرەکە لێی پرسی: ئایا لەکاتی خۆیدا مانگانەکەم پێی دەدا. سیلست بەپێکەنینەوە گوتی: ئەمە شتێک بوو لە بەینی خۆماندا.

دەربارەی خەتاکەم پرسیاری لێ کرا، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەستی بەشیشەکانەوە گرت و گوتی: بەڕای من ئەمە کارەسات و بەدبەختییەکی گەورەیە، هەموو کەسێک دەزانێت کارەسات یانی

چی... دەستەپاچەت دەکات. بەڵێ بەڕای من کارەساتە. ویستی درێژە بەقسەکانی بدات، بەڵام سەرۆکی دادگا قسەکەی پێ بڕی و گوتی: بەسە، دەتوانی بڕۆیت و دادگا سوپاست دەکات.

سیلست بەدوودڵییەوە مایەوە، داوای کرد کە ڕێی بدەن قسان بکات. ڕێیان دا بەو مەرجەی درێژدادڕی نەکات. جارێکی دی دووبارەی کردەوە: ئەمە کارەساتە، جۆرە کارەساتێکە، سەرۆک دادگا گوتی: باشە ئەوەمان زانی، ئێمە بۆیە لێرەین کە ئەم جۆرە کارەساتانە ساغ بکەینەوە، سوپاست دەکەین.

ئیدی سیلست ئاوڕێکی لە من دایەوە، وام هاتە بەرچاو کە چاوەکانی دەبریسکێنەوە، لێوەکانی تەتەڵە دەکەن، وەک ئەوەی بڵێ لەوەی پتر چم لە دەست دێ، بەڵام من هیچم نەگوت، هیچ جووڵەیەکم نەکرد، بۆ یەکەم جار بوو لە ژیانما دەم ویست مرۆڤێک لە ئامێز بگرم. جارێکی دی سەرۆک دادگا داوای لێ کرد کە بچێتەوە جێی خۆی. لە ماوەی موحاکەمەدا سیلست هەر لەوێ مایەوە، سەری داخستبوو، بەوردی گوێی بۆ قسەی شایەتەکان شل دەکرد،

ماری هاتە ژوورەوە، شەپقەیەکی لەسەر بوو، گەلێک جوان دەینواند کە چاوم بەقژە پەخشانەکەی کەوت پترم خۆش ویست. لە جێی خۆمەوە مەمکە قوتەکانیم هەڵدەسەنگاند، لێویم دەپشکنی... لەوە دەچوو تووڕە بێ.

لێیان پرسی لەکەیەوە من دەناسێت. پێی وتن لەو ڕۆژەوە کە پێکەوە لە دایەرەیەکدا کارمان دەکرد. سەرۆک دەی ویست بزانێ پێوەندی بەمنەوە چۆن بوو. گوتی دۆستی ئەوم.

لە وەڵامی پرسیارێکی دیدا گوتی: بەڵێ بڕیاربوو شایی بکەین. دادگەرەکە بەدەم هەڵدانەوەی پەڕەی فایلێکەوە لەپڕ پرسی مێژووی پێوەندیمان بۆ کەی دەگەڕێتەوە. مێژووی پێوەندییەکەی پێ گوتن. دادگەرەکە ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئەم مێژووە دەقاودەق دەکەوێتە دووەم ڕۆژی مەرگی دایکمەوە. بەتەوسەوە گوتی حەز ناکەم دەربارەی ئەم مەسەلەیە پێ داگرم، چونکە لەوانە بوو ماری تووڕە بێ، داوای لە ماری کرد کە بەکورتی باسی یەک ڕۆژی لەگەڵ مندا بکات. بەڵام ماری نەی دەویست لەم بارەیەوە چ قسەیەک بکات، بەڵام لەژێر پێداگرتنی دادگەرەکەدا باسی چوونە دەریا و لە سینەما هاتنە دەرەوە و چوونە ماڵەوەمانی گێڕایەوە. دادگەرەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەکانی ماریدا بەفایلەکەدا چووەوە. گوتی ماری بەخۆی فلیمەکەی ئەو شەوە باس دەکات. ماری گوتی لەبیرمە و فلیمێکی فرناندل بوو. کە ماری قسەکانی تەواو کرد بێدەنگی باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا، ئەوجا دادگەرەکە بەویقارەوە هەستا و بەدەنگێکی هەڵچووەوە گوتی: قازییانی بەڕێز ئەم پیاوە لە دووەم ڕۆژی دوای مەرگی دایکی چووە بۆ دەریا و پێوەندی نارەوای لەگەڵ کچێکدا بەستووە و بۆ شۆخی و پێکەنین چووە بۆ فلیمێکی خراپ. من لەوە زیاترم پێ نییە کە پێتانی بێژم.

ئیدی بەبێدەنگی لە جێی خۆی دانیشت.

بەڵام ماری لەپڕ دایە پرمەی گریان و گوتی نەخێر وا نەبووە و مەسەلەکە شتێکی دییە و ناچاریان کردووە کە ئەم شتانە بەپێچەوانەی حەز و بۆچوونی خۆی بڵێ و من دەناسێت و هەرگیز کاری خراپی لێ



نەوەشاتەوە. بەڵام فەڕاشەکە بەئیشارەتێکی سەرۆک دادگا، ماری گەڕانەوە سەر جێیەکەی خۆی. ئیدی ماسون هات و سوور بوو لەسەر ئەوەی کە من پیاوێکی ئابڕوومەندم، لەوەش زێدەتری دەگوت کە گوایە پیاوێکی ئازاو نەترسیشم. بەڵام خەڵکەکە گوێیان پێ نەدا، ئەوجا نۆرە هاتە سەر سالامانۆ و دەیگوت گوایە من میهرەبان بووم لەگەڵ سەگەکەیدا. گوێیان بەقسەکانی ئەویش نەدا. پرسیاریان لێ کرد کە ڕەفتارم لەگەڵ دایکمدا چۆن بوو، وەڵامی دایەوە و گوتی ئەو کاری بەدایکی نەبوو و لەسەر خواستی خۆی ناردییە داڵدەی کەنەفتەکان.

ئیدی نۆرە هاتە سەر ڕایموند کە دوا شایەت بوو. ڕایموند سووکە ئیشارەتێکی بۆ کردم. لە وەڵامی یەکەم پرسیاردا ئەوەی دەرخست کە من پاک و بێ گوناحم.

سەرۆک دادگا گوتی: ئێمە ڕای خۆتمان ناوێ، بەڵگەی ڕاستەقینەمان دەوێ. تا پرسیارت لێ نەکرێ وەڵام مەدەوە.

پرسیاری پێوەندی ئەویان لە گەڵ مندا لێ کرد، ڕایموند ئەمەی قۆزتەوە و گوتی: خەتای من بوو، چونکە لە خوشکی ئەو کابرا عەرەبەم دا و ئەویش قینی لێ هەڵگرتم.

سەرۆک دادگا پرسی ئایا کوژراوەکە نەهەقی بوو کە قینت لێ هەڵگرێ.

ڕایموند ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئامادەبوونی من لە کەنار دەریا تەنیا ڕێکەوت بوو و هیچی دی.

دادگەرەکە پرسی: ئەم نامەیە کە سەرچاوەی ڕووداوەکە بوو، بۆچی لەلایەن تاوانبارەوە نووسراوە.

ڕایموند وەڵامی دایەوە، تەنیا ڕێکەوت بوو.

دادگەرەکە گوتی ڕێکەوت ناتوانێ کار لە ڕەوتی بنەڕەتی مەسەلەکە بکات ئەوجا لێی پرسی ئایا تەنیا ڕێکەوت بوو کە وەختێ تۆ لە دۆستەکەی خۆت دا ئەو ناوبژی نەکردن، ئایا ڕێکەوت بوو کە تاوانبار بوو بەشایەتی تۆ... بۆ کۆتایی هێنان، بەئانقەست لە ڕایموندی پرسی کارت چییە، وەڵامی دایەوە کە دوکاندارە... حانوتی هەیە.

دادگەر ڕووی کردە ئەندامانی دادگاکە و، ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئەم کابرایە کارێکی دەکرد کە نابێ توخنی ئەم کارە بکەوێ. ئەو دۆست و هاوکاری تاوانبار بووە و کاری ناشایستە و نزمیان کردووە، لە ڕووی ڕەوشتەوە کاری ئەوان بەڵگە نەویستە. ڕایموند ویستی بەرگری لە خۆی بکات، ئەوقاتەکەی من بەرپەرچی دانەوە و گوتی بوەستێ تاکو دادگەر قسەکەی تەواو بکات.

دادگەرەکە گوتی: من ئیدی هیچم نییە بیڵێم، ئایا ئەم کابرایە برادەری تۆ بوو، وەڵامی دایەوە: بەڵێ. هەمان پرسیاریان لە منیش کرد، تەماشایەکی ڕایموندم کرد، بەڵام ئەو ئاگای لە من نەبوو. بەهەر حاڵ قسەکەیم سەلماند و گوتم وایە.

ئەوجا دادگەرەکە بەئەندامانی دادگاکەی گوت: هەمان پیاو کە لە یەکەم ڕۆژی دوای مەرگی داکی چووە بۆ کەیف و سەفا و ڕابواردن، لە بەر هەندێ هۆی پووچ پیاوێکی کوشتووە. ئیدی لە جێی خۆی دانیشتەوە.

ئەوقاتەکەم بەتووڕەیییەوە هەستا و دەستی بۆ ئەندامانی دادگا ڕاکێشا و گوتی: باشە ئەم پیاوە بەناشتنی دایکی تاوانبارە یان بەپیاوکوشتن! خەڵکەکە دەستیان بەپێکەنین کرد. بەڵام دادگەرەکە دیسان هەستایەوە و جلەکانی خۆی ڕێک خستەوە و ئەوەی خستە ڕوو کە نابێ ئەوقاتێک هێندە سادە بێ کە نەتوانێت دوو مەسەلەی ئاشکرا بەیەکەوە ببەستێت. ئەوجا بەدەنگێکی بڵند هاواری کرد. بەڵێ من ئەم کابرایە بەوە تاوانبار دەکەم کە بەدڵێکی پڕ لە خەتاوە دایکی ناشتووە.

لەوە دەچوو ئەم ڕوونکردنەوەیە بەدڵی ئامادەبووان بووبێ، ئەوقاتەکەم شانەکانی هەڵتەکاند، ئارەقەی سەر تەوێڵی سڕی. گەلێک تووڕە بوو بوو، ئەوجا زانیم کە ڕەوتی شتەکان بەقازانجی من نییە، جەلەسەکە هەڵگیرا. کە لە هۆڵی دادگا چوومە دەرێ، سواری ترومبێل کرام، هەناسەیەکی خۆشم هەڵکێشا، چونکە دەمتوانی بەڕەحەتی هەوای پاک هەڵمژم. لە کونجی زیندانەوە و لە ناخی شەکەتمەوە، ڕابوردوو و یادگارەکان بەبەرچاومدا تێ دەپەڕین، لەوانە سەروسەدای شار، هەر شتێ کە مایەی خۆشەویستیم بوو، دە ئاڵانە نیگام. هاواری ڕۆژنامەفرۆشەکان کە بەئاسماندا بڵاو دەبووەوە، ئاهەنگی دوای فڕینی باڵندەکان، سەروسەدای بازرگانەکان، هاڕەی ترومبێلی سەر جادەکانی شار، قەرەباڵغی دوا ساتەکانی ئێوارێ، هەموو ئەمانە وەکو تاپۆی خەیاڵێ لەبەر چاومدا خۆیان دەنواند.

بە پەلەبووم هەرچی زووتر، بگەمەوە زیندان، خەیاڵم دەکرد کە لەوێ ئاسوودە دەبم، چونکە دەتوانم لەوێ بۆ ساتێ بخەوم و ڕەنگە ئیدی لە عالەمی خەودا ئەم خەونە سامناکانەم لێ دوور بکەونەوە، بەم حاڵە جۆش و خرۆشێکم تێ کەوتبوو، ئەو جۆش و خرۆشە، ئومێدی ئەوەی پێ دەبەخشیم کە بتوانم ماوەیەک لە زینداندا پشوو بدەم.

## ٤

ئەوەی سەیر بێ ئەوەیە پیاو گوێی لە کەسانێک بێت کە باسی کەن... تەنانەت ئەگەر لە قەفەزی تاوانباریشدا بێ، دەتوانم بڵێم هێندەی باسی خۆیان کرد، باسی تاوانەکەیان نەکرد. نازانم ڕەنگە وا بێ و دادگاکان لە یەکدی جیاواز بن، وەکیلی عام دەستی بڵند دەکرد و تاوانباری دەکردم و ئەوجا تەوازۆی دەهێنایەوە. دادگەرەکە دەستی هەڵدەبڕی و تاوانەکەی دەسەلماند، بەڵام تەوازۆی نەدەخواست، وێڕای ئاڵۆزی بیر و ناڕەحەتی خەیاڵم، حەزم دەکرد هەندێ جار خۆم لە شتەکان هەڵقورتێنم، بەڵام ئەوقاتەکەم ئامۆژگاری دەکردم کە بێدەنگ بم چونکە بێدەنگی بۆ خۆم چاکترە. بەهەر حاڵ شتەکان لە دەرەوەی من جێبەجێ دەکران و ڕەوتی ئاسایی خۆی وەردەگرت. زۆر جار دەم ویست قسەکانیان پێ ببڕم و بڵێم: باشە ئێوە پێم بڵێن تاوانبار کێیە؟ تۆمەت دانە پاڵ، خۆی لە خۆیدا بابەتێکی گرنگە. جگە لەوە دەبوو بزانم ئەو خەڵکە بۆ خۆیان هیلاک دەکرد بۆ وێنە بەرگرییەکانی دادگەری گشتی زۆر زوو هیلاکی دەکردم. ئەم قسانە هیچ نەبوون، تەنیا کۆمەڵێ قسە و حەرەکاتی بێ سەروبەر و دوور لە یەک بوون. ئەوەی لێی حاڵی بوو بووم، پوختەی بیری ئەوە بوو کە گوایە من بەسووربوونەوە ئەم تاوانەم کردووە. هەوڵی دەدا ئەمە بسەلمێنێ و بێ وچان دەیگوت: بەڵگە بۆ قسەکانم دێنمەوە. بەبەڵگەوە شتەکان دەخەمە ڕوو. لە



مردنەکەی دایکمەوە هەموو شتەکانی بەگەلاڵەکراوی خستە ڕوو، باسی بێ هەستی منی کرد، باسی ئەوەی کرد کە تەمەنی دایکم نەزانیوە. مەلەوانەکەی ڕۆژی دوای مەرگی دایکم. چوونە سینەما لەگەڵ ئافرەتێکدا تا گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵ ماریدا، بەهەر حاڵ هەموو ئەوانەی بەشێوەیەکی ڕێک و ڕەوان خستە ڕوو. بەتایبەتی کە نێوی ماری وەکو «دۆستێک» دەهێنا مایەی سەرنجی من بوو. چونکە ماری بۆ من ئافرەتێک بوو وەکو هەر ئافرەتێکی دی. ئەوسا گەیییە سەر باسی ڕایموند... هەستم کرد زۆر بەڕوونی شتەکەی گێڕایەوە. ئەوەی دەیگوت ماقووڵ بوو، من کاغەزەکەم لەگەڵ ڕایموند نووسی تا دۆستەکەی بێمنە ئێرە و ئازاری بدات، ئەمە جگە لەوەی من بووبوومە مایەی شەڕی نێوان ڕایموند و کابرای عەرەب و ئەوە بوو ڕایموند بریندار بوو، داوای دەمانچەکەم لێ کردبوو تا بەتەنیا بگەڕێمەوە و بەکاری بهێنم. کابرا عەرەبەکەم بەپێی نەخشەیەکی دیاریکراو کوشت و بۆ ئەوەی دڵنیا بم چوار گوللەی ترم پێوە نا، هەموو ئەوانەی گێڕایەوە و ئەوجا گوتی: بەڕێزان ئەوا ڕێڕەوی ئەو ڕووداوانەم بۆ ساغ کردنەوە کە ئەم پیاوەیان بەرەو قەتڵکردن برد. بۆیە من سوورم لەسەر ئەوەی کە ئەم مەسەلەیە مەسەلەی کوشتنێکی ئاسایی نییە. بەڕێزان ئەم پیاوە زەلامێکی هوشیارە، خۆ گوێتان لێ بوو، وا نییە؟ دەتوانێ وەڵامی چاک بداتەوە، نرخی قسە دەزانێ، ناتوانرێ، بڵێین ئەوەی کە کردوویەتی ئەنجامی نەزانی و دەرک نەکردنی شتەکانە. گوێم لێ بوو حوکمی زیرەکی و هۆشیارییان بەسەردا دەدام. بەڵام لەوە حاڵی نەدەبووم کە چۆنە بێ ڕەوشتی ئاسایی مرۆڤێک ببێ بەبەڵگە بۆ تاوانبارکردنی خۆی. ئەمە لە هەموو شتەکان پتر سەرنجی ڕادەکێشام... ئیدی نەمتوانی گوێ بۆ قسەکانی دادگەر بگرم. تا گوێم لە دادگەری گشتی بوو دەیگوت: باشە ئەم زەلامە هەرگیز پەشیمانی و داخی دەربڕیوە؟ هەرگیز بەڕێزان، تەنانەت لە تەواوی ماوەی محاکەمەکردنەکەشیدا تەنانەت بۆ جارێکیش پەشیمانی خۆی دەرنەبڕیوە. لەم کاتەدا بەرەو لای من سووڕایەوە، پەنجەی ئیشارەتکردنی بۆ من ڕاکێشا، بێ ئەوەی بزانم بۆ. بێگومان نەمدەتوانی بڵێم قسەکانی دروست نین، چونکە لە کارەکەی خۆم ژیوان نەبووم. بەڵام سوور بوون و پێداگرتنی ئەم کابرایەم بەلاوە سەیر بوو، حەزم دەکرد بەشێوەیەکی دۆستانە و بگرە بەشێوەیەکی پڕ لە خۆشەویستی پێی بڵێم کە من هەرگیز دەربارەی هیچ شتێ پەشیمان نیم و نەبووم، من عادەتێکم هەیە کە هەرچی ڕوو دەدات ئەوە وەربگرم... بەڵام ئەو وەزعەی منیان تێ خستبوو بواری ئەوەی نەدەدام خۆم میهرەبان نیشان بدەم. لەبەر ئەوەی دادگەرەکە دەی ویست قسان لە بارەی منەوە بکات، گوێم بۆ قسەکانی شل کرد، دەیگوت: توانیویەتی بچێتە ناو ڕۆحی منەوە، بەڵام چ شتێکی بەدەست نەهێناوە، قازییانی بەڕێز ئەم کابرایە دەڵێ کە لە ڕاستیدا ڕۆحی نییە و هەستی مرۆڤانەی نییە... هەڵبەت ناتوانین لەسەر شتێک لۆمەی بکەین کە نەیتوانیوە بەدەستی بهێنێ، ئێمە ناتوانین لەسەر ئەمە سەرزەنشتی بکەین. بەڵام وەختێ کار دەگاتە دیوانی دادگا... پێویستە ئەو بۆشاییییەی کە دەکەوێتە دڵی مرۆڤەوە ڕەنگە کۆمەڵگا تێی بکەوێ. پڕ بکرێتەوە. لێرەدا هاتە سەر ڕەفتارم لەگەڵ دایکمدا، ئەوەی لەوە پێش وتبووی هەمووی دووبارە کردەوە. بەڵام کە باس هاتە سەر تاوانی من درێژەی پێ دا، هێندەی درێژدادڕی کرد ئیدی گەرمای هۆڵەکەم بیر چووەوە.

لێرەدا دادگەرەکە کەمێک بێدەنگ بوو، دووبارە دەستی بەقسان کردەوە و گوتی: قازییانی بەڕێز، سبەینێ لە هەمان دادگادا کەسێک موحاکەمە دەکرێ کە بابی خۆی کوشتووە، ئێرە شوێنێکە دەبێ لادانی ڕۆحی خەڵکی تێدا لە مەحەکی دادوەری بدرێ. بەڕای ئەو، ئەم جۆرە تاوانانە مایەی قێزهاتنەوەی مرۆڤایەتییە و دەبێ وەڵام بدرێتەوە. سەرجەمی ڕای ئەو، ئەمە بوو کە هەر کەسێک دایکی یان باوکی خۆی بکوژێت دەبێ لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەربکرێ.

ئەم بۆچوونە ڕاست بوو، بەڵام ئەو، هەر بەمەوە نەوەستا و ڕای وا بوو کە هەر کەسێک لە ڕووی ڕەوشتی و مەعنەوییەوە ببێتە مایەی مەرگی دایکی لەگەڵ ئەو کەسەدا کە دەست دەکاتەوە کۆ لە کوشتن ناکاتەوە هەر دووکیان هەر وەک یەکن و پێویستە هەردووکیان لە کۆمەڵگا دەربکرێن. بەهەر حاڵ تاوانی یەکەم ڕێ بۆ تاوانی دووەم خۆش دەکا، بەڕێزان من دڵنیام ئەگەر بڵێم ئەو کەسەی کە لەسەر ئەم کورسییە دانیشتووە، لەو کەسە تاوانبارترە کە بەتاوانی باوک کوشتنەوە موحاکەمە دەکرێ و پێویستە بەپێی هەمان ڕێوجێ موحاکەمە بکرێ.

لێرەدا دادگەرەکە دەموچاوی ئارەقەکردووی خۆی سڕی و گوتی ئەرکی من قورسە و دەبێ ئەم ئەرکە ئەنجام بدات. ئەوەی ڕوون کردەوە کە نابێ من ئەندامی کۆمەڵگایەک بم کە ڕێزی یاساکانی ناگرم. من داوای سەری ئەو مرۆڤانەتان لێ دەکەم و دڵم ئاسوودەیە... ئەگەرچی لە تەواوی ماوەی دادگەریمدا چەندین جار ئەم جۆرە داوایانەم کردووە، بەڵام هەرگیز بەئەندازەی ئەوڕۆ خۆم بەهەق نەزانیوە، من ناتوانم خۆم بەمرۆڤ بزانم، یان لافی ئەوە لێ بدەم کە بەرگریم لە مافی مرۆڤ کردووە، ئەگەر ئەم تاوانبارە بەسزای شایستەی خۆی نەگات.

کە دادگەرەکە لە جێی خۆی دانیشتەوە، بێدەنگییەکی کەمێک درێژ باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا، منیش لە گەرما و لە سەرسامیدا گێژ بوو بووم، سەرۆک دادگا کۆکەیەکی کرد و بەدەنگێکی زۆر نزم لێی پرسیم ئایا چ قسەیەکی دیم نییە؟ هەندێ قسەم لێرە و لەوێوە هێنا و گوتم من هەرگیز قەستی کوشتنی کابرای عەرەبم نەبوو.

سەرۆک دادگا لای وابوو ئەم قسەیە خۆی لە خۆیدا جۆرە دان پێدانانێکی سادەیە کە لەبەردەم دادگادا ناکاتە بەڵگەیەکی چەسپاو و بنجبڕ داوای کرد بەرلەوەی گوێی لە ئەوقاتەکەم بگرێ خۆم بەڕوونی دان بەوەدا بنەم کە چی بووە هۆی ئەوەی ئەم کارە بکەم، بەدەمە لالکێ و قسەی هەلەق و مەلەقەوە و بەپەلە گوتم ئەنجامی گەرمای هەتاوەکە بوو، سەدای پێکەنین سەراپای هۆڵەکەی گرتەوە. ئەوقاتەکەم شانەکانی هەڵتەکاند، دەستبەجێ داوایان لێ کرد جەمسەری قسەکانی بگرێتە دەست. بەڵام ئەوەی ڕوون کردەوە کە درەنگە و پێویستە چەند ساتێک قسان بکات. بۆیە داوای لە دادگا کرد کە قسەکردنەکەی بۆ بخەنە دوای نیوەڕۆ.

دادگا داواکەی پەسەند کرد.

دوای نیوەڕۆ جووتە پانکەکەی نێو هۆڵەکە هەواکەیان گێژ دەدا، قازییەکانیش باوەشێنەکانی خۆیان بەدەستەوە بوو و سەرگەرمی خۆ باوەشێن کردن بوون، بەرگری ئەوقاتەکەم بەشێوەیەک بوو وام هەست



دەکرد قەت کۆتایی نایەت، کە گوێم بۆ قسەکانی شل کرد، گوێم لێ بوو لەنێو قسەکانیا دەیگوت: ڕاستە ئەو بکوژە... بەهەمان ئاواز درێژەی بەقسەکەی دا، کە لەمەڕ من قسەی دەکرد سەرم سوڕ دەما... سەرم خستە بناگوێی پۆلیسێکەوە و گوتم بۆ ماوە بەمن نادا قسان بکەم. پۆلیسەکە گوتی: ئەمە عادەتی هەموو ئەوقاتێکە. هەستم دەکرد ئەمە دوورخستنەوەی منە لە مەسەلەکە و دەکرێم بەسفر. بەهەر حاڵ ئەوەی ئەوقاتەکەم دەیگوت بەلامەوە گاڵتەبازاڕ بوو، بەخێرایی قسەکانی لەمەڕ کوشتن بڕییەوە و هاتە سەر باسی ڕۆحی من. بەڵام هەستم کرد لەم بارەیەوە لە دادگەرەکە کەم بەهرەترە. دەیگوت منیش چوومەتە دنیای ڕۆحییەوە و شتێکم لەم ڕۆحەدا خوێندۆتەوە. وەک ئەوەی کتێبێکم خوێندبێتەوە. ئەو بەشێوەیەک ڕۆحی خوێندبوومەوە کە کابرایەکی ئابڕوومەندم، پیاوێکی ئەمەکدار و ئیشکەرم و خۆشەویستی هەمووانم و لەگەڵ کلۆڵی خەڵکاندا تێکەڵ بووم و ژیاوم لە ڕوانگەی ئەوەوە فەرزەندەیەکی نموونەیی بووم و تا توانام بووە خزمەتی دایکم کردووە دوایی بیرم کردۆتەوە کە داڵدە شوێنێکی چاک و لەبارە بۆ ئاسوودەیی دایکم و لەکاتی دەست کورتیدا ئەم هەنگاوەم بەشتێکی بەجێ و لەبار زانیوە. ئەوجا گوتی بەڕێزان من نازانم بۆ ئەم هەراو هوریایە دەربارەی داڵدە بەرپا بوو، چاکترین بەڵگە بۆ سوودمەندی ئەم داڵدەیە ئەوەیە کە دەوڵەت بەخۆی خەرجی دەکێشێت. بەڵام چ قسەیەکی دەربارەی ڕێوشوێنی کفن و دفنەکە نەهێنایە گۆڕێ... بەڕادەیەک هەستم کرد بەرگرییەکەی لەم ڕووەوە نوقوستانە. ئیدی وام بەخەیاڵا هات کە دوای ئەم هەموو بگرە و بەردەیە خەڵکەکە منیان تەواو ناسی و تێکڕا ئاشنای کردار و ڕەوشت و ژیانم بوون.

خەڵکەکە هەندێکیان بەزەییان پێمدا دەهاتەوە و هەندێکیان بەپێچەوانەوە. هێندە ماندوو بوو بووم خوا خوام بوو زووتر قسەکان تەواو بن و بگەڕێمەوە بۆ زیندانەکەم و پشوویەک بدەم.

قسەکان درێژەی کێشا... تا گوێم لێ بوو لە ئاخرو ئۆخری قسەکانیا هەندێ شتی گوت، بەڵام باوەڕم نەدەکرد ئەم قسانە کارێکی وا بکەنە سەر قازییەکان کە چاوپۆشی لە کوشتنەکەم بکەن و تاوانەکەم بەرێکەوت لە قەڵەم بدەن.

ماوەی پشوو دەستی پێ کرد، ئەوقاتەکەم بەشەکەتییەوە لە جێی خۆی دانیشت. بەڵام هاوڕێکانی هاتنە لای و دەستیان گوشی و گوێم لێ بوو دەیانگوت: جوان بوو... یەکێکیان دەستی منی گرت و گوتی: پیرۆزباییت لێ دەکەم... سەری سوپاسم بۆ داگرت... بەڵام سوپاسکردنەکەم گەلەک سادە بوو، چونکە ئەوەندە ماندوو بووم توانای قسەکردنم نەبوو. هەموو لە دەرێڕا چاوەڕوان بوون، ئەو شتەی کە هەمووان چاوەڕێی بوون تایبەت بوو بەمنەوە، جارێکی دی چاوم بەهۆڵەکەدا گێڕایەوە... هەموو شتەکان وەک خۆی وابوو. نیگام لە نیگای ڕۆژنامەنووسەکان ئالا... دەمودەست ئەم بیرە بەمێشکمدا تێپەڕی کە لەو کاتەدا لەبیری ماریدا نەبووم. لە تەواوی ماوەی موحاکەمەکەدا یادی ئەوم بەخەیاڵا نەهات...هەڵبەت نەک لەبەر ئەوەی ئەوم لە بیرکردبوو بەڵکو لەبەر ئەوەی کاری قورسترم بەسەرەوە بوو. «ماری»م لە نێوان سیلست و ڕایموندا بینی. ئیشارەتێکی بۆ کردم وەک ئەوە بوو بیەوێ بڵێت: چی بوو.

کەمێک نیگەران دیار بوو، بزەیەکی بەڕووما دا، بەڵام دڵم گیرابوو نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە.

دادگا دەستی پێ کردەوە. کۆمەڵێک پرسیار و وەڵام لە نێوان ئەندامانی دادگادا هێنرا و برا، من تەنیا دوو وشەی تاوانبار، پیاوکوژم بیست و جارێکیش ڕستەی کوشتنی بەئانقەست هاتە گۆڕێ.

ئیدی قازییەکان هۆڵەکەیان بەجێ هێشت، منیان بردەوە ئەو ژوورە بچکۆڵەیەی کە پێشان لەوێ چاوەڕێم دەکرد.

ئەوقاتەکەم خۆی گەیاندمێ، شڵەژاو و نارەحەت بوو، بەخۆشەویستییەکی بێ وێنەوە قسەی لە گەڵمدا دەکرد، لای وابوو کە ئەنجام باشە و بەچەند ساڵێ حەپس لە مەرگ ڕزگار دەبم.

لێم پرسی ئەگەر ئەنجام بەقازانجی ئێمە نەبێت بواری تازەکردنەوەی موحاکەمەمان دەبێت؟ وەڵامی دایەوە نەخێر. ئەم جۆرە موحاکەمەیە تازەکردنەوەیان بۆ نییە، بۆچوونەکەیم بەڕاست زانی، بۆیە قەناعەتم بەقسەکانی کرد. ئەگەر بەسەرپێیی سەیری مەسەلەکەمان بکردایە زۆر ئاسایی بوو، بەهەر حاڵ ئەوقاتەکەم دڵخۆشی دەدامەوە و لای وابوو ئەنجام بەقازانجی من دەبێت. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمان کرد، پتر لە سێ سەعات و نیو، لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا زەنگ لێدرا، ئەوقاتەکە دەیگوت سەرۆک دادگا وەڵامەکان دەخوێنێتەوە. لێم جیا بووەوە و گوتی وەختێ تۆ بانگ دەکەن کە ئیدی دوا ئەنجام بخوێنرێتەوە، دەرگاکان کرانەوە، خەڵکانێک بەپلەکاندا سەرکەوتن کە نەم دەناسین، ئەوجا گوێم لە دەنگی کەسێک بوو کە شتێکی دەخوێندەوە. دیسان زەنگەکە لێدرایەوە، دەرگای ژوورە چکۆلەکە کرایەوە...

بێدەنگییەکی قووڵ هەموو لایەکی گرتەوە، دەمویست چاوێ بگێڕم و ماری لە نێو خەڵکەکەوە ببینم، بەڵام ماوەی ئەم کارەم نەبوو، چونکە لەو کاتەدا سەرۆک دادگا ڕووی کردە من و گوتی پێویستە لە مەیدانێکی گشتیدا و بەناو گەلی فەرەنسا سەرم لە لاشە جوێ بکرێتەوە.

پۆلیسەکان زۆر میهرەبان بوون لەگەڵمدا. ئەوقاتەکەم دەستی خستە سەر مەچەکم، بەڵام من بیرم لە هیچ نەدەکردەوە.

سەرۆک دادگا لێی پرسیم ئایا چم نییە بیلێم.

دوای کەمێک بیرکردنەوە گوتم: نەخێر.

ئەوجا بردیانم.

## ٥

بۆ جاری سێیەم چاوپێکەوتنی کەشیشم ڕەت کردەوە، هیچم نەبوو پێی بڵێم، ئارەزووی ئاخافتنم نەبوو، هەستم نەدەکرد چ پێویستییەکم بەبینینی هەبێ، چونکە دوای ماوەیەکی کەم لەو دنیا دەیبینم، ئەوەی لەو کاتەدا بۆ من گرنگ بوو، ئەوەبوو کە بتوانم خۆم لە خنکان ڕزگار بکەم. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەشێت ڕێیەکی ڕزگاربوون وەدۆزم.

زیندانەکەمیان گۆڕیبوو. دەمتوانی لەم زیندانەدا بەڕاکشانەوە ئاسمان ببینم، جگە لە ئاسمان چ



شتێکی دی دیار نەبوو. تەواوی ڕۆژگارم بەتەماشاکردنی ئاسمانەوە بەسەر دەبرد. لە حاڵێکدا کە پاڵ کەوتبووم، دەستم خستبووە ژێر سەرم و چاوەڕوان بووم. نازانم چەند جار ئەم پرسیارەم لە خۆم کرد، ئایا دەشێت حوکمدراوێک توانیبێتی خۆ لە ئەشکەنجەی خنکاندن ڕزگار بکات. یان پێش ئەوەی لە سێدارەی بدەن ڕای کردبێ.

لۆمەی خۆم دەکرد کە هیچ کاتێ وەک پێویست بایەخم بەچیرۆکانی لە سێدارەدان نەداوە. پیاو دەبێ هەمیشە بایەخ بەم مەسەلانە بدات چونکە مرۆڤ نازانێ چی ڕوو دەدات. بێگومان منیش وەک هەزاران خەڵکی دی ئەم مەسەلانەم لە ڕۆژنامەکاندا خوێندبووەوە، بەڵام لەم چیرۆکانەدا هەندێ بەشی ناسک و پێویست بووە کە هەرگیز سەرنجم نەداوە و لێی نەکۆڵیومەتەوە. ئەگینا لەوانەیە لەوێدا ڕێگایەکی ڕزگاربوون و هەڵاتنم بەرچاو کەوتبا و بۆ ئێستا بەکەڵکم هاتبا، لە چیرۆکدا خوێندبوومەوە کە بەدەگمەن وا ڕێک دەکەویت پەتی سێدارە لە کاتی هەڵواسیندا بپچڕێ ئەمە شتێکی چاوەڕوان نەکراوە کە بەرێککەوت یان بەخت بۆ تاقە جارێک چارەنووس بگۆڕێ. خۆ ئەگەر یەک جار ئەمە بۆ من هەڵکەوتبا، ئەوجا شتەکانم بەگوێرەی دڵی خۆم ئەنجام دەدا.

هەندێ جاران ڕۆژنامەکان گفتوگۆ لەمەڕ ئەو ئەرکانەی ئادەمیزاد بەرانبەر بەکۆمەڵگا، دەکەن. بەبۆچوونی ئەوان پێویستە ئەم ئەرکە ئەنجام بدرێ. بەڵام تەواوی ئەم مەسەلانە لە دەرەوەی سنووری بۆچوون و خەیاڵن. تاقە شتێ کە لەم حاڵەدا بۆ من گرنگ بوو، ئەوە بوو بتوانم ڕێگایەک بۆ هەڵاتن پەیدا بکەم و شێتانە کار بکەم، هەڵبەت ئەمە ئومێدێکی ئەوتۆی لێ ناکرێ. چونکە لەوانەیە لە ئەنجامی تاقیب کردنەوە لە کووچەیەکدا ببێ بەنێچیری گوللەیەک. بەڵام ئەگەر لە هەموو ڕوویەکەوە شتەکە تەماشا کرابا، زۆر گرانیش نەدەهاتە بەرچاو و لە گوێن بوو. بەڵام وەزع و حاڵێک کە منی تێدا بووم بواری ئەم جۆرە ئومێدەی نەدام، هەموو بەڵگەکان ئەوەیان دەنواند کە ماشین و پەتی سێدارە لە ئامێزم دەگرن. سەرەڕای ویستی ڕاستگۆم نەمدەتوانی ئەم ڕاستییە تاڵە قبوڵ بکەم چونکە ناکۆکییەک هەبوو لە نێوان حوکمەکە و مەسەلەکە، موحاکەمەکە هەموو لایەنەکانی ئاسایی و سروشتی نەبوو، کارەکەی من وەکو ئەم بیرە بوو کە ئێستا دەربارەی هەڵاتن مێشکی خوتووکە دەدام. خوێندنەوەی بڕیاری دادگا لە سەعات بیستدا لە بری سەعاتی هەڤدە... بڕیاردانەکە لەلایەن کەسانێکەوە کە خۆیان گۆڕیبوو... ئەوجاش تەواوی لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە ناسروشتی و ساختەگی دیار بوو. لەگەڵ ئەمەشدا ناچار بووم لەو سەعاتەوە کە ئەم بڕیارەم دەربارە درا ئیدی دان بەڕاستی شتەکەدا بنێم، دەمویست دیوارەکانی زیندانەکە بێنمە خوارەوە. لەم کاتەدا ئەو چیرۆکەم وەبیر هاتەوە کە دایکم لەمەڕ بابمەوە بۆی دەگێڕامەوە. هەڵبەت تەواوی ئەو ڕووداوەم بیر نەماوە چونکە ئەو کاتانە منداڵ بووم. بەڵام پوختەی شتەکە و ئەوەی بەلای منەوە مەبەستە ئەوەیە کە دایکم بۆی باس دەکردم و دەیگوت:

ڕۆژێک بابم چووبووە تەماشای لە سێدارەدانی بکوژێک، ئەو دیمەنە کاری تێ کردبوو، چەند ڕۆژێک نەخۆش کەوتبوو لە جێدا کەوتبوو، سەرەڕای ئەوەی دەیزانی ئەم شتە باش نییە، هەر ڕۆییبوو لە گەڕانەوەدا دڵی تێک چوو بوو.

من ئەو ڕەفتارەی بابم بەدڵ نەبوو، ئەمڕۆ زانیم کە شتەکە ئاسایی بووە. نازانم چۆن ئەو ڕۆژانە نەمدەزانی کە تەماشاکردنی لە سێدارەدانی مەحکومێ چەند گرنگە و بینینی ئەو جۆرە دیمەنانە شتێکی پێویستە بۆ هەموو کەسێک. ئەگەر ڕۆژێک لەم زیندانە دەرباز بم هەمیشە دەچمە سەیری ئەم چەشنە لە سێدارەدانانە. بەڵام زۆر گەوج بووم کە بیرم لەمە دەکردەوە، چونکە خەون بینین بەم بابەتەوە بۆ ڕۆژەک کە تێیدا ئازاد بم و بتوانم بەرانبەر هەزاران پۆلیس کە لەبەر دەرگا و لە ڕاڕەوەکاندا وێستاون تێپەڕم و ئەوجا دەرفەتێ بێتە پێشەوە کە بتوانم بچمە سەیری لە سێدارەدانی مەحکومان. ئەم ئەندێشەیەم بەلاوە مەنتقی نەبوو، نەدەبوو خۆم دەستەمۆی ئەم ئەندێشە بێ سەروبەرە بکەم. دوای کەمێک ئەنجامی بیرکردنەوە و خەیاڵ پڵاوی لەرزم لێ هات. خۆم لەژێر لێفەکەدا گرمۆڵە کرد، لەرزێکی وەهام لێ هاتبوو چۆقەی ددانەکانم دەهات. لە لایەکی تریشەوە ئادەمیزاد هەمیشە ژیرانە و مەنتقی بیر ناکاتەوە. ئەگەر ڕۆژێک دەسەڵاتم بوو، یاساکانی دنیا دەگۆڕم. لە یاسای سزادان شانسێک بۆ مەحکومان دەهێڵمەوە، یاساکە بەشێوەیەک دادەڕێژم کە بەلای کەمەوە لە هەزارا یەک شانس بۆ ڕزگاربوونی مەحکوم دابین بێ، ئەمەش زۆرە بۆ لابەلاکردن و ساغکردنەوەی گەلێک شت، لەلایەکی ترەوە بڕیار دەدەم کە بەهۆی ماددەیەکی کیمیاوییەوە کە مەحکومان بکوژرێن. ئەمەش بەجۆرێ نەبێ کە لە سەدا سەد ببێتە مایەی مەرگی مەحکومەکان. چونکە کە بیر دەکەمەوە، شێوە و مەرجی خنکاندنی ئەوڕۆ دێنمە بەرچاوی خۆم و مەکینەیەکی سامناک ملی مەحکوم دەقرتێنێ. شتێکی گەلێک سامناکە و بچووکترین دەرفەت بۆ ڕزگاربوونی مەحکومەکە نایەڵێتەوە.

بەدبەختییەکە لێرەدایە کە چارەنووسی مەحکومان بەدەستی کۆمەڵە کەسێکەوەیە کە بڕیاری لەسەر دەدەن و وەختێ بڕیارەکە درا ئیدی ژێوان بوونەوە مەحاڵە و ئەگەر مەکینەکە کاری نەکرد. ئەوجا جارێکی دی دەیخەنەوە ئیش و مەحکومی بەدبەخت ئومێدەوارە مەکینەکە باش کار بکات تا ناچار بەدووبارەکردنەوە نەبێ. بەڵام لە لایەکی ترەوە ناچارم دان بەوەدا بنێم کە نهێنی ڕێکخستنی چاک لێرەدایە. بۆیە مەحکوم ناچارە کۆمەکی پێ بکات و بەرژەوەندی لەوەدایە کە شتەکان بێ کۆسپ بەڕێوە بچن، ناچار بووم دان بەوە دابنێم کە تا ئێستا بەچاکی بیرم لەو مەسەلانە نەکردبووەوە، هەڵبەت هۆی ئەوەم نەزانی و تەنانەت نەم دەزانی بۆ خنکاندن بەهۆی مەکینەوە دەبێ بەسەر کورسییەکی داردا بڕۆم و لە پەیژەوە سەر بکەوم.

پێم وایە ئەمە بەهۆی ڕوودانی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ی فەرەنساوە بوو کە دوایی بوو بەدەستوور و خەڵکی کەم و زۆر ئاگایان لێی بوو. بیرم دێتەوە ڕۆژێک لە ڕۆژنامەدا وێنەی مەحکومێک بەخنکاندنیان و چۆنێتی خنکاندنەکەی بڵاو کرایەوە و دەنگی دابووەوە، مەکینەی خنکاندن لە هەمان شوێن کە ئەوڕۆ دانراوە، لەسەر زەوی دانرابوو، گەورەیی مەکینەکە بەپێچەوانەی بۆچوونی من زۆر ترسناک بوو. سەیرەکە لەمەدایە کە لەم ماوەیەدا هیچ کاتێ یادی ئەم دیمەنە و ئەم وێنەیەم کە سەرنجی منیشی وەک هەزاران مەردمی دی ڕاکێشابوو بەخەیاڵمدا نەهاتبوو. سروشتی ئادەمیزاد وایە کە شتێ نەزانێ یان نەناسێ موبالەغەی تێدا دەکات. بەڵام من دەبێ سەرنجم وابێ کە ئەم مەسەلەیە، مەسەلەیەکی سادە و ئاساییە.



ئامێرەکە لەسەر زەوی دانراوە، بەشێوەیەک ئادەمیزاد دەتوانێ ڕاستەو ڕاست بەرەو ڕووی بچێت وەک چۆن بەپیری خۆشەویستێکەوە دەچن. مەحکومیش بەو جۆرە پێشوازی لێ دەکات.

بەڵام سێدارە وا نییە، دەبێ ئادەمیزاد لە هەوادا هەڵواسرێ، بەڵام ئامێری ملقرتاندن ئەمەی نییە و لەپڕ مەحکومەکە لە نێو دەبات و ئادەمیزاد بەکەمێک شەرمەزارییەوە خۆی دەداتە دەست مەرگ و بەدڵنیاییەوە دەزانێ کە ژیانی تەواو بووە.

دوو شتی دی هەبوون کە بیرم لێ دەکردنەوە یەکێکیان سپێدە و ئەوی تریان ئازادی و بەخشین. هەوڵم دەدا کە بیریان لێ نەکەمەوە. ڕادەکشام، تەماشای ئاسمانم دەکرد، هەوڵم دەدا لەزەت لەم تەماشاکردنە وەربگرم. ئاسمان تاریک دادەهات و مژدەی ئێوارەی دەدا. خۆم ماندوو دەکرد کە ئاوەڕۆی بیرکردنەوەم بگۆڕم. گوێم بۆ ترپەی دڵم ڕادەگرت، باوەڕم نەدەکرد ئەم ترپەیە کە چەندین ساڵ بوو لەگەڵم دابوو، ڕۆژێ بێت لە لێدان بکەوێ و لێم جودا بێتەوە. من هەرگیز لە ژیانمدا دەستەمۆی بیری ڕاست نەبووم، سەرەڕای ئەمەش هەوڵم دەدا بەخۆمی بسەلمێنم کە ئەم لێدانی دڵە بۆ هەمیشە بەردەوام نابێ، بەڵام بێهوودە سپێدە نزیک بووەوە و هاتمە سەر ئەوەی بەخۆم بێژم چاکترین شت ئەوەیە خۆ بێ باک بنوێنم و زۆر لە خۆم نەکەم.

دەمزانی لەگەڵ سپێدەدا دێن، بۆیە شەوان نەدەخەوتم و حەزم نەدەکرد غافڵگیر بم. حەزم دەکرد هەر شتێکم بەسەر دێت ئامادە بم، بۆیە هەوڵم دەدا بەدرێژایی ڕۆژ کەمێک بنووم و شەوان بەبێداری وەمێنم.

بەوپەڕی بێقەرارییەوە چاوەڕوانی یەکەم تیشکی بەیان بووم، ناخۆشترین کاتم ئەو ساتە گومان لێکراوە بوو کە دەمزانی ئەو ڕووداوە گەورەیەی تێدا جێبەجێ دەکرێ. هەرکە نیوەشەو ڕادەبوورد، ئینتیزارم دەکرد، چاودێری بچووکترین سرتە بووم، هەرگیز لە یادم نییە کە گوێچکەم ئەم هەموو سەروسەدا سەیرەی هەڵمژیبێ، دەتوانم بڵێم لە تەواوی ئەم ماوەیەدا زۆر بەختیار بووم. چونکە گوێم لە دەنگی پێی هیچ کەسێک نەبوو.

دایکم هەمیشە دەیگوت ئادەمیزاد بەردەوام بەدبەدخت نییە، لەنێو زیندانەوە بەدەم چاوەڕوانی سپێدەوە ئەو قسەیەی دایکم دەسەلماند بۆیە دەنگی پێم دەژنەوت و هێشتا گوێم لە دەنگی دڵم بوو، هەناسەی خۆم دەبیست و ئاواتەخواز بووم شەو و ڕۆژێکی دی بژیم، بەڕۆژەوە لەگەڵ بیری داواکردنی بەخشیندا دەژیام. وام حسێب دەکرد کە چاکترین کەڵکم لەم بیرە وەرگرتووە. شتەکانی خۆم ورد دەکردەوە و دەگەیمە چاکترین ئەنجام. هەمیشە دەمگوت ئەو پەڕەکەی داواکەم ڕەت دەکرێتەوە. کەواتە دەمرم، ئەمە بەڵگە نەویستە، بەڵام هەموو کەس دەزانن ژیان هێندە بەنرخ نییە مرۆڤ بیەوێ بژی، ژیان ئەوە ناهێنێ بژی و هەمیشە بمێنێ. ئەوەشم بەلاوە ئاشکرا بوو کە مردن لە سی ساڵیدا یان لە حەفتا ساڵیدا وەک یەکە و چ جیاوازییەکی نییە. چونکە لەو ماوەیەدا هەزاران پیاو و ژنی دی دێنە دنیاوە و دەژین و ئەم بەرنامەیە هەزاران ساڵ دووبارە دەبێتەوە و دەبێتەوە. ئەمە شتێکی ئاشکرایە، ئەوەی دەمرێت هەمیشە هەر منم، جا ئێستا بێ یان بیست ساڵی دی. بەڵام ئەوەی تۆزێ بیرکردنەوەی هەراسان دەکردم ئەوە بوو لەو کاتەدا، ئەو بیست ساڵەی داهاتووم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم. بەڵام هەوڵم دەدا ئەو کارانەی کە دەمتوانی لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا ئەنجامیان بدەم، لە بوونی خۆمدا بیان خنکێنم. ئادەمیزادێک کە

دەبێ بمرێ ئیدی ئەم شتانە چ چەمکێکیان هەیە و چ پێویست بوو بزانم ئەم مەرگە چۆن و کەی ڕوو دەدات.

هەقم بوو لەم ساتە ناسکەدا بیر لە چارەنووسم بکەمەوە و ماوەم بەخۆم دەدا کە مەسەلەی مردن لە مێشکی خۆمدا شی بکەمەوە و بڵێم لەوانەیە بم بەخشن. لە ئەنجامی ئەم بیرە تازەیە و لە خۆشحاڵیدا فرمێسک لە چاوانم قەتیس دەما. پێویست بوو هەوڵ بدەم ئەم دەنگە لە دڵی خۆمدا خامۆش بکەم. بۆ ئەوەی بتوانم خۆم ڕازی بکەم و خودی خۆم بەرز بگرم پێویستە بەلای کەمەوە ئەو بیرە لە خۆم دوور بخەمەوە. خۆ ئەگەر بشم بەخشن ئەوپەڕەکەی ساتێکی دی ئاسوودە دەبم، ئەمەشیان جێی دوودڵی بوو، جا لە ساتێکی وەهادابوو، جارێکی دی چاوپێکەوتنی کەشیشەکەم ڕەت کردەوە.

ڕاکشابووم، دەمەو ئێوارێ بوو، تەماشای ئاسمانم دەکرد. هەستم بەبزووتنی خوێنی نێو دەمارەکانی لەشم دەکرد. پێویستم بەبینینی کەشیش نەبوو، ماوەیەکی زۆر بوو، بۆ یەکەم جار بیرم لە ماری کردەوە. دەمێ بوو نامەی بۆ نەنووسیبووم، ئەو شەوە ماوەیەک کەوتمە ئەم بیرەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم: ڕەنگە هیلاک بووبێ و نەیەوێ دۆستی کابرایەکی مەحکوم بەمەرگ بێ، ئەو ختوورەیەشم بەدڵدا هات کە ڕەنگە نەخۆش بێ یان مردبێ، ئەمە لە سروشتی شتەکاندا بوو، ئەگینا من لە کوێ دەزانم کە ڕەنگە لە ئەنجامی ڕووداوێکدا لەو جیا ببمەوە و چ شتێ بووە هۆی ئەوەی کیژێک کە هەرگیز نەم دیبوو ئەم جۆرە نزیکییە لە گەڵ مندا پەیدا بکات. لەو ساتەوە ئیدی ماری و یادی ماری بەلای منەوە گرنگ نەبوو، بەشتێکی ئاساییم دەزانی، چونکە دڵنیا بووم هەموو خەڵکی من فەرامۆش دەکەن و چ کارێکیان بەکاری منەوە نابێ، دەتوانم بڵێم تەنانەت ئەم بیرانەش بۆ مێشکم سەخت نەبوون.

لەم کاتەدا کەشیشەکە هاتە ژوورەوە. کە چاوم پێی کەوت تەزوویەکم پێدا هات، ئەویش هەستی بەمە کرد و گوتی: مەترسە. پێم گوت دەتوانی کاتێکی دی بێیتە دیدەنیم. وەڵامی دایەوە کە هاتنی ئەمجارە تەنیا دیدەنی و سەردانێکی دۆستانەیە و پێوەندی بەحوکم دانەکەمەوە نییە.

لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشت، داوای لێ کردم کە لە تەنیشتییەوە دابنیشم، بەقسەیم نەکرد بەڵام وێڕای ئەوەش هیچ خۆی تێک نەدا و میهرەبان دەهاتە بەرچاو، ماوەیەک دانیشت. سەری داخستبوو. تەماشای دەستی خۆی دەکرد. دەستەکانی ناسک بوون. بەڵام لەبەر چاوی مندا دوو دڕندەی سامناک بوون. بێدەنگییەکەی بەئەندازەیەک درێژەی کێشا، کە لەبیرم نەمابوو. لەپڕ سەری هەڵبڕی و نیگایەکی تێ بڕیم و گوتی: بۆ ناتەوێ بێمە دیدەنیت؟ وەڵامم دایەوە چونکە باوەڕم بەخوا نییە.

ویستی بزانێ ئایا دڵنیام لەوەی گوتم، من هەرگیز ئەم پرسیارەم لە خۆم نەکردووە. بۆیە ئەم پرسیارە بەلای منەوە چ بایەخ و نرخێکی نییە.

کە ئەم قسەیەی بیست، کشایەوە دواوە و پشتی بەدیوارەکەوە دا، دەستەکانی بەبێ جووڵە خستبوونە سەر ئەژنۆی و بێ ئەوەی تەماشای من بکات وەک یەکێک بۆ خۆی بدوێ گوتی: هەندێ جار مرۆڤ وا دەزانێ دڵنیایە، بەڵام لە ڕاستیدا بەهەڵەدا چووە.



وەڵامم نەدایەوە. تەماشایەکی کردم و پرسی: تۆ چ دەڵێی؟

گوتم: ڕەنگە وابێ، بەهەرحاڵ ڕەنگە دڵنیا نەبم لەوەی مەبەستمە، بەڵام زۆر دڵنیام لەوەی کە مەبەستم نییە.

رووی خۆی وەرگێڕا و بێ ئەوەی وەزعی خۆی بگۆڕێ لێی پرسیم ئایا قسەکانم لە ڕووی نائومێدییەوە نین. وەڵامم دایەوە بەپێچەوانەوە من بەهیچ جۆرێ نائومێد نیم تەنیا کەمێک دەترسم و ئەمەش شتێکی ئاساییە. گوتی: کەواتە خوا یارمەتیت دەدا. هەموو ئەوانەی ناسیومن و لە حاڵی ئێستای تۆدا بوون، دەگەڕانەوە لای خوا.

دانم پێدانا. هەقی خۆیان بووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە کاتیان هەبووە، بەڵام من پێویستم بەیارمەتی کەس نییە. چونکە ماوەم نییە بایەخ بەشتانێ بدەم کە بەلامەوە مەبەست نین.

لەم کاتەدا، تەکانێکی دایە خۆی، کەمێک داوێنی جلەکانی هەڵکرد، بەرەو لای من هات و بە«برام» بانگی کردم. دەمزانی کە بەم شێوەیە قسەم لەگەڵدا دەکات لەبەر ئەوە نییە کە حوکمی مەرگم بۆ بڕاوەتەوە. چونکە دڵنیا بووم هەموومان مەحکوم بەمەرگین و بچووکترین جیاوازیمان لەم ڕووەوە نییە.

قسەکەیم بڕی و گوتم پێویستم بەهیچ کەسێک نییە کە دڵم بداتەوە، چونکە مەرگ شتێک نییە قابیلی دڵدانەوە بێ.

گوتی: بەڵێ، تۆ ئەگەر ئەمڕۆش نەمری... دوایی هەر دەمریت و ئەوساش هەمان پرسیار قووت دەبێتەوە و ئەو ڕۆژە چۆن ڕووبەڕووی ئەم ئەزموونە دەبیتەوە. وەڵامم دایەوە وەک چۆن ئێستا ڕووبەڕووی دەبمەوە ئەوساش هەر وا دەبم.

هەستایە سەر پێ و ڕاستەوڕاست چاوی بڕییە چاوم، ئەمە یارییەک بوو حەزم لێی دەکرد، هەندێ جار وا ڕێک دەکەت ئەم وازییەم لەگەڵ ئەمانۆیل و سیلستدا دەکرد، ئەوان لە تەماشاکردنی من هیلاک دەبوون، چاویان دادەخست و دەیان ترووکاند.

کابرای کەشیشیش شارەزای ئەم وازییە بوو، یەکسەر تێی گەیشتم، چاوەکانی نەدەترووکاند و دەنگیشی نە دەلەرزی بەم دەقەوە پێی گوتم: کەواتە هیچ ئومێدێکت نییە و دڵنیایت کە بەتەواوی دەمریت؟ وەڵامم دایەوە، بەڵێ.

ئەوجا سەری داخست، دانیشتەوە، پێی گوتم زۆرم بەزەیی پێتا دێتەوە. من خۆم دەزانم ئەم بەسەرهاتانە بۆ ئادەمیزاد یەکجار سەخت و ناخۆشن.

هەستم کرد بەم قسانە نیگەرانم دەکات، ڕووم وەرچەرخاند و چوومە بەر پەنجەرەکە، گوێم لێ بوو دیسان دەیەوێ هەندێ پرسیارم لێ بکات ئەمجارەیان بەسەدایەکی شڵەژاو و میهرەبانەوە قسەی دەکرد، زانیم کە زۆر نیگەرانە، بۆیە پتر گوێم بۆ قسەکانی شل کرد، دەیگوت پاڕانەوە و ڕووکردنە خوای من مایەی ڕەزامەندی خوایە. بەڵام باری گوناحێکی قورس بەسەرشانمەوە بوو. دەبوو خۆمی لێ ڕزگار بکەم، بەڕای ئەو عەدالەتی مرۆڤ بایەخی نەبوو، بەڵا عەدالەتی خوا شتێکی گرنگە. پێم گوت هەمان عەدالەتی

مرۆڤە کە حوکمی مەرگی بەسەر مندا بڕیوە. وەڵامی دایەوە کە ئەم عەدالەتە ئەوەندە گرنگ نییە کە بتوانێ گوناحی تۆ پاک بکاتەوە. گوتم: نازانم گوناح چییە. ئەوان تەنیا ئەوەیان پێ گوتووم کە گوناحکارم، ئەگەر گوناحکارم دەبێ سزای گوناحی خۆم بدەم و لەوە زێدەتر چییان لێم دەوێ.

دیسان هەستایەوە سەر پێ، هەستم کرد چونکە زیندانەکە بچووکە، نارەحەت دەبێ و ناچارە وەزعی بگۆڕێ، چاوانم بڕیبووە زەوی. هەنگاوێکی بەرەو لای من نا. لە جێی خۆی وەستا وەک ئەوەی زات نەکا بێتە پێشترەوە. لە شیشەکانەوە تەماشای ئاسمانی دەکرد، ئەوجا گوتی کوڕم تۆ بەهەڵەداچوویت، بۆیان هەیە داوای شتی ترت لێ بکەن.

– داوای چی بکەن.

– لەوانەیە بیانەوێ چاکتر ببینی.

– چ شتێ ببینم.

کەشیشەکە چاوێکی بەدەوروبەری خۆیدا گێڕا، بەدەنگێکی شەکەت وەڵامی دایەوە و گوتی: من دەزانم تەواوی بەردی ئەم زیندانە دەرد و ڕەنجیان لێدەچۆڕێ. کە تەماشای ئەم دیوارانە دەکەم نیگەران دەبم. بەڵام لە کانگای دڵمەوە دەزانم کە کلۆڵترین و بەدبەختترین مردنی نێو ئێوە لە نێو تاریکی ئەم بەردانەوە ڕوویەکی پیرۆز دەبینێ، ئەو ڕووە پیرۆزە داوات لێ دەکات کە بیبینی.

بیستنی ئەم قسانە کەمێ نیگەرانی کردم و پێم گوت:

ئەوا چەند مانگێکە من بەم دیوارانەدا هەڵدەڕوانم، چ کەسێکم نەبینی کە لە مەردومی سەر زەوی خۆی چاکتر بەمن نیشان بدات. دەمێکە بۆ ڕوویەک دەگەڕێم، بەڵام ئەم ڕووە ڕەنگی ئاسمان و گڕی شەهوەتی هەیە، ئەم ڕووە، ڕووی ماری بوو، بێهوودە بۆی گەڕام، بەڵام ئێستا ئەوەش تەواو بوو. بەهەرحاڵ لە نێو ئەم بەردانەوە چ شتێکم بەدی نەکرد.

کەشیشەکە چاوە غەمگینەکانی خۆی تێ بڕیم. من لەو کاتەدا بەتەواوی پشتم بەدیوارەکەوە دابوو. تیشکی هەتاوەکە بەسەر ڕوومانا پەخشان بوو.

چەند وشەیەکی نامەفهوومی دەرپەڕاند. بەتەواوی گوێم لێ نەبوون ئەوجا داوای لێ کردم کە مۆڵەتی بدەم و لە ئامێزم بگرێ.

گوتم: نەخێر، بەوپەڕی خەمبارییەوە کشایەوە و بەدەم سەر لەقاندنەوە گوتی: کەواتە ناتەوێ ئەم دنیایەت خۆش بوێ؟

ماوەیەک بوو پشتی تێ کردبووم، هەستم دەکرد بارێکی قورسە لەسەر دڵم، ویستم پێی بڵێم تا زووترە جێم بهێڵێ، لەپڕ ڕووی تێ کردم و بەشڵەژاوییەوە گوتی: نەخێر ناتوانم باوەڕت پێ بکەم و لێم عەیانە کە ئارەزووی دیکەت لە دڵدا هەن. گوتم: بێگومان وەتۆیە، بەڵام بەڕاستی هەرگیز ئارەزووی دەوڵەمەندبوون یان ژیانێکی بەرخوردارتر ناکەم.

لێی پرسیم: ئەو ژیانە نوێیەی کە تۆ پێشبینی دەکەی چۆنە؟



– ژیانێکی نوێی ئەوتۆیە کە دەتوانم خۆمی تێدا بدینمەوە و بناسم.

ئەوجا بەتەمەڵییەوە گوتم بەسە و ئیدی ناتوانم قسان بکەم.

دیسان دەی ویست دەربارەی خوا قسانم لەگەڵدا بکات. بەڵام من لێی نیزک بوومەوە و گوتم هەرچییەک بڵێ زیادە و بێهوودەیە. چونکە من هێندەم ژیان لەبەردەمدا نەماوە و نامەوێ ئەم ماوە کەمە بەناسینی خواوە بەفیڕۆ بدەم. هەوڵی دا قسەکانی بگۆڕێ. لێی پرسیم باشە بۆچی لەبری ئەوەی بەبابە گازم بکەیت بەکاک بانگم دەکەیت؟ ئەم پرسیارە تووڕەی کردم. پێم گوت تۆ بابی من نیت. گوتی: نا کوڕم چونکە تۆ نابینایت و ڕاستییەکان نابینی، ئامادەم دوعای خێرت بۆ بکەم و لە خوا بپاڕێمەوە کە بت بەخشێت.

نازانم چی بوو، وەک بڵێی شتێک لە دڵمدا تەقییەوە. بەتووڕەییەوە دەستم بەهاوار کرد. بەڕادەیەک جنێوم پێی دا کە نەخەڵەتابێ بۆ من بپاڕێتەوە و نوێژم لە پێناودا بکات. یەخەیم گرت و بەتووڕەییەوە دوا خەم و پەژارە و نەفرەتی خۆمم بەسەر ئەودا هەڵڕشت، بەڵام ئەو لە جێی خۆی نەبزووت، وەکو جەستەیەکی بێ گیان وێستا و بەچاوێکی پڕ لە بەزەییەوە تەماشای ڕەفتاری شێتانەی منی دەکرد. بەڵام من چم نەدەزانی، دڵنیا بوو کە ئەوەی دەیکەم ئارەزووی ویژدانە و دڵنیا بووم لە ژیانی خۆم و لەو مەرگەی کە لێم نزیک بوو، بەڵێ، لەوە زیاترم نەبوو، بەڵام بەلای کەمەوە سەرە داوی ئەم ڕاستییەم بەدەستەوە گرتبوو کە لەسەر هەق بووم. هێشتاش هەر لەسەر هەقم. هەمیشە لەسەر هەق بووم و بەو جۆرە ژیاوم. دەمتوانی بەجۆرێکی دی بژیم، ئەمەم کرد، ئەوەم نەکرد. ئەمەم نەکرد، شتی دیم کرد. وەک بڵێی بەدرێژایی کات چاوەڕێی ئەم چرکەیە و ئەم سپێدەیە بووم کە پاکانەیەکە بۆ بوونم. چ شتێک بەلامەوە بایەخی نەبوو. چاکیش دەمزانی بۆ، ئەویش دەیزانی بۆ. لە ناخی پاشەڕۆژمەوە بەدرێژایی ئەم ژیانە ناماقووڵەی بەڕێم کرد شێی تاریکی بەرەو ژوور بەرز دەبووەوە. لەو ساڵانەوە دەهات کە هێشتا نەهاتوون. ئەم شێیە، ئەم شنەیە، ئەوەی بۆ ساغ دەکردمەوە کە چ شتێک لەم ژیانەی کە دەژیام ڕاستەقینەتر نییە. مەرگی خەڵکان بەمن چی. مەرگی دایکێک بەمن چی. چ مەبەستێکم بەخوا هەیە. ئەو ژیانانەی هەڵدەبژێردران، ئەو چارەنووسانەی هەڵدەبژێردران بەمن چی. مادام دەبوو یەک چارەنووس هەڵم بژێرێ لەگەڵ ملوێنان بەختەوەری دیدا وەک بڵێی برامن؟ تۆ بڵێی تێ گەیی بێ؟ هەموو بەختەوەر بوون ڕۆژێ دێ هەموو هەر حوکم دەدرێن. ئەویش حوکم دەدرێ. چ قەیدییە. چی تێدایە ئەویش بەتاوانی کوشتن لە سێدارە بدرێ. لە مەرگی دایکیدا نەگرێ؟ سەگەکەی سالامانۆ لە نرخی ژنەکەیا بوو. چ قەیدییە کە ڕایموند هاوڕێم بوو، وەکو سیلست کە ئەمیان لەو چاکتر بوو؟ چ قەیدییە ئەگەر ئەوڕۆ ماری لێوی ماچ بە«مەرسۆ»یەکی دی بسپێرێ ئایا ئەویش حوکمی مەرگی بۆ نەبڕابووەوە. هەستی بەم چارەنووسەی کە بۆ من سازکرابوو دەکرد؟

هەموو ئەوانەم دەگوت و خەریک بوو بخنکێم. لەم کاتەدا پۆلیسەکان هاتنە ژوورەوە و کەشیشەکەیان لە دەست ڕزگار کردم. هەڕەشەیان لێ کردم. بەڵام کێشەکە هێوری کردنەوە و ماوەیەک بەبێدەنگی تێی ڕوانیم چاوەکانی تەژی ڕوندک بوون. ڕووی وەرگێڕا و چووە دەرێ. کە ئەو ڕۆیی هێدی بوومەوە. هێندە

هیلاک بووم بەبێ حاڵی لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشام. وا بزانم زۆر نووستم. چونکە کاتێ کە هەستام ئەستێرە بەئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. دەنگە دەنگی دەرێ دەهاتە گوێم. لە ناو جەرگەی شەوەوە زەنگی کلێسا بەرز بووەوە. ئەم زەنگانە چ نرخێکیان بەلامەوە نەبوو جاری سەرەتای کۆچێکیان دەدا ئیدی بۆ هەمیشە تێیدا خەمسارد بووم. دوای ماوەیەکی زۆر، بۆ یەکەم جار یادی دایکم بیر کەوتەوە، ئەوەم هێنایە یادم کە ژیانێکی ئاسوودەی لە دووری من هەبوو. ئەویش لە سەرەمەرگدا هەستی بەئازادی دەکرد و خۆی بۆ ژیانێکی نوێ ئامادە کردبوو. کەس مافی نەبوو بۆی بگری. منیش مافم نەبوو بۆی پەشێو و خەمبار بم. هەستم دەکرد ئامادەم کە لە ژیانێکی نوێدا و لە هەموو شتێکی تازەدا بژیم. وەک بڵێی ئەم تووڕەیییە لە شەڕ و خەراپە پاکی کردمەوە، هەستم کرد، لەبەردەم ئەم شەوە پڕ لە ڕاز و بەئەستێرە ڕازاوەیەدا بۆ یەکەم جار بەسەر خەمساردی دنیادا دەکرێمەوە. هەستم کرد کە خۆشبەخت بووم. هێشتا خۆشبەختم. بۆ ئەوەی کەمتر هەست بەتەنیایی بکەم، ئەوەم بۆ مابووەوە کە خۆزی بخوازم خەڵکانێکی زۆر لە ڕۆژی خنکاندنەکەمدا ئامادە بن و هاواری پڕ لە قین و قێزهاتنەوەی خۆیانم بەسەردا هەڵڕێژن.

١٩٨٢/٢/٢١-١٧

نیۆزەنگ



نووسینی: پییر لویس ڕی

# لێکدانەوەیەک لەمەڕ نامۆ

## پێشەکی

بڵاوەخانەی گالیمار، لە ١٩٤٢/٧، چیرۆکی نامۆی ئەلبێر کامۆ-ی لە فەرەنسای داگیرکراودا بڵاوکردەوە. هەرچەند جەماوەری خوێنەران نووسەری ئەم بەرهەمەیان نەدەناسی، بەڵام بەرهەمەکە هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا ناوی دەرکرد و پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا. هەڵبەتە وەزع و حاڵ و ڕەوشی سەردەمەکەش دەوری گەورەی هەبوو لەم سەرکەوتنەی چیرۆکەکەدا: گیروگرفتی دارایی بڵاوکەرەوەکان و سانسۆری داگیرکەرانی نازی و حکوومەتە دەستنیژەکەی نازییان، کارێکی وای کردبوو کە بەرهەمی ئەدەبی لە سنوورێکی یەکجار تەسکدا بڵاو ببێتەوە، ئەمەش ببوە مایەی ئەوەی خوێنەران بەپەرۆشەوە بەدوای ئەو بەرهەمانەدا بگەڕێن کە لە دەرێی بازنەی بانگەشەی ڕەسمیدا بڵاودەبوونەوە. بەڵام (٣٠) ساڵ پاش یەکەم بڵاوبوونەوەی نامۆ، خوێنەران هێشتا هەر بەهەمان گەرم و گوڕی هەوەڵ جار پێشوازییان لێ دەکرد:

ئەم کتێبە هەمیشە لە ڕیزی کتێبە پڕ فرۆشەکانی فەرەنسا بووە. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم کتێبە وێڕای ئەوەی کە لە کات و شوێنی لەباردا بڵاوبووەتەوە، بایەخی دیکەشی بووە.

بایەخێکی دی ئەم کتێبە ئەوە بووە کە پێشڕەوی کۆمەڵێک بەرهەمی مەزن بووە. ئەو شۆرەتەی کامۆ لە دوای ئەم کتێبە پەیدای کرد، کارێکی وای کرد ئەو کەسانەی لە هەوەڵێرا گوێیان بەنامۆ نەدابوو، بایەخێکی تایبەتی پێ ببەخشن، خەڵاتی نۆبڵەکەی کە ساڵی ١٩٥٧ وەری گرت و مەرگە ناوەختە و کارەسات ئامێزەکەی لە ساڵی ١٩٦٠ دا، کردیانە کارێ کە کامۆ ببێ بەپەیکەر و کەسایەتییەکی مەزن و لە گۆڕان نەهاتوو. ئەمڕۆکە بەرهەمەکانی کامۆ لە ڕوانینی خوێنەرانەوە وەکو چەند قۆناغێک دەنوێنن کە نیشانەی ڕێگەی سەرکەوتن ئامێز و کارەسات ئامێزن... ئەم بۆچوونە خۆبەخۆ، خۆی بەسەر خوێنەردا دەسەپێنێ بۆیە نامۆ یەکەمین نیشانەیە. ڕەخنەگران، تەنانەت ئەو کاتانەش کە دەیانەوێ بەرهەمی ئەم نووسەرە لە ئەفسانە هەڵاوێرن، دیسان ناتوانن بەبێ حوکمی پێشوەختە بڕواننە نامۆ و هەڵی سەنگێنن: چونکە هەمیشە ڕیزە بەرهەمێکی وەکو ئەفسانەی سیزیف، مرۆڤی یاخی، تاعون و سقوتی بەدوادا دێ.

دیارە خۆدزینەوە لە بەرهەمەکانی پاش نامۆ، کارێکی هێندە نەشیاو و دەستکردە وەکو ئەوەیە بێی تەنیا لە ڕێگەی نامۆوە، نامۆ لێک بدەیتەوە.

نامۆ، کە یەکەمین بەرهەمی زنجیرە بەرهەمێکی نێودارە، قەواڵەیەکە دەربارەی قۆناغێک، سەبارەت بەجۆرە ژیانێک و جۆرە دیدوبۆچوونێک، بەڵام بایەخی ئەم بەرهەمە، لە بایەخی قەواڵەیەک پترە. گاییتان پیکون لە کتێبی (ئاسۆی ئەدەبیاتی نوێی فەرەنسا)دا دەربارەی نامۆ دەڵێت: (ئەگەر چەند سەدەیەکی پاش ئێستا، تەنیا ئەم ڕۆمانە کورتە وەکو بەڵگەنامەیەک دەربارەی مرۆڤی سەردەمی ئێمە بمێنێ، ئەوا خەڵکی ئەو سەردەمانە، زانیاری تەواویان لەمەڕ ئێمە دەبێت.)

لەشایەتی نەوەی پێشووی ئەم سەدەیەی ئێمەوە ئەوە دەبینرێ کە چۆن لاوە وجوودییەکان پاش جەنگ، هەستیان بەوە کردووە کە بەرهەمەکەی کامۆ پێوەندی بەوانەوە هەیە، واتا خۆیان تێدا بینیوەتەوە. وەکو چۆن هەستیان دەکرد کە (هێڵنج) و (ڕێگاکانی ئازادی) پێوەندییان بەوانەوە هەیە.

بەڵام دیسانەوە پاش موتاڵا و خوێندنەوەی نامۆ، هەست بەوە دەکرێت کە بۆ تێگەیشتن لە مەسەلە قووڵ و گشتییەکانی کارەساتی مەرسۆ، پێویست بەوە ناکا سەری چاخانەکانی (سانت جەرمین دی پریس) یا کەنارەکانی جەزایر بدرێ. نامۆ، وەکو (رینیە)ی شاتو بریان، لەبەر ئەوەی ڕەنگدانەوەیەکی وردی قۆناغێکە و هەروەها لەبەر ئەوەی دەرەقەتی ڕەنگ پێدانەوەی ورد و دروست هاتووە، زۆر لە سەردەمی خۆی هێوەتر دەڕوات.

گەر ئەم قەواڵەیە (سند) بەکارێکی مەزن بێتە هەژماردن، بێگومان بەهۆی هونەری کامۆوەیە. بەرهەم نە بەنەبوونی پەیامێکی دیار و سەرنجڕاکێش و نە بەپەیڕەوکردنی شێوەیەکی بێ کەموکوڕی دەربڕین و زمان دەبێتە شاکار، بەڵکو دەبێ ڕوو بکاتە کەشفکردن و دۆزینەوەی شێوەیەک کە بەتەرزێکی ئارمانجدار مەبەست بەدەستەوە بدات. کامۆ نەهاتووە قاڵبی نوێ بۆ چیرۆکنووسین دارێژێ، بەڵکو چونکە گوتاری نوێی پێ بوو، ئیدی خۆبەخۆ ئاوازێکی نوێی دۆزییەوە و ئەمڕۆ نامۆ، بەڕای هەموو ڕەخنەگران، بەپایەی



قۆناغێکی بنەڕەتی مێژووی چیرۆکنووسی فەرەنسا دەژمێردرێ.

با قسەیەکیش لەمەڕ ئەم ڕەخنەیە بکەین:

برایان. ت. فیچ لە ساڵی ١٩٤٨دا لە چاپی دووەمی (حیکایەتخوان و ڕووداو لە نامۆدا) نووسیبووی، (هەق وایە لە خۆ بپرسین: ئایا هەر قسەیەکی بەجێ کە ئەمڕۆ دەربارەی نامۆ دەگوترێ، پێشتر نەگوتراوە؟ ئایا ڕووبەڕووی ئەم خەتەرە نین کە شتی گوتراو کاوێژ بکەینەوە و بەهەزار زەحمەت هەندێک دەرگا بکەینەوە کە پێشتر خەڵکانی دی کردبێتیانەوە؟ بێگومان مونتاژکردن و لێکدانی کۆمەڵە ڕەخنەیەک، سوودی حاشاهەڵنەگر دەگرێتە خۆ.) من جگە لە چەند شتێکی زۆر لاوەکی، چ ڕوونکردنەوەیەکی تازەم لەمەڕ نامۆ بەدەستەوە نەداوە. هەروەها بەتەمای ئەوەش نیم کە کۆمەڵێک ڕەخنە مۆنتاژ بکەمەوە کە برایان. ت. فیچ ڕۆڵێکی پڕ سودی لەو بوارەدا گێڕاوە. وێڕای بەسوودی ئەم زنجیرە بەرهەمە لەمەڕ کامۆ، برایان، ت. فیچ لە کاتی بڵاوکردنەوەیاندا لە گۆڤاری ئەدەبیاتی نوێدا بەپێی زەوق و سەلیقەی خۆی هەڵی بژاردوون و خوێندوویانییەتەوە. چونکە ئارمانجی من تەنیا ئەوەیە کە بیرو بۆچوونی جیاواز و پەراگەندە لە نامیلکەیەکی تایبەتی و نزیکە دەستدا کۆ بکەمەوە، داوای لێبووردن دەکەم کە ناوی هەموو ئەو لێکۆڵەرەوانەم نەهێناوە کە سوودم لێ وەرگرتوون و بۆ ئەوەی ئەم نووسینەم درێژە نەکێشێت، بەشێوەیەکی زۆر کورت و خێرا ئاماژەم بۆ وەرگرتنەکان (اقتباس) کردووە. خوێنەر بەخۆی کە چاوی بەلیستی ناوی ئەو لێکۆڵەرەوانە دەکەوێ کە لە پێڕستی سەرچاوەکاندا ناویان هێنراوە، باشتر پەی بەقەرزارباری ئێمە سەبارەت بەوان دەبات.

## پێکهاتەی نامۆ

گەر سەرنجی دەفتەرچەی یاداشتەکانی کامۆ بدرێت تا ڕادەیەک بەئاسانی ئەوە بەدیار دەکەوێت کە چۆن نامۆی نووسیوە. پرۆفیسۆر کاستاکس لە کتێبی (کامۆ و نامۆدا) بەوردی ئەم پێکهاتەی (تکوین) نیشان داوە و ئێمە لێرەدا تەنیا ئاماژە بۆ قۆناغە سەرەکییەکانی ئەو پێکهاتەیە دەکەین.

بەپێی یاداشتنامەیەک بیرۆکەی ئەم چیرۆکە بۆ ساڵی ١٩٣٧ دەگەڕێتەوە.

کامۆ لەو یاداشتنامەیەدا نووسیوێتی: (چیرۆک: چیرۆک، پیاوێک نایەوێت کارەکانی خۆی بشارێتەوە و پاکانەیان بۆ بکات. بیرکردنەوەی خەڵکی سەبارەت بەو، خەمی ئەو خۆیەتی. کابرا دەمرێت و بەم جۆرە تاقە کەسێکە کە ئاگای لە حەقیقەتی خۆی هەیە، بێهوودەیی ئەم دڵخۆشییە). یا لە شوێنێکی دیدا نوسیویەتی: (کابرایەکی مەحکوم بەئیعدام کە هەموو ڕۆژێک کەشیشێک دەچێتە دیدەنی، بەهۆی گەردنی بڕاو، ئەژنۆی چەماو ئەو زارەی کە دەیەوێ ناڕەزایی دەربڕێت بەجۆرێکی سەیر بەرەو زەوی دادەکشێت تا لەبەردەم گوتنی خوایە، خوای مندا، پەنهان بێت!) هەر جارەی جۆرە مقاوەمەت و بەرەڤانییەک لەم پیاوەدا دەردەکەوێ. چونکە خوازیاری ئەم بێ موبالاتی و تەساهولە نییە و دەیەوێت بەتەواوی هەست بەترسی خۆی بکات و بیجەڕبێنێ. بێ ئەوەی زار هەڵێنێت تاقە ڕستەیەک بڵێت،

دەمرێت، بەڵام چاوەکانی تەژی ڕوندک دەبن (١٩٣٧/٦). بەڵام لە یەکەم جاردا وا دێتە بەرچاو کە ئەم یاداشتنامەیەی مانگی ١٩٣٧/٨ کەمتر پێوەندی بەپێکهاتی نامۆوە هەیە: پیاوێک کە بەدووی ژیاندا عەوداڵە، بەخۆی لە هەمان شوێندایە کە بۆ ژیان گەڕاوە (ژن هێنان، جۆری کار...هتد) بەڵام لە پڕا و لە ئەنجامی خوێندنەوەی نامیلکەیەکی مۆد و باودا بۆی دەردەکەوێت کە چەند لە ژیاندا نامۆ بووە. ژیان بەو شێوەیەی نێو نامیلکە مۆدەکە مایەی سەرنجە.)

بەشی یەکەم: ژیانی پیاوەکە تا ئەو دەمە.

بەشی دووەم: یاری.

بەشی سێیەم: دەستبەرداربوونی چارەسەرە کۆمەڵایەتییە ماقووڵ و بەجێیەکان و تاقیبکردنی حەقیقەت لە خودی خوددا.

هەڵبەتە کامۆ بەخۆیشی گوتوویەتی کە یەکەم هەوێن و ناوەڕۆکی ئاگایانەی نامۆ ئەوەیە. ناوەڕۆکی یارییەکەش لە زۆربەی یاداشتنامەکانی ئەو سەروبەندەدا دەبینرێت.

لە مانگی ١٩٣٧/٧دا نووسیویەتی: (بۆ چیرۆکی یاریکەر).

هەروەها لە دەستنووسەکەی کالیگۆلاشدا و ڕێک لەژێر عینوانەکەیدا وشەی (یاریکەر) نووسراوە. لە ڕاستیدا ئەم ناوەڕۆک و هەوێنە لە سەرانسەری نامۆدا دەبینرێت و مایەی سەرنجە. هەڵبەتە بەشێوەیەکی نێگەتیف: مەرسۆ کەسێکە کە بەیاری و گەمەی کۆمەڵایەتی قایبل نابێت. کامۆ لە ساڵی ١٩٣٧دا بیر لە چیرۆکێکی دی دەکاتەوە و پاشان ناوی نا (مەرگی خۆش) و هەرگیز ئەم چیرۆکە تەواو ناکات. قارەمانی سەرەکی ئەم چیرۆکە ناوی (مەرسۆ) کە بەمانای دەریا و هەتاو دێ، بەگوتەی کامۆ. خۆ دەگرێتە خۆ. ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکە لە مانگی ١٩٣٧/٨دا دەخەملێ و دەمەیێ: (دەبێ یاری و ژیان ئاوێتە بکرێن) قەرار بوو دوا فەسڵی بەشی یەکەمی چیرۆکەکە بەم دەستەواژەیە کۆتایی بێت: (دابەزین بەرەو هەتاو و مەرگ خۆکوژی... مەرگی ئاسایی-) لە پرۆژەیەکی تێروتەسەلی تری هەمان بەراورددا ئەگەری لێکچوون لەگەڵ (نامۆدا) پتر دەبێت:

(مەرگی دایک) یا (گەڕەکی هەژارنشین- دایک) یا (ماڵێکی لەبەرچاوان- ستێران). هەڵبەتە هەموو ئەم مەبەست و بابەتانە ناکەنە بەڵگەی ئەوەی کە بتوانرێت: (نامۆ بەدوا گۆڕان و پەرەسەندنی - مەرگی خۆش- لە قەڵەم بدرێت). (مەرگی خۆش) وەکو چیرۆکێکی ناتەواو دەمێنێتەوە و (نامۆ) دەبێت بەچیرۆکێکی دی.

هەندێک لە نووسینی نێو یاداشتنامەکانی کامۆ جار جارێ دەقاودەق لە نامۆدا دووبارە دەبنەوە. هەندێ لەم تێبینی و سەرنجانەی ناو یاداشتنامەکان بۆ چیرۆکی (مەرگی خۆش) و هەندێکی تری بۆ بەرهەمی دیاری نەکراوی دی هاتوونەتە تۆمارکردن، بەشێکی دی ئەم سەرنجانە ئەوە دەردەخەن کە کامۆ حەزی کردووە دیدوبۆچوون و هەندێ دیمەن تۆمار بکات بێ ئەوەی مەبەستی سوود لێ وەرگرتنیش بووبێت. بۆ وێنە: (گەنجێک کە ئومێدی دوارۆژێکی باشی بۆ دەکرا، هەنووکە لە دایەرەیەکدا کار دەکات،



چ کارێکی دی ناکات، دەگەڕێتەوە ماڵێ، ڕادەکشێت و بەدەم چاوەڕوانی ئێوارەوە جگەرە دەکێشێت. دووبارە ڕادەکشێتەوە و تا سبەینێ دەنوێت. ڕۆژانی یەک شەممە درەنگانێ لە خەو ڕادەبێت و لەبەر پەنجەرە ڕۆدەنیشێت، خۆی بەتەمەشای باران یا هەتاو یان ڕێبوارانەوە مژول دەکات یا بەبێدەنگییەوە مژول دەبێت، سەرانسەری ساڵ بەو جۆرە دەقەتێنێت - لە چاوەڕوانی دایە- چاوەڕوانی مردن- هیوا و ئومێد بەکەڵکی چی دێن؟ مەگەر هەر ئەوە نییە کە...) لە جێیەکی دیدا و پاش سەردانی خەستەخانەی مارینگۆ، دەنووسێت: ئەو پیرەژنە کە لە خەستەخانەکەدا دیتم دۆستەکەی، واتا ئەو دۆستەی کە پیرەژنەکە لە ماوەی سی ساڵاندا گرتبووی بۆی دەگریا (چونکە ئەم دۆستە چ کەسێکی دی نەبوو).

دەرگاوانێکی پاریسی و پزیشکێکی یاسایی لەگەڵ ژنەکەیدا لەوێندەر دەژیان، یا لەجێیەکی دی: (بل کدر) چیرۆک (کە لە نامۆدا دەبێ بەریمون سنتسی) لەگەڵ ژنێکدا بووم بەئاشنا، بەناو دۆستم بوو هەستم کرد کە فێڵ و دەهۆیەک لە گۆڕێیە: چیرۆکی بلیتی یانەسیب (...) بۆچی تاقێک کار ناکەی؟ دەربارەی ئەم شتە کەم بایەخانە دەتتوانی ببیتە مایەی ئاسوودەیی من. من دەستێک جلکم بۆ کڕیت. ڕۆژی (٢٠) فرانکت وێ دەدەم. کرێی خانوەکەت بۆ دەدەم کەچی تۆ پاش نیوەڕوان لەگەڵ دۆستەکانت قاوە دەخۆیتەوە -قاوە و شەکریان دەدەیتێ. من پارە بەتۆ دەدەم. من چاکەت لەگەڵ دەکەم کەچی تۆ پێی نازانی...)(هەقی خۆیەتی ئەم نووسینە لەگەڵ بابەتەکانی نێو نامۆدا بەراورد بکرێت) لە نووسینێکی ئاخرو ئۆخری ساڵی ١٩٣٨دا بابەتێک بەرچاو دەکەوێ کە (٥) دێڕی یەکەمی چیرۆکی نامۆ پێک دێنێت: (ئەمڕۆ دایکە مرد...) لە نووسراوێکی تری هەمان قۆناغدا هەندێک بیرۆکە بەرچاو دەکەوێت، باسی بێزاری کەسێکە کە لە ئەنجامی یەقین پەیداکردنی کابرایەکی مەحکوم بەئیعدامەوە هەڵدەقوڵێت...

(لە حەقیقەتدا ڕەگەزێکی بیرکارییانەیە کە ئەم یەقینە پێک دێنێت.) سەرنجەکانی ساڵانی ١٩٣٩-١٩٤٠ کۆمەڵە تێبینییەکیان تێدایە کە بابەت و مەبەستە لاوەکییەکانی (نامۆ) پێک دێنن: شەڕی کۆڵان کە لەوێدا شێوەزاری کاگایوەکان بەکاردەهێنرێت (کاگایو شێوەزاری عەوامانەی ئەوروپاییەکانی جەزایرە، شێوە ئاخافتنی ڕایموند سنتس بەم زارەیە). یان نەخشەی هەندێک لە قارەمانەکان دادەڕێژرێت (پیرەمێرد و سەگەکەی) هەشت ساڵ کەرب و کینە و دوژمنایەتی، ئاشکرایە کە مەبەست لە سالامانۆیە). ئەوەکەی دی و وێردەکەی سەر زمانی: (ئەو پیاوێکی گەلەک چاکە، بگرە ناسکە پیاوە) بێگومان لێرەدا مەبەست لە ماسون-ە.

ئەم چیرۆکە لە مانگی ١٩٤٠/٥دا تەواو بووە (لەم قۆناغەدا فەرەنسا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە داگیرکرابوو) و دوو ساڵ پاشتر واتە لە ١٩٤٢/٦دا بڵاوبووەوە.

بەم پێیە بۆمان بەدیارکەوت کە چۆن نامۆ لە هزر و بیری کامۆدا خوڵقاوە و یەکەمین بیرۆکەی بە چ شێوەیەک گەشەی کردووە. گریمانی کاریگەری ژیانی کامۆ و ئەو ڕووداوە سەرەکییانەی کە لەم ماوەیەدا دیتوونی لەسەر پێکهاتی نامۆ، گیروگرفتی زیاتر دروست دەکات. بۆ وێنە ئیعدام کردنی ودمان کە لە ١٩٣٩/٦/١٦دا بەمل پەڕێن ئەنجام درا، تا چ ڕادەیەک لە دوا لاپەڕەکانی کتێبەکەدا ڕەنگی داوەتەوە؟ (ئەم ئیعدامە هەراو هەنگامەیەکی وەهای نایەوە کە بەناچاری بڕیار درا حوکم دراوان نەهێنرێنە مەیدانە

گشتییەکان و هەر لە نێو زیندانەکاندا لە نێو ببردرێن و ئیعدام بکرێن) بەشێوەیەکی گشتی پێدەچێت ئەم چیرۆکە لە کاریگەری گەلێک لەو گۆڕانکارییانەی ئەو سەردەمەی جیهان بەدەر نەبووبێت. هەندێ کەس نارەحەت بوون و دەیانگوت بڵاوبوونەوەی بەرهەمێکی ئاوها و لە گەرمەی شەڕدا، چ کاریگەرییەکی نەدەبوو جگە لە (سستکردنی ورە) و (داڕووخاندنی ڕیزی خەباتکاران).

ئێمە بۆیە ئاوڕمان لەو بیرۆکە و تێبینییە ڕۆژانانەیە نەداوەتەوە کە لە پێکهاتی نامۆدا دەوریان هەبووە، چونکە ئەم ڕۆژانە بیرۆکە و تێبینییانە ڕیشەی بەرهەمەکە لەناو ژیانی کامۆ و خەڵکانی دەوروبەری کامۆدا دەردەخەن و ئاشکرا دەکەن. سارتەر لە کۆتایی لێکدانەوەکەی خۆیدا لەمەڕ (نامۆ) ئەوە نیشان دەدات کە ئەم بەرهەمە لە حیکایەتەکانی ڤۆڵتێر دەچێت. سارتەر لەم گوتارەدا بۆچوونی خۆی وەکو خوێنەرێک دەخاتە ڕوو، تێکڕای وتارەکەی بەدەوری ئەم خاڵەدا دەسووڕێتەوە و بەڕاستی ئەم بابەتە گوتارە چ پێوەندییەکی بەپێکهاتی چیرۆکەکەوە نییە. ئەگەر بمانەوێت دید و بۆچوونێکی جیاواز لە دیدوبۆچوونەکەی سارتەر هەڵبژێرین و بڵێین کە نامۆ لە هزر و بیری کامۆدا وەڵامدانەوەی چ پێویستییەک بووە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم شوبهاندنە هیچ پایەیەکی پتەوی نییە (سادە دڵ) کە ناوی قارەمانی حیکایەتێکە بەهەمان ناوەوە، بوونەوەرێکی بێ ڕەگوڕیشە بوو، ویست و حەزی ڤۆڵتێر بەمەبەستی فێربوون و سەرگەرمی دروستی کردبوو. فەلسەفەی کامۆ بەپێچەوانەوە وا دەنوێنێت کە پێوەندی خۆی لەگەڵ واقیع و ڕووداوەکاندا نابڕێت. مەرسۆ گووراوێکی دنیای چیرۆکە و هەموو دەوڵەمەندییەکی ژیانی گرتۆتە خۆو، و ئەگەر بتوانرێ پەند و دەرسێک لە نامۆوە وەربگیردرێ، دەبێ بەوە قاییل بین کە ئەم پەند و دەرسە لێوان لێوی هەموو ئاڵۆزییەکانی واقیع و حەقیقەتە.

## نامۆ و وێکچوون

تاقیبکردن و دۆزینەوەی سەرچاوەکانی بەرهەمێکی هونەری زۆربەی کات، کارێکی پڕ خەتەر و زەحمەتە، مەگەر نووسەرەکە بەخۆی بەڕاشکاوی دانی پێدا بنێ، بۆ وێنە تا ئەو ڕۆژەی کە کامۆ خۆی لای ڕوجەر کیبوی گوتی: (ئەگەر لە نامۆدا جۆرە وەرگرتنێک ڕووی دابێ، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو بێ ئاگایانە بووە و پتر لە شێوەی بیرەوەرییەکی ئاڵۆز و نادیاردا بووە.) دەکرا بیر لەوە بکرێتەوە کە کامۆ بەلای کەمەوە لە هەڵبژاردنی ناونیشانی بەرهەمەکەی خۆیدا سوودی لە پەخشانە شیعرێکی بۆدلێر بەنێوی (نامۆ) وەرگرتووە و لەو پەخشانە شیعرە بێ ئاگا نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چ بەرهەڵستێک لە گۆڕێ نییە کە تەحقیق لەمەڕ کاریگەری نووسەرانی دی لەسەر کامۆ بێتەکرن. بەتایبەتی کە کامۆ هەرگیز دڵبەندی خۆی سەبارەت بەو نووسەرانەی کە خۆشی ویستوون نەشاردۆتەوە و بەئاشکرا ئەو دڵبەندییەی ڕاگەیاندووە.

پرۆفیسۆر کاستاکس ئەوە دەسەلمێنێ و نیشانی دەدا کە (جولین سورل)ی قارەمانی (سوور و ڕەش) لە موحاکەمەی خۆیدا وەکو مەرسۆ، نامۆ بووە، کامۆ هێندە شەیدای خوێندنەوەی بەرهەمی ستاندال بووە کە ئەم وێکچوونە ئاسایی و سروشتی دێتە بەرچاو. هەر هەمان نووسەر ئاماژە بۆ ڕاسکولینکوفای قارەمانی



(تاوان و سزا) دەکا، لە کاتێکا ئێمە دەزانین کە کامۆ چەند دوستۆفسکی بەچاکی ناسیوە، بەڵام لە ئەنجامدا ئەم تاوانە بەباڵای تاوانەکەی مەرسۆ دەگرێ. هەروەها ئاماژە بۆ کافکا و کاریگەری کافکاش لەسەر نامۆ کراوە: پرۆفیسۆر کاستاکس ئەوە بیر دەخاتەوە کە چۆن کامۆ، موحاکەمە لە تەحقیقەکەی خۆیدا خولاسە دەکات و لە ساڵی ١٩٤٣دا بڵاوی دەکاتەوە. ئەم تەحقیقە (لێکۆڵینەوەیە) لە دوا چاپی ئەفسانەی سیزیف دا وەکو پاشکۆ و بەناوی: هیوا و بێهوودەیی لە بەرهەمەکانی فرانتس کافکادا بڵاوبووەتەوە: (جوزیف کا تاوانبارە – بەڵام خۆی نازانێ تاوانەکەی چییە) هەڵبەتە حەز دەکا بەرەڤانی لە خۆی بکات، بەڵام نازانێ بۆ. لە ڕوانگە و بۆچوونی دادوەرەکانەوە بەرگری لە جوزیف کا زەحمەتە. جوزیف لەم حاڵەشدا درێغی لە ئاشقێنێ، خواردن، یا ڕۆژنامە خوێندنەوە ناکات. پاشان دادگایی دەکرێ. بەڵام هۆڵی دادگاکە گەلەک تارییە. جوزیف سەر لە مەسەلەکان دەرناکات و تەنیا بەمەزەندە هەست دەکا کە حوکم دراوە. بەڵام بەچی حوکم دراوە؟ ئەمەشی زۆر بەلاوە گرینگ و مەبەست نییە.) ئەمە خۆلاسە کردنێکە کە ڕەنگە کافکا بەخۆی ئیعترافی پێ نەکردبا، بەڵام خۆلاسە کردن خۆی لە خۆیدا جۆرە شرۆڤە و لێکدانەوەیەکە.

کامۆ، وێڕای لێکچوونی نزیکی بەرهەمەکەی کافکا و بەرهەمەکەی خۆی، بێگومان بێ پەردە بەپێوەندی نێوان ئەو دوو بەرهەمە قاییلە و بەشیاوی دەزانێ. هەر لەم بوارەدا دەکرێ بیر لە (مەسخ)یش بکرێتەوە.

حیکایەتخوانی (راوی) مەسخ دەبێ بەمێروو (حەشەرە) و حیکایەتخوانی نامۆش هەتیو دەکەوێ، هەردووکیان بیر لە یەک بابەت دەکەنەوە و ئەمە چ پێوەندییەکی بەکارەساتی ئەو دوانەوە نییە: (ناڕازی بوونی خاوەن کار لە غایب بوونیان. لەلایەکەوە کە شعوور هەموو ڕووداوە ئاسایی یان نائاساییەکان یا لە ڕادەبەدەرەکان بێنێتە یەک ئاست، ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی بێهوودەیە: بۆ نموونە لە شانۆنامەی (ئامێد)ی یونسکۆدا، وەختێ ئامێدی و ژنەکەی بەدەنێک دەبینن کە بەرەبەرە گەورە دەبێ و هەموو تەلارەکە داگیر دەکا، تەنیا (دڵگران) دەبن و بەس.

یەکێکی دی ئەوەیە کە ڕۆژی ١٩٣٨/١٠/٢٠ کامۆ، لە ڕۆژنامەی جەزایری کۆماری خوازدا، وتارێکی لەمەڕ بڵاوبوونەوەی (هێڵنج)ی سارتەر بڵاوکردۆتەوە. چیرۆکەکەی سارتەریش وەکو نامۆ بەڕاناوی یەکەم کەسی تاک نووسرابوو. ئەم چیرۆکە نیشانەی جۆرە ئاگادارییەک بوو بەرانبەر بەجیهانی بێهوودەیی– ئەم قسەیە بەو مانایە نییە کە نامۆ لاسایی کردنەوەیەکی هێڵنجە (لەلایەکی دییەوە، ئەو ڕەخنانەی کە کامۆ لە گوتارەکەی خۆیدا لە هێڵنجی دەگرێ گەلەک خەیاڵین) ئەو پەڕەکەی دەتوانرێ بگوترێ کە هەردوو بەرهەمەکە ڕەنگدانەوە و نیشانەی یەک ڕۆشنبیریی فەلسەفی هاوبەش و بیرکردنەوەیەکی لێکچوون. ئەم دوو بەرهەمە هەریەکەیان بەشێوەی خۆی ڕەنگدانەوەی یەک سەردەمن، بەڵام هەر ئەم فاکتەرە هاوبەشانە دەبنە مایەی باشتر هەستکردن و دەرککردن بەجیاوازی نێوان ئەم دوو بەرهەمە. ئەم جیاوازییانە لە بەشی لایەنە فەلسەفی و ئەخلاقییەکانی نامۆدا بەدرێژی و تێروتەسەلی دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە.

# پایەی نامۆ لە نێو بەرهەمەکانی

# تری کامۆدا

نامۆ یەکەمین بەرهەمە کە جەماوەرێکی بەرفرەی خوێنەران دەیناسن، بەڵام یەکەمین بەرهەمی کامۆ نییە. کامۆ وێڕای کۆمەڵە دەقێک کە بۆ گۆڤارێکی خوێندکارانەی نووسیون و نهۆ لەبەردەستدا نین، ئەو دەفتەری بیروباوەڕییانەی کە لە مانگی ١٩٣٥/٥وە کەوتە نووسینیان، هەروەها هاوکاری کردنی لە نووسینی (شۆڕش لە ئەستووری)دا (ئەم بەرهەمە لە بنەڕەتدا بەمەبەستی شانۆنامە نووسراوە و لەلایەن چارلوتەوە بڵاوکراوەتەوە). هەروەها نامەی خوێندنی باڵای کامۆ بەنێوی (فەلسەفەی میتافیزیکی مەسیحی و فەلسەفەی نوێی ئەفلاتوونی، لە ساڵی ١٩٣٤ یا لە ساڵی ١٩٣٥دا کەڵکەڵەی بەرهەمێکی لە مێشکدا بوو کە لە مانگی ١٩٣٧/٥ بڵاوبووەوە: ئەم بەرهەمەی بریتی بوو لە کتێبی (پشت و ڕوو) کە پێنج گوتاری گرتۆتە خۆ. ئەم گوتارانە لە ساڵی ١٩٥٨دا بەپێشەکییەکی تازە بڵاوکرانەوە و بۆ کەسێک کە گۆڕانی فیکری کامۆی مەبەست بێ، ئەم پێشەکییە بەگەنجینەیەکی یەکجار بەنرخ و بەهادار حسێب دەکرێ. کامۆ لەم پێشەکییەدا دەڵێ: (دەزانم کە سەرچاوەی من لە پشت و ڕوودایە، لەم دنیای هەژاری و نوورەدایە کە ڕۆژانێک تێیدا ژیاوم...) پشت و ڕوو کە سەرچاوەیەکی بێ وێنە و دەگمەنی هەموو بەرهەمەکانی کامۆیە، سەرچاوەیەک کە کامۆ بەتاسەوە بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بگەڕێتەوە سەری، یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە ڕەنگدانەوەیەکی تایبەتی لە نامۆدا هەیە: کارەساتی بێدەنگیی پیری و بەجێ هێشتنی پیرە دایکێک لەبن دێڕەکانیدا دەبینرێ. لەمەش پتر: هەردوو بەرهەمەکە بەهەمان سادەیی و وردی ڕای نووسەر، دنیای خەڵکی هەژار بەڵام شایستە نیشان دەدەنەوە.

کامۆ لە مانگی ١٩٤٠/٩دا بەشی یەکەمی ئەفسانەی سیزیفی نووسی، وەختێ لە بەشی یەکەمی ئەفسانەی سیزیف بووەوە، نزیکەی چوار مانگێک بوو کە نامۆی تەواو کردبوو، بەم پێیە تەسەوری ئەوە دەکرێ کە بەلای کەمەوە ئەم دوو بەرهەمە لە یەک ماوەدا خولیای نووسەر بووبن و بیریان مژول کردبێ. لە ساڵی ١٩٤٣دا کاتێ کە ئەفسانەی سیزیف دێتە بڵاوبوونەوە، ئەم دەستمایە تازەیەی نوسەری نامۆ، دەبێتە مایەی ڕەزامەندی، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەوە بەدیار دەکەوێ کە ئەم چیرۆکنووسە پتر فەیلەسوف بووە تا هەر شتێکی دی بێ.

ڕەخنەگران هەندێ جار لەبەر ڕۆشنایی ئەو نموونانەدا کە لە ئەفسانەی سیزیفدا ناوی (مرۆڤی بێهوودە)یان لێ نراوە دەڕواننە، مەرسۆی قارەمانی نامۆ.

چیرۆکەکە بەتێکڕایی، بەنموونەی پراتیکی دنیای بێهوودەیی ناسراوە و لایەنە تیۆرییەکەی لە ئەفسانەی سیزیفدا خراوەتەڕوو.

سارتەرش لە گوتارێکیدا کە لە ١٩٤٣/٢دا لەمەڕ نامۆ بڵاوی کردەوە دەڵێ: (جەنابی کامۆ لە ئەفسانەی سیزیفدا کە چەند هەیڤەک پاشتر بڵاوی کردۆتەوە تەفسیرێکی وردی لەمەڕ بەرهەمەکەی خۆی



پێ داوین). سارتەر (نامۆ) بەکارێکی تەواو سەربەخۆ دەزانێ و دەست لەسەر ئەم خاڵە دادەگرێ کە بەهیچ جۆرێ ڕۆمانێکی ئاسایی نییە. کامۆ، تا لە ژیاندا بوو چەندین جار ڕایگەیاند کە فەیلەسوف نییە- لەگەڵ ئەوەشدا پێ دەچێ بەرهەمە فەلسەفییەکانی ژیانیان لە چیرۆکەکانی دابێ؟ چونکە ڕەخنەگران دەیانەوێ چیرۆکەکانی لەبەر ڕۆشنایی بەرهەمە فەلسەفییەکانیدا هەڵسەنگێنن. هەر لەبەر ئەمەیە ئەگەر ستاندال دەیزانی ڕۆژێ لە ڕۆژان، خەڵکانێک لەبەر ڕۆشنایی ئەو کتێبە تیۆرییەی لەمەڕ ئەشقی نووسیبوو، دنیای ئاشقانەی چیرۆکەکانی داغان دەکەن، هەرگیز ئەو کتێبە تیۆرییەی نەدەنووسی.

کامۆ، لەو جۆرە نووسەرانە نییە کە کتێبێک دەنووسن تا لە چنگی وەسوەسەیەک ڕزگاربن و جارێکی دی نەچنەوە سەر ئەو وەسوەسەیە و چیدی باسی نەکەن. کامۆ لە پێشەکیی (پشت و ڕوو)دا دەڵێ: (هەموو هونەرمەندێک لە ناخی خۆیدا سەرچاوەیەکی دەگمەنی هەڵگرتووە کە بەدرێژایی تەمەن شەخسییەت و نووسینەکانی پاراو دەکات...).

هۆی بەردەوامبوونی کاری کامۆ لە بچووکترین بەرهەمیدا بەدی دەکرێ. ڕووداوی ئەو پارچە ڕۆژنامە کۆنەی کە مەرسۆ لە زیندانەکەی خۆیدا دەیدۆزێتەوە، دەبێ بەهەوێن و نێوەڕۆکی شانۆنامەیەک بەنێوی (بەدحاڵی بوون). لە تاعوندا باسی دەستگیرییەکی تازە لە گۆڕێ دایە کە لە جەزایردا دەنگی داوەتەوە و هەرا و هەنگامەی خولڤاندوە. مەسەلەی تەوقیفکردنی پیاوێکی گەنج لە گۆڕێیە، ئەم پیاوە شاگردی موغازەیەکە و لە کەناری دەریادا عەرەبێکی کوشتووە: (ژنە فرۆشیارەکە گوتی ئەگەر هەموو شەلاتیان بخرێنە زیندانەوە، ئەو دەمە خەڵکە بەڕێزەکان دەتوانن هەناسەیەکی ئاسوودەیی بدەن».

ئایا دەبێ ئەم ئیشارەتانە بەجۆرە چاوداگرتنێک لە خوێنەر بێتە هەژماردن یا مەبەستی کامۆ ئاشکراکردنی هێرشێکە بۆ سەر (ئاکاری ڕێزداران) کە لە نامۆدا پەنهانە؟

لەمە گرینگتر، بیرکردنەوەیە لە مەرگ کە سەرچاوەی هەموو بەرهەمەکانی کامۆ-ی پێک هێناوە. لە تاعوندا، تارو-ی قارەمانی چیرۆکەکە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئیعدامێکدا کە بەخۆی دیتوویەتی، ڕستەیەک بەکاردێنێ کە لە ڕستەکەی کامۆ دەچێ: (حاڵی بووم کە ئەو بەناوی کۆمەڵەوە داوای مەرگی ئەم پیاوە دەکات، تەنانەت داوا دەکات کە لە ملی بدەن.) لەم کتێبەدا ئیعدام وەکو (دزێوترین مرۆڤکوژی) نێوبراوە. پاشان وەکو دەزانین، کامۆ بەهاوکاری ئارتورکوستلر، کۆمەڵێک بیروبۆچوون لەمەڕ ئیعدام دەنووسێت (١٩٥٧).

لە نامیلکەی (هەندێ بۆچوون لەمەڕ مقصلە)دا، کامۆ بێ گوێدان بەحەساسییەتی خوێنەر، کارەساتی ئیعدامێک باس دەکات، بەڵام تەنیا ئامێری دڕندانەی ئیعدامەکە مایەی نیگەرانی ئەو نییە:

هەمان مۆرکردنی قەزایی وەکو وریاکردنەوەیەک ناڕەحەتی دەکات.

ئەو دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (بە گوتەی قازییەک، زۆربەی هەرەزۆری ئەو پیاوکوژانەی کە ئەو دیتبوونی، بەیانی لە کاتی ڕدێن تاشینی خۆدا نەیان دەزانی کە لەوەیە بۆ عەسر قەتڵیان بەملی دابێ.)

هەڵبەتە مەرسۆش لە حاڵەتێکی ئاوهادایە.

بەشێوەیەکی گشتی، هەوێنی بێ تاوانی و تاوان لە هەموو بەرهەمەکانی کامۆدا کەم و زۆر دیارە. لە تاعوندا هەیە (ئایا مرۆڤ هەقی ئەوەی هەیە خۆش بژێ، لە کاتێکا مرۆڤی دی لە ڕەنج و ئازاردا دەژین؟ ئایا دەکرێ باوەڕ بەگرووپێک لە پەیڕەوانی مەسیحیەت بکرێ کە ڕەنج بەسزایەکی دادوەرانەی گوناحێک دەزانن کە حەزرەتی ئادەم کردبووی؟ یان نا، ڕەنج و ئازار ئەنجام و ئاکامی جەبرێکی پووچە؟ هەڵبەتە هەمان تیمە و هەوێن لە کتێبی (سقوط)دا دووبارە دەبێتەوە و نێوەڕۆکی ئیعترافاتەکەی کلامانس پێک دێنێ. کلامانس چونکە ناتوانێ بگاتە کەنارەکانی ئەو بەهەشتەی کە سەراپا پاکی و بێگەردی و بێتاوانییە، بۆیە نائومێدانە یا لاسارانە پەنا وەبەر دۆزەخی تاوان دەبا. ئەم تاوانبارییە بۆ خودی ئەو پەسند و بەجێیە و سەبارەت بەخەڵکانی دی دوژمنانە و شەڕفرۆشانەیە. پێگەی مەرسۆ، کە لە بەرانبەر مرۆڤەکاندا ئاوێتەی تاوانباری بووە، هێندەی دی نامۆیی مەرسۆ خەست دەکاتەوە و لەدوا بەرهەمی کامۆدا بەدیار دەکەوێ. لە ڕاستیدا وەختێ سارتەر لە ساڵی ١٩٤٣دا نووسی: (جەنابی کامۆ دەیتوانی بۆ ناوی بەرهەمەکەی خۆی هەمان ناوی (نامۆ زادە)ی جۆرج گیسینگ هەڵبژێرێ، ڕاستی دەکرد. کامۆ پاش چواردە ساڵان کۆمەڵە چیرۆکێک بەناوی (غوربەت و وڵات) بڵاو دەکاتەوە.

مەرسۆ، کە لە نێو خەڵکیدا نامۆیە، نەلەبەری گرانە و نە پێوەی دەتلێتەوە، چونکە تا دەمی مەرگ باوەڕی بەجیهان و بەخۆی هەیە. قارەمانانی دوا کورتە چیرۆکەکانی کامۆ ناتوانن هەمان باوەڕی مەرسۆیان هەبێ. (لەبەر ئەوەی جیهان لە ئەندازە بەدەر بەرفرەو دەست و پێ گیرە یا هەستی ئەوان لە ئەندازە بەدەر بێدارە.)

قارەمانی (سقوط) لە تێگەیشتنی غوربەتی خۆیدا لە قارەمانانی نامۆ نزیک دەبێتەوە: قارەمانی (سقوط) سەبارەت بەشارەکەی، بەهاو ڕەگەزانی، سەبارەت بەشەخسییەتی تا ئێستای خۆی دوچاری نامۆیی دەبێ تا بتوانێ هەستێکی باڵای ئەوتۆ بەدەست بێنێ کە لەگەڵ خودی خۆیدا ئاشتی بکاتەوە و باوەڕ بەخۆی بێنێ، بەڵام کام خود؟

مەرسۆ، بەهۆی ڕەفزکردنی گەمەی کۆمەڵایەتییەوە لەلایەن خەڵکییەوە بەغوربەت مەحکوم کرابوو، بەڵام توانیبووی بەپاکی و نەلەوتاوی بمێنێتەوە.

کلامانس، وێڕای قبووڵکردنی گەمەی ژیان و خۆنامۆکردن، لە ترسی ئەوەی نەک لە کاروانی کۆمەڵ دوا بکەوێ، لە ڕۆڵی شعووریی بینەر و تەوسکەر کەم دەکاتەوە، بەڵام ئەم شعوورە لە هەموو حەقیقەتێک خاڵی بووەتەوە.



# کورتەیەکی نامۆ

## بەشی یەکەم

### فەسڵی یەکەم

مەرسۆ، فەرمانبەرێکی گەنجە، لە جەزایر نیشتەجێیە، لە تەمەڵخانەی مارنیگۆوە برووسکەیەکی دەگاتێ کە هەواڵی مەرگی دایکی پێ ڕادەگەیەنێ. ماوەیەک بەپاس دەڕوا (دنیا گەرمە).

پاشان بەپێ دەڕوا (تەمەڵخانەکە لە دووریی دوو کیلۆمەتری گوندایە) تەشریفات و مەراسیمی ئاسایی ئەنجام دەدرێ: دیتنی بەڕێوەبەری تەمەڵخانەکە، دیدەنییەکی پزیشکی قانونی (مەرسۆ، خۆی لە بینینی جەنازەکەی دایکی دەدزێتەوە.) ئەوجا گفتوگۆیەک لەگەڵ دەرگاوانەکەدا کە شیر و قاوە دەداتە مەرسۆ و ئەویش قبوڵی دەکا. پاشان شەونخوونی بەدیار تابووتەکەوە: دۆستانی ڕەحمەتی وەکو ئەندامانی یەک دادگا لە دەوری تابووتەکە خڕ دەبنەوە سپێدە مژدەی ڕۆژێکی خۆش و هەتاوی پێیە.

بەشدارانی پرسەکە، جەنازەکە بەرەو کڵێسا دەبەن. بە(٤٥) دەقە دەگەنە کڵێساکە. پیرەمێردێک خەمبار و داماو دوای جەنازەکە دەکەوێ. ئەم پیرەمێردە نێوی توماس پیرزە. دوا دۆستی خات مەرسۆ بووە لە تەمەڵخانەکەدا. لەوێندەر. لە تەمەڵخانەکەدا– شۆخی و سوعبەتیان لەگەڵ پیرەمێردەکە دەکرد و پێیان دەگوت: (ئەم ژنە دەنکی ئەوە). دنیا گەرمە، گەرماکەی لە کێشدا نییە. بەڕێکەرانی جەنازەکە وەکو خەون و خەیاڵ دێنە بەرچاوی مەرسۆ: کڵێسا. گۆڕستان، زەبوونی و بێ توانایی پیرز–ی پیر، چاوەڕوانی: (کاتێ پاسەکە گەییبە جەزایری نقوومی ڕۆشنایی، کەیفخۆش بووم، پێم وابوو کە ڕادەکشێم و دوازدە سەعاتی ڕێک دەخەوم.)

### فەسڵی دووەم

شەممەیە– مەرسۆ، کە لەخەو ڕابوو لە دڵی خۆیدا هەقی بەبەڕێوەبەرەکەی دا کە لەو دوو ڕۆژە مادۆنییەی کە بۆ کفن و دفنی دایکی وەری گرتبوو، ناڕازی بووبێ. چونکە ئەم دوو ڕۆژە مادۆنییە وا هەڵکەوتبوو کە دەیکردە چوار ڕۆژی دوابەدوای یەک. دەچێ بۆ مەلەکرن. لەوێندەر تووشی ماری کاردونا دەبێ. ئەم ئافرەتە جاران تایپیستی هەمان دایەرەی مەرسۆ بوو. ئەو کاتانە مەرسۆ تەماحی تێ کردبوو، و

مرخی لێ خۆش کردبوو. پێکڤە مەلە دەکەن. پێدەکەنن. پێکڤە دەنوون. کاتێ جلکی خۆ لەبەردەکەن، ماری هەست دەکا کە مەرسۆ تازیەبارە، بەوپەڕی سەرسامییەوە بۆی بەدیار دەکەوێ کە داکی مەرسۆ دوێنێ مردووە. بۆ عەسر پێکڤە دەچنە سینەما، شەویش پێکڤە دەقەتێن. ماری، بەیانی زوو دەڕوا، مەرسۆ بێکار و تەنیایە، بەدرێژایی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لە بانێژەی ماڵەکەدا دەوەستێ و سەیری هاتوچۆی خەڵکی گەڕەکەکە دەکا. عەسر (وام زانی هێشتا هەر هەمان ڕۆژی درێژی یەک شەممەیە، دایکە ئێستا نێژراوە، دووبارە دەچمەوە سەر کارەکەم، بەگشتی چ شتێک نەگۆڕاوە).

**فەسڵی سێیەم**

دووشەممەیە: دایەرە، بەڕێوەبەر، کار، سەعات دوازدە و نیو لەگەڵ عەمانوئێل-ی هاوکاریدا وەدەردەکەوێ. لە مەیخانەی سیلست نیوەڕۆژە دەکا. وەکو هەمیشە خەوتنی پاش نیوەڕۆیان، جگەرەکێشان، ترامواى، دووبارە دایەرە. عەسر، گەڕانەوە بۆ کەناری دەریا. مەرسۆ لەسەر قالدرمەکان تووشی سالامانۆی پیری دراوسێی دەبێ. ئەم پیرەمێردە سەگێکی پێیە و بەردەوام لەگەڵێتی و ئازاری دەدا. ئەوجا تووشی ڕیمۆن-ی هاوسێی دەبێ. ئەم هاوسێیەی خوڵکی دەکا کە پێکڤە نان و پەنیرێ بخۆن، دەستی ئەم دراوسێیەی لە سووکە شەڕێکدا زامدار بووە و بەسارغی پێچاویەتی. ڕیمۆن داوا لە مەرسۆ دەکا کە ببێ بەدۆستی و ڕازی دڵی خۆی بۆ هەڵدەڕێژێ: ئەو پیاوەی ئەم دراوسێیەی مەرسۆ لەگەڵی بەشەڕ هاتووە، برای ژنێکە کە ڕیمۆن- دراوسێکەی مەرسۆ- خەرجی دەکێشێ. تازە بۆی دەرکەوتووە کە ئەم ژنە خیانەتی لێ دەکا. ژنەکەی دارکاری کردووە، بەڵام هێشتا دڵی دانەسەکنیوە و پێیی وایە ئەم تۆڵەیە بەس نییە. دەیەوێ نامەیەک بۆ ژنەکە بنێرێ و گازی بکا بۆ ئێرە و هەقارەت و سووکایەتی پێ بکا.

مەرسۆ، ئەم نامەیە بۆ هاوسێکەی خۆی دەنووسێت: (ڕیمون پێیی دەڵێ کە هەنووکە تۆ دۆستێکی گیانی بەگیانی و دڵسۆزی منی.)

**فەسڵی چوارەم**

هەفتە دەبوورێ، شەممە لەگەڵ ماریدا دەچێتە کەناری دەریا.

هەتاو، ئاوی شیرتێن، تامی سوێر و تەڕی لێوانی ماری. دووبەدوو دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەی مەرسۆ: (پەنجەرەکەم کردبووەوە، و هەستی داچۆڕانی شەوی هاوین بەسەر بەدەنی لە تریفەی مانگا غەرق بوومان، لەزەتێکی تایبەتی هەبوو). سبەینێی ئەو ڕۆژە دەنگە دەنگی کوتەک کاری لە ماڵەکەی ڕیمۆن-ەوە دەژنەون. گوێیان لێ دەبێ کە ئەم پیاوە لە ژنێک دەدا و جنێوی دەداتێ. پاسەوانێک دەکەوێتە بەینەوە و کۆتایی بەم شەڕە دێنێ. پاش ڕۆیشتنی ماری، ڕیمۆن دێتە دیدەنی مەرسۆ و لێی دەپاڕێتەوە کە شایەتی بۆ بدات و لایەنی ئەو بگرێ. مەرسۆ قاییل دەبێ. پاش نیوەرۆ، پێکڤە لە ماڵ وەدەر دەکەون. مەرسۆ دەبینێ ئەم هاوسێیەی خۆشی دەوێ و ڕێزی دەگرێ. هەست دەکا کە (فرسەتێکی باشە). وەختێ دەگەڕێنەوە سالامانۆ بەتەنیا و بێ سەگەکەی دەبینن. سالامانۆ بۆیان دەگێڕێتەوە چۆن سەگەکەی ڕەڤییە



چونکە نیگەرانە عەسر دێتە دیدەنی مەرسۆ: (پاشان شەوباشی لێ کردم. دەرگای ژوورەکەی داخست، گوێم لە دەنگی هاتوچۆی بووەوە. جیرەجیرێ قەرەوێڵەکەی بەرز بووەوە. بەو دەنگە کزەدا کە لە تیغەی ژوورەکەیەوە دەهات، زانیم کە دەگری. نازانم بۆ دایکم بیرکەتەوە).

**فەسڵی پێنجەم**

ڕیمون، مەرسۆ و ماری دەعوەت دەکات کە ڕۆژی یەکشەممەی ئایندە لە کوخی یەکێک لە دۆستەکانی لە نزیکی جەزایر بگوزەرێنن. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە دەستەیەک عەرەب تاقیبیان کرد.

برای کۆنە دۆستەکەشی لەنێو ئەو عەرەبانەدا بوو. بەڕێوەبەرەکەی مەرسۆ پێشنیاز دەکات کە مەرسۆ بچێ بۆ پاریس و کارێک بگرێتە دەست. مەرسۆ لەوەڵامدا دەڵێ بۆ ئەو هیچ جیاوازییەکی نییە. عەسری ئەو ڕۆژە ماری لێیی دەپرسێت کە ئاخۆ بەتەمایە بیخوازێ؟ مەرسۆ، لە وەڵامدا دەڵێ بەلای ئەوەوە فەرق ناکات. لەبەر دڵی ماری کە دەڵێ حەز دەکا شووی پێ بکات، مەرسۆ قاییل دەبێ. شێو لە خواردنگەی سیلستدا دەخۆن، لە دەوری مێزێک دادەنیشن کە ژنێکی تری پڕ جموجۆڵ و چالاکیش لەسەر هەمان مێز نان دەخوات. مەرسۆ، لەبەر دەرکی ماڵی خۆیاندا، تووشی سالامانۆ دەبێ. سالامانۆ، بەمەرسۆ ڕادەگەیەنێ کە سەگەکەی بەیەکجاری گوم بووە. ماوەیەک پێکڤە باسی سەگ دەکەن. پاشان سالامانۆ دەربارەی دایکی مەرسۆ قسەی لەگەڵ دەکا دەڵێ کاتێ کە مەرسۆ دایکی بردە تەمەڵخانە، خەڵکی گەڕەک و بان لۆمەیان کردووە، بەڵام ئەو دەیزانی کە دایکی زۆر خۆشی دەوێ.

**فەسڵی شەشەم**

یەکشەممەیە، وەختێ ماری، مەرسۆ لە خەو هەڵدەستێنێ، مەرسۆ هەست بەناڕەحەتی دەکا. خۆ ئامادە دەکەن کە لەگەڵ ڕیمۆندا بەڕێ بکەون. ڕۆژێ پێشتر مەرسۆ شایەتی دابوو کە ئەو ژنە لە ئەمر و ڕای ڕیمۆندا نەبووە. کە دەردەکەون، ڕیمۆن لە شۆستەکەی بەرانبەریانەوە دەستەیەک عەرەب دەبینێ کە سەیری ئەمان دەکەن. خەنیمەکەی خۆی لە نێویاندا دەناسێتەوە. بەڵام تازە مەسەلەکە بڕاوەتەوە. سواری پاس دەبن تا بچن بۆ ماڵی دۆستەکەی ڕیمۆن. ئەم دۆستە نێوی ماسون-ە، پیاوێکی باڵا بەرزی میهرەبانە، کیژێکی پاریسی خواستووە. مەرسۆ و ماری پێکڤە مەلە دەکەن و پاشان لەسەر لمەکە ڕادەکشێن و خۆ دەدەنە هەتاو. کە لە فراڤین دەبنەوە هێشتا زووە، هەتاو بەشێوەیەکی ئەستوونی لە لمەلانەکە دەدا، لەم کاتەدا مەرسۆ، ڕیمۆن و ماسون پێکەوە دەڕۆن تا لە کەناری دەریادا پیاسە بکەن. لەپڕ و لە دوورەوە دوو عەرەب بەدی دەکەن. ڕیمۆن کە خەنیمەکەی خۆی دەناسێتەوە دەڵێ: (خۆیەتی) سووکە شەڕێک هەڵدەگیرسێ، مەرسۆ خۆی تێکەڵ ناکات. یەکێک لە عەرەبەکان چەقۆ دەردێنێ، ڕیمۆن بەسووکی بریندار دەبێ.

ڕیمون دەوری سەعات یەک و نیو دەگەڕێتەوە بۆ کەناری دەریا، مەرسۆش لەگەڵی دەچێ.

دوو عەرەبەکە هێشتا هەر لەوێن. لە نزیکی کانییەکدا ڕاکشاون. ڕیمۆن لێ دەبڕێ خەنیمەکەی بکوژێ، بەڵام مەرسۆ پێیی دەڵێ سەبر بکا تا عەرەبەکە شتێ بڵێ. مەرسۆ هەر بۆ (احتیاط) دەمانچەکە لە

دۆستەکەی دەستێنێ. دوو عەرەبەکە بەهێمنی لەوێندەر دەڕۆن. گەرماکە لە کێشدا نییە، هێشتا ناگەنەوە کوختەکە کە مەرسۆ هەست دەکا مەیلی لە گەڕانەوەیە بۆ کەناری دەریا و پیاسەکردن. ڕوو دەکاتە کانییەکە تا کەمێ خۆی فێنک بکاتەوە- خەنیمەکەی ڕیمۆن-ش گەڕاوەتەوە بۆ ئەوێندەر- ڕووداوەکانی پاش ئەمە لە حاڵەتی خەون و بێداریدا بەسەر مەرسۆدا تێدەپەڕێ- دەست دەخاتە سەر دەمانچەکەی ڕیمۆن، بڕیار دەدا گەشتێ بکا، بەڵام هەست دەکا کەنارەکە لەژێر زەبری گەرمای هەتاودا لەقەفرتێ دەکا و تاقیبی ئەویش دەکا. کابرای عەرەب هەڵدەکێشێتە چەقۆ- مەرسۆ، کە چاوی پڕ بووە لە ئارەقە و چ شوێنێ نابینێ، دەست لە دەمانچەکە توند دەکا، پەنجە بەپەلەپیتکەوە دەنێ. (ئالێرەوە بوو کە لە نێوان دەنگێکی سارد و گوێ کەڕکەردا هەموو شتێ دەستی پێ کرد. ئارەقەکەی نێو چاوانم سڕی، تێ گەیشتم کە هاوسەنگی ڕۆژم، واتا کپی و بێدەنگی کەنارەکەم شڵەقاندبوو، کپی و بێدەنگییەک کە بەلامەوە خۆش بوون: هەنگینێ چوار گوللەی دیم لە جەستەیەکی بێ گیاندا خاڵی کرد، کە گوللەکان ڕۆ دەچوون، چ کاردانەوەیەکی نیشان نەدەدا. ئەم چوار گوللەیە، وەکو چوار لێدانی خێرا بوو، کە من لە دەرکەی بەدبەختیم دەدا).

# بەشی دووەم

## فەسڵی یەکەم

تەحقیقەکانی موحەقق سەردانی ئەوقات، ئەو پرسیارە تەوس ئامێزانەی کە لە مەرسۆی دەپرسن لەمەڕ دایکی و هەستی دەربارەی دایکی. مەرسۆ بەپێچەوانەوە لە بری ئەوەی قسان بکات. کە قسەکردن لەو کاتانەدا پێویستە- قسان ناکا. تەحقیقی لە نوێی موحەقق. مەرسۆ چ ژێوان بوونەوەیەک دەرنابڕێ. موحەقیق باسی خوا و مەسیح دێنێتە گۆڕێ. پاشماوەی تەحقیقات کە پازدە هەیڤان دەخایەنێ.

## فەسڵی دووەم

ژیانی مەرسۆ لە زینداندا -سەردانی ماری- مەرسۆ بەرەبەرە لەگەڵ زیندان و ژیانی ناو زینداندا ڕادێ و (زۆر هەست بەناڕەحەتی) ناکا- کاروپیشەی لە زیندانا: یادگارەکانی، خەوتن، و خوێندنەوەی پارچە ڕۆژنامەیەکی کۆن کە بەڕێکەوت دەستی کەوتووە.

## فەسڵی سێیەم

وەرزی هاوین هاتووە - دەست پێکردنی دادگا- مەرسۆ کە لە قەفەزی تاوانباریدا دانیشتووە، بەئامادەبووانی دادگاییەکە ئاشنا دەبێ: ئەندامانی دادگا، ڕۆژنامەنووسان، قازییەکان، شایەتەکان، سەرۆکی دادگا ڕوودەکاتە مەرسۆ و دەربارەی دایکی، دەربارەی کوشتنی کابرای عەرەب پرسیای لێ دەکا- ئەوجا شایەتەکان ڕیز دەگرن: بەڕێوەبەری تەمەڵخانەکە، دەرگاوان، پیرز-ی پیر. ئەندامانی دادگا بۆیان دەردەکەوێ کە خەڵکی، مەرسۆیان نەدیتوە لە کاتی ناشتنی تەرمەکەی دایکیدا بگری، نەی ویستوە بۆ دواجار ڕوخساری دایکی بدینێ، جگەرەی کێشاوە قاوە و شیری خواردۆتەوە. سیلست گوتی



بەڕای ئەو مەرسۆ (مسیبەتێکی) لێ قەوماوە و لەمە زیاتر نەیتوانی چیدی بڵێ. ماری کە گوشاری سەرۆکی دادگای لەسەربوو، ئیعترافی کرد کە (پێوەندی نامەشرووعی) ئەو لەگەڵ مەرسۆدا لە ڕۆژی پاش ناشتنی تەرمی دایکیدا دەستی پێ کردووە و لە هەمان شەوی یەکتر دیتنیاندا پێکەوە چوون بۆ فلیمێک کە (فیرناندل) دەوری تێدا دەبینی. شایەتی و گەواهی ماسون و سالامانۆ گوێیان پێ نەدرا و بەهەند وەرنەگیران. بەڵام سەرۆکی دادگا بەئامادەبووانی دادگای ڕادەگەیەنێ کە ڕیمۆن بابایەکی (قورمساغ)ە و ئەو نامەیەی کە سەرچاوەی ئەم کارەساتەیە بەدەستی مەرسۆ هاتۆتە نووسین، مەرسۆ، تەنیا لەبەر خاتری ڕیمۆن ئەو شایەتییە نەهەقەی داوە:

چ گومانێک لە دەست تێکەڵکردنی ئەم دووانە نییە و تاوانی مەرسۆ بێگومان تاوانێکی کرێت و دزێوە. ئەوقاتەکەی مەرسۆ ئیعتراز دەکا: (بفەرموون تاوانەکەی چییە؟ ناشتنی دایکی یا قەتڵە؟)

سەرۆکی دادگای دەڵێ: «من ئەم پیاوە بەوە تاوانبار دەکەم کە بەهەمان دڵڕەقی تاوانبارێک، تەرمی دایکی ناشتووە.»

## فەسڵی چوارەم

مەرسۆ بەجۆرێ لە دادگاکەدا بەشداری دەکات وەکو ئەوەی پێوەندی بەوەوە نەبێ. دەربارەی ئەو قسە دەکەن، بەڵام هەرگیز ڕای خۆی ناپرسن. بەباوەڕی سەرۆکی دادگا، مەرسۆ، بەسووربوونی پێشوەختەوە تاوانەکەی ئەنجام داوە. سەرۆکی دادگا سەرلەنوێ دەکەوێتە گێڕانەوەی ڕووداو و سەربوردەکان و لە ڕێگەی ئەم سەرلەنوێ باسکردنەوەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە تاوانبار کابرایەکی بێ سۆز و بەزەییە- ئەندامانی دادگا ڕووبەرووی کەسێکن کە بەبکوژی دایکی خۆی حسێب دەکرێ.

کابرایەکی دڵڕەقی هیچوپووچی ئەوتۆیە کە (چ پێوەندییەکی بەکۆمەڵەوە نییە). چونکە لە (بنەڕەتی ترین بنەماکانی کۆمەڵ) غافڵ و بێ ئاگایە. سەرۆکی دادگا داوای ئیعدامکردنی تاوانبار دەکا - ئەوقاتەکەی مەرسۆ باسی ئەوە دەکا کە سەری کراوەتە سەر و هاڕوژاندوویانە و دەکەوێتە پێداهەڵگوتنی خۆش ڕەوشتی ئەو. بەڵام مەرسۆ گوێ بەو قسانەی ئەو نادات، قۆناغەکانی ژیانی دێنەوە بیری - لە کاتێکا خەڵکی دەوری ئەوقاتەکەی ئەویان داوە و ئافەرینی دەکەن، مەرسۆ هەست بەبێ تاقەتی و ماندوویێتی دەکا- چاوەڕوانی زۆر، هەرا و هەنگامە، کپ بوونی لە نوێی هۆڵی دادگا، ئەنجام سەرۆکی دادگا ڕای دەگەیەنی کە (لە مەیدانێکی گشتیدا، لەلایەن میللەتی فەرەنساوە، لە ملی دەدرێ.)

## فەسڵی پێنجەم

مەرسۆ، نایەوێ قازی بدینێ - بیر لە (دەزگایەکی بێ بەزەیی) دەکاتەوە کە ئەو بەرەو مەرگ دەبا، بیر لە هەڵاتن و ڕزگاربوون دەکاتەوە- چ شتێک لە ئیعدام گرنگتر نییە. بیر لەو مل پەڕێنە دەکاتەوە کە چۆن لە بەرەبەیانێکدا دەیبەنە بەردەمی. هەروەها بیر لە بەخشین دەکاتەوە - وەختێ قازی وەژووری زیندان دەکەوێ، مەرسۆ بیر لەوە دەکاتەوە کە ماری چیدی نامەی بۆ نانووسێت - قسە گلەیی ئامێز و ئومێد بەخشەکانی قازی، مەرسۆ دەهری دەکا: (هیچ یەقینیاتێکی ئەو داوە موویەکی قژی ژنێکی نەدەهێنا.)

پڕ دەداتە قازی، بەرۆکی دەگرێ، بەر دەمرێژی جنێوانی دەدا. پاش ڕۆیشتنی ئەو، مەرسۆ دیسان هێور دەبێتەوە:

(لە بەرانبەر ئەم شەوە پڕ لە نیشانە و ئەستێرەیەدا بۆ یەکەم جار و بێ چەندوچوون پێشوازیم لە جیهان کرد. کاتێ کە دیتم جیهان بەم ڕادەیە لە من دەچێ و سەرەنجام بەم شێوە برایانەیە ڕەفتار دەکات، هەستم کرد کە بەختەوەر بووم و هێشتاش هەر بەختەوەرم.

بۆ ئەوەی هەموو شتێ بگاتە لووتکە، بۆ ئەوەی کەمتر هەست بەتەنیایی بکەم، تەنیا ئەوەندە مابوو کە خۆزیا بخوازم لە ڕۆژی ئیعدام کردنەکەمدا خەڵکێکی زۆر گردببنەوە و بەهاواری کەرب و کینە ئامێز پێشوازیم بکەن.

# فۆرم و لێکدانەوەی نامۆ

**چوارچێوەی چیرۆکەکە**

تێکڕای ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە لە جەزایردا ڕوودەدەن ئەو گەڕەکەی کە مەرسۆی لێیە ناوی بلکورە – کامۆ بەخۆشی لە ساڵی ١٩١٤وە و لەگەڵ دایکیا لەم گەڕەکە ژیاوە، لە خانووی ژمارە ٩٣ی کووچەی لیوندا گەورە بووە ئەم کۆڵانە ئێستا ناوی بلویزدادە سالامانۆ–ی پیریش بەهەمان کۆڵاندا سەگەکەی بۆ گەڕان دەبات، یان هەندێ جاریش دەیبات بۆ مەیدانی عەمەلیاتی سوپایی، واتا بۆ هەمان ئەو شوێنەی کە کامۆ لە لاویدا فوتبۆڵێی تێدا دەکرد. هەر هەموو وردە شتەکانی تری کە پێوەندی بەجەزایرەوە هەیە دەقاودەق لەگەڵ واقیعدا جووتە: ئەو زیندانەی کە لە بەرزاییەکانی شاردا بوو، باخە چکۆلەکەی نزیکی کۆشکی دادگا، ئەو سەیرانگایەی کە کەوتۆتە ئەو سەری کۆڵانی لیون–ەوە و ئەو ترامواییەی یاریکەران و تەماشاکەرانی بۆ ئەوێندەر، دەبرد... تەمەڵخانەی مارنگۆ کە دوورییەکەی لە شارەوە دەقاودەق ڕەچاو کراوە.

لەلایەکی دییەوە، وەکو پرۆفیسۆر کاستاکس سەلماندوویەتی ئەو کەنارەی کە کارەساتەکەی لێ ڕوودەدا و کامۆ لە قەراخی جەزایردا دایناوە، ڕەنگدانەوەیەکی دەقاودەقی بیرەوەرییەکە لەمەڕ شاری تروڤیل. ئەم شارە چکۆلەیە سەر بەپارێزگای ئۆران–ە و کامۆ لە یاداشتنامەکانی خۆیدا دەربارەی ئەم شارە دەڵێ: (تروڤیل دەشتێکە پڕ لە گوڵی سیراس و بەرانبەر بەدەریایە.

پڕە لە ڤیللای بچکۆلە کە هەیوان و قاڵدرمەی سپی یا سەوزیان هەیە. هەندێ لەم ڤیللایانە چوون بەنێو چڕە دارستانی خورمادا و هەندێکیان لەنێو بەردەڵانی ڕووتەندا گیرساونەتەوە و دەریا لە خواریانەوە کەمێک بەهاڕەو هاژەیە. بەڵام هەتاو، شنەبای خۆش، گوڵی سیراس–ی سپی، جوانی ئاسمانی شین، هەر هەموویان وێنەی هاوین لە خەیاڵدا زیندوو دەکەنەوە) (لەگەڵ نامۆدا بەراوردی بکە).



**زەمەن لە چیرۆکەکەدا**

بەشی یەکەمی چیرۆکەکە بریتییە لە هەژدە ڕۆژ: واتا لە نێوان ڕۆژی ئەو (٥) شەممەیەی کە مەرسۆ برووسکەکە وەردەگرێ و تا ڕۆژی ئەو یەک شەممەیەی کە کارەساتەکە دەقەومێ– سەرەتای چیرۆکەکە لە مانگی شەشدا دەست پێ دەکات (واتا وەرزی فوتبۆڵ کە لە جەزایردا لە ٦,٣٠ هێوەتر ناڕوات، هێشتا تەواو نەبووە)– بێگومان ڕۆژی قەتڵەکەش ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی مانگی/٧.

بەشی دووەم بریتییە لە نزیکەی یەک ساڵ: تەحقیق یازدە مانگی خایاند. دیارە دەبێ ماوەی ڕۆژانی دادگاییەکە و ئەو ڕۆژانەی کە مەرسۆ لە پاش دادگاییەکە لە زیندانا گوزەراندوونی، بخرێتە سەر یازدە مانگەکە– دادگاییەکە لە مانگی شەشدایە.

لێرەدا دوو خاڵ لە ئێستاوە دیار و ئاشکران:

١– وێڕای ئەوەی کە چیرۆکەکە بەسەر یەک ساڵدا پەخش و بڵاودەبێتەوە، کەچی زۆربەی هەرەزۆری چیرۆکەکە لە هاویندا ڕوو دەدات و بەتایبەتی لە هەردوو هەیڤی شەش و حەوتدا ڕوودەدات.

٢– کاتی چیرۆکەکە ئاسۆیی دەڕوات. واتە لە نێو چیرۆک و سەربوردەکەی مەرسۆدا چ گەڕانەوەیەک بۆ ڕابوردوو بەدی ناکرێ.

هەر فەسڵە و شان بەشانی زەمەن و کات لەگەڵ خۆیدا دەمانباتە پێشێ، تەنیا فەسڵی یەکەم و دووەمی بەشی یەکەم نەبێ کە دەکەوێتە ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکانی قۆناغێکی تایبەتییەوە.

**دیدی حیکایەتخوان (راوی)**

نامۆ، چیرۆکێکە بەڕاناوی یەکەم کەسی تاک نووسراوە: ئەمەش مەعنای وایە کە کامۆ تاڕادەیەک لەگەڵ مەرسۆ–ی قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکەدا تێکەڵ دەبێ و دەوری حیکایەتخوانی (راوی) بەو دەدا. هەر لەبەر ئەمەیە کە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە سوور و ڕەش یان لە مادام بۆڤاریدا دێتە پێشێ و حیکایەتخوان پاش مەرگی قارەمانەکە دەمێنێ و دەتوانێ ئەم مەرگە بگێڕێتەوە، ئێمە مەرگی مەرسۆ نابینین، چونکە مەرسۆ ناتوانێ واریقات و سەربوردەی مەرگی خۆی بگێڕێتەوە.

بەڵام ئایا دەشێت ئەوە قبوڵ بکرێ کە ئەم چیرۆکە لە حوکمی دەفتەری بیرەوەریدا بێ و مەرسۆ ڕۆژانە شتی دەربارەی ژیانی خۆی تێدا شەرح و تۆمارکردبێ؟ یان ئەوەیە کە پاش حوکمەکەی، ڕووداوی کارەساتەکە، لە نووکەوە، واتا لە مردنی دایکییەوە کە لە دادگاییەکەدا خرایەڕوو، دەست پێدەکا و تۆماری دەکات؟

**گریمانەی دەفتەری بیرەوەری**

ئەم گریمانەیە خۆ تێکەڵکردنی ئاشکرای چیرۆکنووس دەخوازێ. لەم حاڵەتەدا چیرۆکنووس لێ دەبڕێ کە دەفتەری بیرەوەرییەکەی (یاداشتنامە) لە کوێوە دەست پێ بکات– ئەم بڕیارە پتر لەگەڵ ڕووداوەکانی پاشتردا دەگونجێ، بێگومان کەسێکی وەکو مەرسۆ ناتوانێ پێشبینی ڕووداوەکانی پاشتر (ئایندە)

بکات. بەڵام وێڕای ئەوەی کە زۆر دوورە پیاوێکی وەکو مەرسۆ یاداشتنامە بۆ خۆی تەرتیب بکات، ئەوجاش دیاریکردنی ساتی بەر لە کارەسات و تۆمارکردنی لە یاداشتنامەدا کارێکی یەکجار ئەستەم و زەحمەتە- بۆ وێنە کاتێ کە برووسکەکەی پێ دەگات، وا دێتە بەرچاو کە یەکسەر دەست بەنووسینەوەی بیرەوەرییەکانی بکات- چونکە ئەو ڕووداوانەی کە یەکسەر پاش گەیشتنی برووسکەکە ڕوودەدەن، بەفەرمانی ڕانەبوردوو (داهاتوو) بەیان دەکرێن: (سەعات دوو سواری پاس دەبم و پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ دەگەم). بەڵام کاتێ کە پاش چەند سەعاتێک دەگاتە جێ و شەو بەدیار جەنازەکەی دایکییەوە دەباتە سەر زەمانی حاڵی ڕووداوەکە بەئاشکرا لە زەمانی حاڵی حیکایەتخوان جیادەبێتەوە (من تەنانەت هەستم دەکرد کە ئەم مردووە لە نێو مردووەکانی دیدا، لە ڕوانگەی ئەوانەوە چ مەعنایەکی نەبوو. بەڵام ئێستا وا تێ دەگەم کە هەستەکەی من هەڵە ئامێز بووە.)

بەزۆری، بەلای کەمەوە لە بەشی یەکەمدا وا دێتە بەرچاو کە هەر فەسڵێک بۆ خۆی کۆمەڵە ڕووداوێکە و مەرسۆ لە کۆتایی ڕۆژدا (فەسڵی ٦.٥.٣.٢)یان لە کۆتایی هەفتەدا وەبیریان دێنێتەوە.

هەڵبەتە ئەم مەودایە ڕاستەوخۆ و بەدەر لە ئاڵۆزی نییە: بۆ نموونە لە فەسڵی چوارەمدا وەختێ مەرسۆ باسی ڕۆژی پێشوو دەکات دەڵێ: (ئەمڕۆ بەیانی) و ئەمە وا دەنوێنێ وەک بڵێی ڕۆژ هێشتا لای ئەو تەواو نەبووبێ- بەڵام لە کۆتایی هەمان فەسڵدا دەڵێ (سبەینێی ئەو ڕۆژە) ئەمە لە کاتێکا کە خوێنەر چاوەڕێی وشەی (سبەی) بوو.

بەم جۆرە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و هەست پێ نەکراو دەربارەی زەمانی حاڵی ڕووداوەکە، بۆ پاش گەڕاوەتەوە.

لە بەشی دووەمدا، چوار فەسڵی یەکەم بریتییە لە بابەتەکانی یازدە مانگی تەحقیق و مەحکەمە پیاو ناتوانێ ئەوە بڵێ کە وەختێ مەرسۆ ڕووداوەکانی تەحقیق و ژیانی خۆی لە زینداندا باس دەکات (فەسڵی ١و٢) ئایا مەحکەمەکەی تەواو بووە یان وا خەیاڵ بکرێ کە ئەوەی حیکایەتخوان دەیگێڕێتەوە وەستانێکە لە نێوان هەردوو فەسڵی ٢و٣دا. هەڵبەتە گێڕانەوەی (ڕۆژبەڕۆژ)ی بەشی یەکەم، سڕاوەتەوە. چونکە مەرسۆ سەبارەت بەڕووداوەکان هێندە دوورە پەرێزی کردووە کە هەردوو فەسڵی ١و٢ نەک وەڵامدانەوەی زەمانێکی بەدووی یەکتردا هاتوو نییە، بەڵکو وەڵامدانەوەی هەندێ کاروبارە کە لە قۆناغێکی تەواودا ڕوویان داوە. کەچی لە فەسڵی پێنجدا وا دێتە بەرچاو کە گێڕانەوەکە لەگەڵ ئەو ڕووداو و هەستانەدا کە مەرسۆ دەریان دەبڕێ لە ڕووی زەمانەوە هەمدیس یەکیان گرتۆتەوە و جۆرە هاوزەمانییەکی تەواو پەیدا بووەتەوە، چونکە ئەو بەکاتی ئێستا قسان دەکات: (چ قسەیەکم نییە کە بەوی بڵێم) یان لە جێیەکی دیدا دەڵێ: (خۆم لە پێشوازیکردنی قازی دوورگرت). وەک بڵێی نەزانێ کە قازی وێڕای ئەمەش، دوایی بۆ زیندانەکەی ئەو دێ.

### ئەو گریمانەی کە گوایە، ڕۆمانەکە (پاش ڕووداوەکان) نووسراوە

ئەگەر، بەپێچەوانەوە وا فەرز بکەین کە مەرسۆ ئەم چیرۆکەی پاش حوکمی دادگا و لە زیندانا



نووسیوە، ئەوا لەو ڕووەوە بەسوودە کە ئاسۆ و مەودایەکی یەکگرتووتر بەچیرۆکەکە دەبەخشێت. لەو حاڵەتەدا، دەبێ ئەوەمان لا قەبووڵ بێ کە مەرسۆ دووبارە بیری لە ڕابوردووی خۆی کردۆتەوە و بەجۆرێ ڕێکی خستوونەتەوە کە هەر یەکێک لەو ڕۆژە گرینگانەی بوونەتە مایەی کارەساتەکە یان پاش کارەساتەکە هاتوونەتە پێشێ سەرلەنوێ دروست کراونەتەوە و هێنراونەتەوە گۆڕێ. ئەم دروست کردنەوەیەش بەشێوەیەکە لە تۆ وایە هەر یەکێک لەم ڕۆژانە ئێستا کێیە و لەگەڵ ئەودا هاوزەمانە، ئەو سووکە لادانانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن بۆ نموونە لە بری [سبەینێ]، [سبەینێی ئەو ڕۆژە] بەئاسانی لەگەڵ (ئەو مەودا دووفاقەیییەی) کە مەرسۆی تێ کەوتووە، ڕوون دەبێتەوە (ئێستای واقیعی- ڕابوردووی خەیاڵی). بۆیە ئەو سووکە لادانەی نێومان برد لە هاوژینی ڕابوردووی تەواو و ئێستای وەسفی لە ناواخنی یەک چیرۆکدا، دژوارتر نییە. چونکە باشترین نووسەرانمان زۆرجار سوود لەم هاوژینییە (پێکەوە ژیان) دەبینن. بەم پێیە بوونی هەندێ زاراوە لە بەشی یەکەمدا کە لە بەشی دووەمدا ڕوون دەبنەوە دێنە تێگەیشتن. بۆچی مەرسۆ وا تێدەگا ئەو پیرانەی کە بەدیار جەنازەکەی دایکییەوەن، تەنیا بۆ موحاکەمەی ئەو هاتوون؟ چونکە لەو ساتەدا کە ئەو قسە دەکات، کۆمەڵ هەستی تاوانێکی لا دروست کردووە. مەرسۆ بەر لەوەی دادگایی بکرێ لەم هەستە بێ خەبەر بووە. ئەگینا چۆن وا زەن دەکات کە ئەو چوار گوللەیەی بەکەلەشی بێ گیانی کابرای عەرەبەوەی نا، وەکو چوار لێدان بووە کە ئەو لە دەرگای بەدبەختی داوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، بەڵگەکانی ئێمە، بنجبڕ نایەنە بەرچاو.

(کەشف بوون و شایەتەکانی) مەرسۆ، وەکو پاشتر بۆمان دەردەکەوێ لەوەیە پاکانەی سایکۆلۆژی خۆی هەبێ، بەڵام قابیل بوون بەم خاڵە کە سەرلەبەری چیرۆکەکە بەدەستی مەرسۆی زیندانی لە نوێ نووسراوەتەوە، وەکو ڕەچاو نەکردنی جیاوازییەکی یەکجار گەورەیە کە لە ڕووی شێوازەوە، سەرەتای چیرۆکەکە لە کۆتایی چیرۆکەکە دادەبڕێ. «ئەم جیاوازی (شێوازە هاوتای جۆرە بەدگۆڕانێکە (مسخ) یا بەهەر حاڵ هاوتای جۆرە ئاگایییەکی نوێیی مەرسۆیە». مەگەر وا فەرز بکەین کە مەرسۆ هێندە وەستایە کە شێوازی چیرۆکەکەی خۆی لەگەڵ هەر حاڵەتێکی خۆیدا و لەهەر قۆناغێکی چیرۆکەکەدا سازاندووە، بەڵام ئێمە نایەین فەرزی وەها بکەین.

ئێمە پێمان وا نییە کە بشێت باسی دەفتەری بیرەوەری یا تەنانەت مەنەلۆگ بکرێ. کامۆ گوفتاری قارەمانەکەی (ناڵێتەوە و کاوێژ ناکاتەوە): ئەو چیرۆکێک دەنووسێت کە سەربوردەی مەرسۆ بەشی هەرە زۆری پێک دێنێ. زاراوەی (بێ لایەنانە)ی مەرسۆ لە چیرۆکەکەدا جۆرە هەوڵێکە لە بوار و مەیدانی شێوازدا. و ئەو شتەی کە لە دەفتەری بیرەوەریدا لە خانەی سادە نووسیدا حسێب دەکرێ لە بەرهەمێکی خەملێودا، بەجۆرە دەوڵەمەندییەکی ناوەڕۆک و مەودا و ئاسۆی چیرۆک دێتە هەژماردن.

### ئایا مەرسۆ یەک (شەخسیەت)ە؟

پێوەندی کامۆ و مەرسۆ پێوەندییەکی دوو لایەنەیە. گێڕانەوەی چیرۆکەکە بەڕاناوی یەکەم کەسی تاک

ئەو قەناعەتەمان لا دروست دەکات کە نووسەر و  قارەمانەکەی بەتەواوی یەکن، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە خۆی لە خۆیدا هۆیەکە کە هزر و بیری مەرسۆمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. چونکە بەم هۆیە ئەو مەودایەی کە خراوەتە بەینی چیرۆکنووس و قارەمانەکەیەوە دەسڕێتەوە و ئەوسا ڕوون کردنەوە و داوەری ئەخلاقی ئاسانتر دەبێ. سارتەر، لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا دەربارەی نامۆ، بایەخی بەم لایەنەی ڕۆڵی مەرسۆ داوە و لەم بارەیەوە دەڵێ: (کامۆ دیوارێکی شووشەیی لە نێوان کاراکتەرەکەی و خوێنەردا ڕۆ دەنێ. لە کاتێکدا هیچ کەسێک لە خەڵکانی نێو جامخانە بێ کەڵکتر نییە. وا دێتە بەرچاو کە جامخانەکە هەموو شتێک تێ دەپەڕێنێ تەنیا یەک شت نەبێ کە دەیوەستێنێ ئەویش مەعنای هەڵسوکەوتی زەلامەکەیە. جا بابزانین ئەم شووشەیە چییە: ئەویش هزر و زەینی (ذهن) نامۆیە - لە ڕاستیدا ئەمەش جۆرە شەفافیەتێکە: هەرچییەک کە زەینی نامۆ دەیبینێ ئێمەش دەی بینین. بەڵام ئەم زەینەیان بەشێوەیەک دروست کردووە کە بۆ شتەکان شەفاف و ڕوونە، بەڵام بۆ مەعناکان لێڵ و تەڵخە. ئەم دەقە پێشبینییەکی جوانە، بەتایبەتی لەم ڕووەوە کە چارەنووسی دوایی (قارەمان) لە (چیرۆکی نوێ)دا نیشان دەدا. جگە لەوەی پێشبینییە، تاڕادەیەک وەبیرهاتنەوەشە؛ چونکە قارەمان لە چیرۆکەکانی جویس یان فاکنر وەها بوون: ئەو زەینە (ذهن) سادەیەی کە دیوار ئاسا کەوتۆتە نێوان نووسەر و جیهانەوە و هەر لەوێشدا (زەین) کەس و شتەکان دەبینرێن - بەرواڵەتیش چ خولقێنەرێکی بەتوانا لە گۆڕێدا نییە کە دەست بخاتە کاروباری سازاندنی ئەم کەس و شتانەوە. بەڵام پێ ناچێ نامۆ گەیبێتە ئەم ڕادەیە:

مەرسۆ هەم زەینێکە کە لەوەوە قارەمانانی دی دەبینین و هەم قارەمانە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئالن ڕوب گرییە کە حەز دەکا پێشڕەوانێک بۆ چیرۆکی نوێ پێکەوە بنێ و پەیدا بکات، بەهەمان ڕێی سارتەردا هەنگاو دەنێ: لە کتێبی: بەهیوای چیرۆکی نوێدا، هێرش دەکاتە سەر ڕەخنەی تەقلیدی، چونکە ڕەخنەگرانی تەقلیدی دەڵێن (هەر قارەمانێک دەبێ ناوێکی تایبەتی هەبێ، خۆ ئەگەر بکرێ، دوو ناوی هەبێ: ناو و شۆرەت، دەبێ دایک و باوکی هەبووبێ و جۆرە کاریگەرییەکی ئەوانی پێوە دیار بێ. دەبێ کارێکی هەبووبێ -خۆ ئەگەر ماڵ و منداڵی هەبێ باشترە- خۆلاسە دەبێ کەسایەتییەکی تایبەتی هەبێ و سیمایەکی هەبێ کە ڕەنگدانەوەی ئەم کەسایەتییە بێ. دەبێ خاوەنی ڕابوردوویەک بێ کە کاری کردبێتە سەر ئەم خوو یان ئەو خووی؛ واتا خوو و هەڵس و کەوتەکانی ڕەنگدانەوەی ئەو ڕابوردووەی بن. کەسایەتی ئەو بزوێنەری ڕەفتاری کردەوەکانی ئەوە و لە هەر ڕووداوێکدا بەجۆرێکی تایبەتی وەگەڕی دەخات.

کەسایەتی ئەو دەرفەتی خوێنەر دەدا کە هەڵی بسەنگێنێ، خۆشی بوێ یان ڕقی لێی هەستێ- لە سایەی ئەم کەسایەتییەدا، قارەمان ڕۆژێ لە ڕۆژان ناوی دەگوازێتەوە بۆ بەشەرێک، وەک بڵێی ئەم بەشەرە لە چاوەڕوانی ئاهەنگی ئەم ناو نانەدا دەققەژمێری دەکرد. چونکە قارەمان هەم دەبێ دەگمەن بێ و هەم بتوانێ بەپەیژەی گوفتاردا سەربکەوێ. دەبێ هێندە تایبەتمەندێتی هەبێ کە هیچ کەسێک نەتوانێ جێی بگرێتەوە و ئەوەندە گشتێتی تێدا بێ کە وەکو هەمووانی لێ بێ.

روب گرییە پاشان چۆتە سەر باسی نامۆ و گەییوەتە ئەو ئەنجامەی کە: (هیچ بەرهەمێکی گەورەی



هاوچەرخ لەم ڕووەوە لەگەڵ پێوەرەکانی ڕەخنەدا دەرنابات و جووت نییە و ناسازێ).

بەڕاستی مەرسۆ ئەو هەلومەرجانەی سەرەوەی بەتەواوەتی تێدا نییە: چشتێک لەمەڕ ناوی ئەو نازانین و چ سەروەت و سامانێکی نییە، بەڵام ناوی شۆرەتی هەیە، دایکی هەیە، کارێک، و کەسایەتییەکی هەیە (ئەگەر چی غەریبە)، تایبەتمەندی بەدەنی هەیە (بەلای کەمەوە لەو ڕووەوە کە ڕقی لە سپی پێستانە)، ڕابوردوویەکی هەیە (خوێندنی دەست پێ کردووە، بەڵام نەیتوانیوە تەواوی بکات، بەلای کەمەوە ئاماژەیەک بۆ ئەو ساڵانە کراوە کە لەگەڵ دایکیدا ژیاوە). خوێنەران داوەرییان دەربارەی ئەو کردووە (جارێ بەتازە مەسیحی و جارێ بەپاشکەوتەی فیکرییان لە قەڵەم داوە)، و چەندین جار دادگاییەکەیان تازە کردۆتەوە تا بیبەخشن یان بەدڵنیاییەوە تاوانباری بکەن؛ هەندێکیش بەنوێنەری سەردەمێکی تەواوی دەزانن، وەکو چۆن گوتیە یان شاتو بریان نوێنەرانی سەردەمی خۆیان بوون. ئێمەش هیوادارین ئەوە نیشان بدەین کە چۆن دەتوانرێ لەودا هەم تاکێک و هەم ڕەمزێک ببینرێ.

ئەمە چ جەزرەبەیەک لە کامۆ نادات.

روانینی ڕوب-گرییە دەربارەی جەبریەتی کەسایەتی قارەمانانی تەقلیدی قەناعەت بەخشترە. هیچ شوێنەوارێکی ئەم جەبریەتە لە کەسایەتی مەرسۆدا نابینرێ. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ڕەفتاری مەرسۆ، خوێنەرانی ڕاهاتوو بەقارەمانانی وەک قارەمانەکانی بەلزاک ناڕەحەت دەکات گەرچی دایکی هەیە یان هەبووە. بەڵام هەڵسوکەوتێکی وەهای لەگەڵ ئەم دایکەدا نییە کە دەروونناسی یا زانستی ئەخلاق بتوانێ بەئاسانی تۆمار و دەستنیشانی بکات. هەرچەندە ئەو کابرایەکی تاوانبارە، بەڵام ناکرێ هەروا بەئاسانی و بێ لێ پێچانەوە بخرێتە ڕیزی پیاوکوژانی ناو چیرۆکە ئەدەبییەکانەوە. کەواتە، نامۆ نەک لە باری هاوبەشی لە ڕوانینی ڕواڵەتیدا، بەڵکو لە باری ڕەخنەگرتن لە چەمکی کەسایەتییەوە، وەکو چۆن بەدڵی هومانیسم-ی کۆن بوو، سەرنجی ڕوب- گرییە و لایەنگرانی چیرۆکی نوێشی ڕاکێشابوو.

لە بەشی (هونەری کامۆ)دا دەبینین کە ئەم لێکچوونە قووڵە دەبێتە هۆی کۆمەڵە لێکچوونێک لە ئاستی دەربڕیندا.

**وێنەی کابرایەکی جەزایری**

هەموو شتێک دەربارەی مەرسۆ گوتراوە، بەڵام بەباوەڕی من بەئەندازەی پێویست ئەوە نیشان نەدراوە کە ئەو بەر لە هەموو شتێک بابایەکی جەزایرییە. بێگومان لەم ڕووەوە لە کامۆ دەچێ.

بەڵام تا چ ڕادەیەک؟ مەرسۆ لە هەمان گەڕەکی هەژارنشیندا دەژی کە کامۆ تێیدا دەژیا. ئەویش لەگەڵ پیرە دایکەکەیدا لە هەمان گەڕەک ژیاوە. (هەڵبەتە دایکی کامۆ پاش مەرگی کوڕەکەی مرد).

ئەویش ناچار بوو دەست لە خوێندن هەڵگرێ و بەنیوەچڵی بەجێی بێڵێ (کامۆ، بەهۆی نەخۆشییەوە خەریک بوو دەستبەرداری خوێندنەکەی ببێ و سەرەنجامیش نەیتوانی ئەو خوێندنە تەواو بکات کە خۆی دەیویست). لێکچوونی ئەم دووانە هەندێ گومان بزوێنە. بەلای کەمەوە مەرسۆ لە کەسێک دەچی کە زۆر نزیک بوو کامۆ ئەو کەسە بێ: کەسێکی نەخوێندەوار، بێ وەفا دەرهەق بەدایکی، و هەندێ جار

تاوانبار، ئەگەر دەرفەتێک برەخسایە... قارەمانی چیرۆک هەمیشە کەم یا زۆر شتێک لە خودی نووسەر دەگرێتە خۆ.

ئایا دەشێت بڵێین مەرسۆ، کامۆیەکی (ناکام)ە؟

پرۆفیسۆر کاستاکس بەپشتیوانی یاداشتنامەکانی کامۆ ئەوە نیشان دەدا کە کامۆ لە ساڵانی **١٩٣٧-١٩٣٨**دا چەند لە بیری ئەوەدا بووە کە لە پەستی (ابتذال) ژیان بخەڵەسێ. لە ساڵی **١٩٣٨**دا دەنووسێت: (پێویستە هەموو ڕۆژێک، شتێک لەم دەفتەرەدا بنووسم: دەبێ تا دوو ساڵی دی بەرهەمێک بنووسم).

هەوەڵ جار بیری لە شانۆنامە کردەوە، بەڵام کالیگولا تێنوێتی ئەوی نەشکاند- ئەوجا ڕووی کردە چیرۆکنووسین: مەرگی شاد، تێنوێتی نەشکاند- ئەوجا ڕووی کردە نووسینی کتێبێک (پەیامێک).

سەرەنجام کەڵکەڵەی چوونە هند و چینی کەوتە سەر. هەڵبەتە مەرسۆ بیری لەم کارانە نەدەکردەوە تەنانەت پێشنیازی سەرۆک دایەرەکەی خۆی، کە بچێ بۆ پاریس، ڕەفزکرد. ئایا دەتوانین بڵێین مەرسۆ کابرایەکی دەستەپاچە بووە و نەیتوانی ئەو کارە بکات کە کامۆ کردی و ڕزگاری بوو (بڕوانە، کاستاکس، ل ٧٣). من قەناعەتم وایە کە دەبێ لە شوێنێکی دیدا بۆ حەقیقەتی چیرۆکەکە بگەڕێین.

کاتێ مەرسۆ خوێندنی تەواو کرد، گەیییە ئەو قەناعەتەی کە (ژیانی مرۆڤ هەرگیز نایەتە گۆڕین و هەموو جۆرەکانی ژیان سەروبنی یەک شتن). هەڵبەتە بیری وا لە مێشکی کامۆدا نییە، بەتایبەتی لە قۆناغێکدا کە ترسی ڕاهاتن و خوو پێوەگرتن لە ئازای نیشتبوو، و لەوە دەترسا کە هەفتەی چل سەعات کارکردن هیچ دەرفەتێک بۆ گەشەکردنی مرۆڤ نایەڵێ و تاقەت و حەوسەڵەی دەبات.

تەجرەبەیەکی بچووکی مامۆستایەتی، ترسەکەی زیاتر کرد. ئەو تەنانەت ئاشنایەتی لەگەڵ خەمی ژیانی ئیداریشدا پەیداکرد. ئەم خەمە لە کارێکدا یەخانگیری بوو کە دەتوانرێ بەژیانی ئیداری کامۆ بشوبهێنرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، من پێم وایە کە تەسلیم بوونی مەرسۆ، ئەگەرچی جیاوازە لە ترس و نیگەرانی کامۆ بەرانبەر بەپەستی (ابتذال) بایەخێکی هەیە کە لەگەڵ دیدی کامۆدا یەک دەگرێتەوە.

وەکو گوتمان مەرسۆ سەبارەت بەئایندەی خۆی خەمسارد و بێ موبالاتە پێشنیازی سەرۆک دایەرەکەی کە بەرزکردنەوەی پلەی ئەوی تێدایە، ڕەفز دەکا (چونکە هەموو ئەم شتانە بایەخی واقیعیان نییە)، بەڵام تۆزێ پێش ئەوە. کامۆ هۆی قەبووڵ نەکردنی ئەم بەرزکردنەوەیەی لە کۆمەڵە گوتاری (شادی)دا ڕوون کردبووەوە: (کەم کەس لەوە تێدەگەن کە جۆرە ڕەفزێک هەیە، هیچ لایەنێکی هاوبەشی لەگەڵ پچڕانی پێوەندیدا، نییە، لەم حاڵەتەدا وشەی: ئاینده، ئاسایش، پلەوپایە چ مەعنایەکیان هەیە؟ من بۆیە دەست بەڕووی هەموو ئایندەکانەوە دەنێم، چونکە ناتوانم لە بازنەی ئێستای خۆیشیم دەربچم). مەرسۆ پڕ بەپێستی وشەی فەیلەسوف، فەیلەسوفە. واتا وەکو زانایەک دەژی. شیعری ژیانی ئەو ئەگەرچی لە نێو کتێباندا زیندان نییە، بەڵام هیچی لە شیعران کەمتر نییە.

کامۆ دیسان لە هەمان کۆمەڵە وتاری (شادی)دا و لە گوتاری هاوینی جەزایردا دەڵێ: (پێچەوانەی



یەک میللەتی شارستانی، میللەتی داهێنەرە. ئەم کێوییانەی کە لە کەناری دەریادا پاڵیان داوەتەوە و مۆڵیان خواردووە، ئەم ئومێدە نامەعقولەم دەدەنێ کە ڕەنگە بێ ئاگا لە خۆیان، سەرقاڵی بەرجەستەکردنی ڕۆشنبیرییەک بن کە لە دوا ئەنجامدا شکۆداری مرۆڤ سیمای واقیعی خۆی وەربگیرێتەوە). هەنگینێ قەناعەت دەکات کە: (ئەم جۆرە میللەتە هەمە پەسند نابێ. لێرەدا بەپێچەوانەی ئیتاڵیاوە، هۆش چ شوێنێکی نییە). ئایا کامۆ، لە سەردەمی نووسینی نامۆدا دەیتوانی ئەم جۆرە میللەتە بێ کەم و زیاد پەسند بکات؟ وەکو لە یاداشتنامەکاندا بەدیار دەکەوێ، کامۆ لافی ئەوە لێ دەدا کە ئیلتزامی بەتەبیعەت و سروشتی ڕۆشنبیرانەی خۆیەوە هەیە.

بەڵام کامۆ لە ڕۆشنبیردا کەسێک دەبینێ کە (خاوەنی شەخسییەتێکی دوفاقییە). کامۆ لە قۆناغی نامۆدا دووچاری دوفاقی شەخسیەت ببوو، و نەیدەتوانی لەم داهێنانە شکۆدارەی کە بێ ئاگا لە داهێنەرەکانی دەخەملێ، بەشداری بکات. چەند ساڵێک بەر لەمە، لە بری پراکتیزەکردنی فەلسەفەی یۆنان، تێیدا نقوم دەبوو، لە بریی مەلەکردن لە دەریادا، دەربارەی مەلەوانانی دەنووسی، و لە بری ئەوەی (سیمای ڕۆشنبیرییەک بەرجەستە بکات) دەربارەی ڕۆشنبیرییەک تێدەفکری کە لە دەوروبەری ئەو بەرجەستە دەبوو.

ئەگەر کامۆ کەڵکەڵەی داهێنانی لەسەردایە، کەمتر لەبەر ئەو ژیانە پەست و بازاڕییەیە کە دەرهەق بەکەسێکی وەکو مەرسۆ ڕەوا دەبینرێ، بەڵکو پتر لەبەر ئەوەیە کە ژیانی ئەو، خوێندنەکەی، تەبیعەتی ئەو ڕێگایەکی دی خستۆتە بەردەمی. کەواتە ئاساییە کە لە کاتی ئەفراندنی مەرسۆی قارەمانی خۆیدا، پتر هەست بەغوربەت بکات تا ونبوون.

کۆمەڵەی گوتاری (شادی) لایەنەکانی تری کەسایەتی مەرسۆ بەشێوەیەکی کاریگەر و پڕ سوود ڕوون دەکاتەوە: بێ موبالاتی و خەمساردیی ڕواڵەتی ئەو لەکاتی ناشتنی دایکی، لە شارێکا کە لەوێندەر (هەرچییەک پێوەندی بەمەرگەوە هەیە کرێت و دزێوە)، ڕەوشتی جوامێرانەی ئەو کە بەپێی ئەو ڕەوشتە: (نابێ بەدووقۆڵی پەلاماری یەک دوژمن بدەن): شەڕی کەناری دەریاکە پێوەندی بەخوو ڕەوشتی جوامێرانەوە هەیە. مەرسۆ، کاتێ هەست دەکات کە ڕایمون-ی دۆستی لە خەتەردایە، دەیەوێ لەسەری بکاتەوە و تای ئەو بگرێ، بەڵام لە یەکەم شەڕدا بەشداری ناکات و وازیان لێ دێنێ دوو بەدوو (شەڕ بکەن). سیلست لە دادگادا گەواهی دەدا کە مەرسۆ (پیاوە) و دەڵێ هەمووتان دەزانن کە پیاوەتی دەکاتە چی. بەکورتی ئەگەر بەوە قایل بین کە (فەزیلەت و پیاوەتی لە سەرانسەری جەزایردا وشەیەکی بێ مەعنایە: (بڕوانە گوتارەکانی کامۆ) هەنگینێ ڕەفتار و هەڵسوکەوتی مەرسۆ پاش تاوانەکەی کەمتر دەبێتە مایەی سەرسامی.

**نامۆ**

چامپینی لە یەکەمین لاپەڕەکانی بەرهەمەکەی خۆیدا سەبارەت بەنامۆ (دەربارەی قارەمانێکی بێ مەزەب) ئەو مەسەلانەی ڕوون کردۆتەوە کە پەیوەستن بەعینوانی کتێبەکەوە دەڵێ: «مەرسۆ ئەو ساتەی

که دادگایی دەکرێ، بەهیچ جۆرێ هەست بەنامۆیی ناکات، نە سەبارەت بەکۆمەڵگە هەست بەنامۆیی دەکات و نە سەبارەت بەواقیع» تەنانەت گونجان و سازانی ئەو لەگەڵ سروشتدا هێندە کۆکە کە هەرگیز گومانی لێ ناکرێ. بەجۆرێ باسی دەریا و لم و هەتاو دەکا وەکو چۆن ئێمە باسی هەناسەدان و هەناسە وەرگرتنی خۆ دەکەین.

دەبێ کۆمەڵگە ئەو لەم بەهرانە مەحرووم بکات تا ئەو لە خەیاڵدا پێوەندییەک لەگەڵ ڕەگەزی سروشتی خۆیدا بەرپا بکات. لەم ساتە بەدواوە ئیدی ئەم پێوەندییە دەبێ بەونبوون و جودایی. جۆری ڕەفتاری ئەویش لەگەڵ خەڵکانی دیدا لەسەر هەمان شێوەیە. وشەیەلی دۆستایەتی و ئەشق بۆ کەسێک کە بەکاریان دێنێ، بەندە بەئاگایی ئەوەوە دەربارەی پێوەندییەکانی لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا.

مەسەلەی پێوەندییە ئینسانییەکان لەلای مەرسۆ مەبەست نییە: پێوەندی ئینسانی لای ئەو لایەنی پراتیکی هەیە. بۆیە کاتێ ڕیمۆن دەم لە دۆستایەتی دەکوتێ یا ماری خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕێ، ئەو ئامادەی قبوڵکردنە، بەڵام سەرسامە.

لە موحاکەمەکە بەدواوە ئیدی هەموو شتێ دەگۆڕێ: «دەتگوت بەبێ من لە مەسەلەکە دەکۆڵینەوە. وەزع و حاڵ بێ گوێدان بەمن دەڕۆیی. مەسەلەکە. مەسەلەی چارەنووسی من بوو، بەڵام چ کەسێک ڕاوبۆچوونی منی نەدەپرسی». مەرسۆ، تا ئەو کاتانەی کە ئازادبوو بەرانبەر بەخەڵکان و شتەکان زۆر ساردوسڕ بوو، هیچ جۆرە کەڵکەڵەیەکی یاخیگەری و گۆڕانکاری لەسەردا نەبوو: جیهانی ئەو بریتی بوو لە دنیای دایەرە، گەڕەک، بەندەر، کەناری دەریا، ئەویش وەختێ کە دەعوەتیان دەکرد. کاتی دەست بەتاڵی خۆی لە بانیژە و هەیوانی ماڵەکەی خۆیدا بەسەر دەبرد. دۆستەکانی بریتی بوون لە هاوسێکانی، هاوکارانی دایەرەی، و بەڕێوەبەری خارنگاکە. تەنیا ڕێوڕەسمی ناشتنی دایکی دەرفەتی بۆ ڕەخساندین کە لە دەرێی ژیانی پەست و سواوی ڕۆژانەدا و بەئازادی بیدینین: لە تەمەڵخانەی مارنگو، و پاشانیش لە ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی جەنازەکەدا، مەرسۆ توانی چەند بابەتێکی تازە بدینێ: سیمای خەڵکی، جۆری پۆشاکیان، ڕێوڕەسمی ناشتن،. بەگوتەیەکی دی ڕەنگە بتوانرێ بگوترێ کە قۆناغی زیندان و دادگایی، کۆمەڵێک ئاسۆی تازە لەبەردەم ڕوانینی ئەودا دەکاتەوە: ئەو لە دادگاییەکەی خۆیدا بەجۆرێ بەشداری دەکات کە لە تۆ وایە تەمەشاکەری نواندنێکە. لە قسەی زل و قەبەی قسەکەران و ڕەفتاری ڕۆژنامەنووسان وەئاگا دێ... کەواتە ئەگەر ئەو نامۆبێ، ئەوا لە قۆناغی یەکەمدا ئاساییە؛ چونکە لە شوێنی خۆی وەدەرنراوە و. لە کاتێکا ئەو وەکو پێویست خۆی بۆ ئەم دووری و غوربەتە ئامادە نەکردبوو، خۆ لەوەشە ئەگەر پێشنیازی سەرۆکی دایەرەکەی قبوڵ کردبا و بەپلەیەکی ئیداری بەرزتر بچووبایە بۆ پاریس، لەوێندەریش هەستی بەجۆرە نامۆیییەکی سەرەتایی کردبا. ئەو لە وڵاتی خۆیدا و دەرهەق بەدابونەریت و عورف و عادەت بەهەمان ئەندازە نامۆیە کە هورون-ی قارەمانی چیرۆکی «سادەدڵ»ی ڤۆلتر، لە کاتی دابەزینیا لە خاکی فەرەنسادا نامۆ بوو. ئەو کابرایە هێندە سادە دڵ و ساویلکەیە کە پێی سەیرە و تێ ناگات بۆچی لەو شوێنەدا کە پێویستە ڕۆڵی سەرەکی بدینێ کەنار دەخرێ.

بەم جۆرە لایەنی تەشریفاتی بێ ڕوح و گیانی کۆمەڵ تاڕادەی داشۆرین بەر ڕەخنە دەکەوێ. ئەم



داشۆرینە پتر ئاراستەی دەزگای عەدالەتە کە لە تۆ وایە خاوەن بەرژەوەندی ئەسڵی ناناسێت و بێ گوێدان بەو «خاوەن بەرژەوەندییەکە» درێژە بەکاری خۆی دەدا. مەرسۆ دەرهەق بەجیهان خۆی بەنامۆ نازانێ یان بڵێین هەست بەنامۆیی ناکات. بەلای کەمەوە تا ئەو دەمەی دنیا نەبووە بەئاهەنگێکی پڕ لە تەشریفاتی پڕ لە بۆرە پیاوی بوکەڵە ئاسای قەرەقۆز، بەڵام ئەمە نەبووەتە مایەی ئەوەی کە خوێنەر وەکو نامۆیەک نەیبینێ. هەڵبەتە دەبێ جیاوازی لە نێوان چەمکی نامۆ و غەریبدا- کە بەمانای سەیر دێ- بکرێ، چونکە هەندێ جار لە ڕووی چەمک و ماناوە لەجێی یەکدی بەکار دەهێنرێ.

چونکە دەکرێ لە ڕەفتاری مەرسۆدا. جۆرە ڕەوشتێکی سەیر «غریب» بەدی بکرێ. ئەم هەستە لە ڕێگەی هەندێ لە قارەمانانی چیرۆکەکەوە، بۆ ئێمە دەگوازرێتەوە: بێ موبالاتی و خەمساردی مەرسۆ سەبارەت بەئایندەی خۆی، سەرۆکی دایەرەکەی سەرسام دەکات. بێ موبالاتی مەرسۆ سەبارەت بەژن هێنان، ماری سەرسام دەکات. ڕەفتاری مەرسۆ، ئەوقاتەکەی ناڕەحەت و نیگەران دەکات. بۆیە ئەم تەمومژە دەروونی و ڕوحییەی باڵی بەسەر ئەم قارەمانەدا کێشاوە و لە خودی بەرهەمەکەوە هەڵقوڵیوە، هیچ جۆرە دەرفەتێکی پێداچوونەوە و ڕونکردنەوە ناهێڵێتەوە. ئەگەر بشیابایە کەرەستەکانی ئەم بەرهەمە لە جۆری پێکهاتەی بەرهەمەکە جیا بکرێتەوە ئەوا زۆر ساکارانە دەمانگوت کەسایەتی مەرسۆ لە بەرانبەر شیکردنەوەی دەروونی ئاساش مقاوەمەت دەکات.

بەشێوەیەکی چێتر، ئەو فۆرمەی کامۆ هەڵی بژاردووە، تەواو لەگەڵ مەبەستەکانی خۆیدا سازگار و گونجاوە.

وێڕای ئەمەش دەبێ دان بەوەدا بنەین کە ئەگەر کۆمەڵ بەهۆی غەرابەتەوە، مەرسۆ سەرزەنشت دەکات، ئەوا پتر لەبەر ئەوەیە کە کۆمەڵ ڕووبەڕووی ڕەفتاری بابایەکی نامۆ دەبێتەوە و مامەڵەی لە تەکدا دەکات. مەرسۆ بەنیسبەت پەیمانە کۆمەڵایەتی و بڕیارەکانی دادگاوە، نامۆیە (لەکاتی باسکردنی دادوەردا دەڵێ: «ئەو گوتی من کارم بەو کۆمەڵەوە نەبووە، کە دانم بەسادەترین بڕیاریدا نەناوە.») لە ڕوویەکی دییەوە، ئەو سەبارەت بەخۆیشی نامۆیە، بەلای کەمەوە ئەمە قەناعەتی کەسانێکی وەکو پرسکار و قازییە کە بێ ئەوەی لەو بگەن و دەرکی پێ بکەن، خێری ئەویان دەوێ. ئەوان، دەیانەوێ قەناعەت بەمەرسۆ بکەن کە کاتێ تەقەی لە کابرای عەرەب کردووە، دەستی لە دڵ و بیری نامۆ بووە، خودی ئەو ئەمرۆکە لە کەسایەتی ئەو ڕۆژەی خۆی نامۆیە، تەنیا لەبەر ئەوە ئەم کارەی کردووە کە تاکو نهۆ سەبارەت بەخوا نامۆ بووە، بەڵام ئەوان هەوڵ و تەقەلایەکی پیرۆزیان دەست داوەتێ تا پارچەکانی ئەم کەسایەتییە لەبەر یەک هەڵوەشاوەیە، بدەنەوە دەم یەک، پاش سزای دادوەرانە جەستەی ئەو لەگەڵ دڵ و بیریدا ئاشت بکەنەوە، شەیتان لە جەستەی دوێنێی مەرسۆ وەدەرنێن، بەمەرجێ کە مەرسۆ-ی ئەمڕۆ ئەنجامی خەتا و تاوانەکانی ڕابوردووی خۆی وەئەستۆ بگرێ، تا ئەمان بتوانن دووبارە ئەو بخەنەوە پەنای خوا، بەمەرجێ مەرسۆ باوەڕ بێنێ کە ئەو ڕۆحێکە. واتە بەوە قاییل بێ کە ڕۆح، بنەمای یەکبوونی کەسایەتی ئەوە؛ و بەو پێیە، هەر کارێ کە ئەو لە ڕێی دروست دەربکات، بەگومڕایی دێتە هەژماردن. لە کاتێکدا کە ئەم «چاکەخوازانە» (بەتایبەتی قازی) بەپێداگرتنەوە تێدەکۆشن مەرسۆ لە سروشتی نامۆی خۆی بگێڕنەوە و

بۆ ئەم مەبەستە شۆڕشێکی لە ناخدا هەڵدەگیرسێنن، کەچی مەرسۆ پاش ئەو شۆڕشە پتر پابەند و دڵبەندی سروشتی نامۆی خۆی دەبێ، بەلای کەمەوە لەم ڕێگەیەوە هوشیاری و ئاگایی پتر دەربارەی کەسێتی خۆی پەیدا دەکات. چونکە پەی بەوە دەبات کە بەگێڕانەوەی بۆ باوەشی کۆمەڵ، لە ڕاستیدا دەیانەوێ لە خودی خۆی دووری بخەنەوە و، هەر کاتێ مرۆڤێک لەگەڵ تەبیعەتدا سازا، خەڵکانی دی ناوی بێگانە و نامۆی لێ دەنەن. «ئەو هاوارە پڕ کەرب و قین ئامێزانەی»کە مەرسۆ لە کۆتایی چیرۆکەکەدا ئارەزووی دەکات، خۆی لە خۆیدا بەڵگە و نیشانەی تاسەی زۆر و زەبەندی ئەوە بۆ جیابوونەوە و دوورکەوتنەوە لە تیرەی بەشەر.

ئەم تاسە گەرمەش، هەست و هەستکردنی ئەو تا توخوبی ناکۆکی وەپێش دەبات: ئایا کاتێ مرۆڤ بەتەواوەتی لە مرۆڤانی دی نامۆ بووبێ، دەتوانێ ئارەزووی کینە سەبارەت بەوان بکات؟ ئەم هاواری کەرب ئامێزە، بەلای کەمەوە بەڵگەی ئاشتبوونەوە و سەرلەنوێ دۆزینەوەی برایەتییە و پاشان نیشانەی گەشبینی مەرسۆیە دەربارەی جیهانێک کە کۆمەڵی مرۆڤان ناناسێت یا بەر لۆمە و گازاندەیان دەدات.

مەرسۆ، لە جیهان؛ یا بەلای کەمەوە لە جیهانی کۆمەڵایەتی دردۆنگ و نامۆیە. ئەگەر ئەو بەپێوەر و پێوانەی دەرێی سروشتی ڕاستەقینەی خۆی هەڵبسەنگێنن، ئەوا سەبارەت بەخۆیشی هەر نامۆ و بێگانەیە. ئەگەر خوێنەر مافی لادان لە بنەما و دەستوورەکانی دەروونزانی تەقلیدی بەو ڕەوا نەبینێ، یان ببێ بەهاوەدەنگی کۆمەڵ و کاردانەوە تووڕە یا بەزەیی ئامێزەکانی کۆمەڵ قبوڵ بکات، ئەوا لەو حاڵەشدا مەرسۆ لە ڕوانگەی خوێنەرەوە هەر نامۆ و غەریب دەنوێنێ. بەهەر حاڵ ئەگەر نەشمانەوێ کاردانەوەیەکی وەکو کاردانەوەی پاسەوانانی کۆمەڵایەتی یا چاکەکارانی بەهەشتی سەرزەمین بنوێنین، دیسان خەتەری ئەوە لە ئارادایە کە مەرسۆ وەکو نامۆیەک تەسەور بکەین. ئا لێرەدا مەسەلەی وەستایەتی دەستکرد، بەڵام پەسەندی چیرۆکنووس بەدیار دەکەوێ و خۆی دەنوێنێ. با وای دابنەین کە مەرسۆ هیچ مەسەلە و دۆزێکی نییە، بەڵام لەو حاڵەدا بۆچی چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. دیارە هیچ ئیعترافێک نییە مەبەستێکی لەپشتەوە نەبێ، ئیدی مەبەستی ستایش بێ ئامۆژگاری و ئاراستەکردن بێ، کەڵکەڵەیەکی شەخسی ڕۆشنگەری بێ، یا خولیای نووسین بێ یا مەبەستی ڕزگاربوون لە جیهان یان خوێنەر... ئەوی ڕاست بێ ئیعترافاتی مەرسۆ، هیچ یەکێک لەو مەبەستانەی نەگرتۆتە خۆ. و ئێمە توانیمان گریمانەی دەفتەری بیرەوەرییەکانی «یاداشتنامە»ی مەرسۆش ڕەت بکەینەوە: کەواتە هەر ئەمە دەمێنێتەوە کە چیرۆکەکە بەکارێکی خەیاڵی بزانین و بڵێین مەرسۆ قسان بۆ ئێمە دەکات. و خوێنەر هەقی خۆیەتی کە ئەم «ئاوازە دوو لایەنە» لە قوولایی ئەو مەنەلۆژەدا کە نووسەر بەڕواڵەت خۆی بەنووسینییەوە ماندووکردووە، بێ هەڵوەستە بخوێنێتەوە.

ئەگەر مەرسۆ، مەسەلەی پێوەندی خۆی بەجیهان و خەڵکانی دییەوە مەبەست نەبوایە، ئەوا بێدەنگ دەبوو. کامۆ بەوەی کە مەرسۆی هێناوەتە قسە، ئیعترافاتی بابایەکی نامۆ و بێگانەی دەداتە پاڵ.



**شەهیدی حەقیقەت**

ئەم زاراوەیە لەلایەن پرۆفیسۆر کاستاکس-ەوە بەکار هاتووە و ئەو قسەیەی کامۆ-مان بیر دێنێتەوە کە لە پێشەکی چاپی زانستگەیی نامۆدا لە ئەمەریکا، نووسیویەتی: «مەرسۆ، خۆی لە درۆ دەدزێتەوە، درۆزنی هەر ئەمە نییە کە شتێ بڵێین بوونی نەبێ. خۆ ئەگەر پتر لەوەش کە هەیە بڵێین هەر درۆیە و، درۆی ڕاستی ئەمەیە – ئەگەر دەربارەی سۆزەکانی مرۆڤ، پتر لە هەستی خۆمان قسە بکەین، درۆمان کردووە و. ئەمە کارێکە، هەر هەمووومان ڕۆژانە ئەنجامی دەدەین تاوەکو ژیان ئاسان بگرین، مەرسۆ بەپێچەوانەی ڕواڵەتە باوەکانەوە، نایەوێ ژیان ئاسان بگیرێ – ئەو خۆی وەکو چۆن هەیە دەناسێنێ، هەستەکانی خۆی ناشارێتەوە و کۆمەڵ دەستبەجێ هەست بەخەتەر دەکات- بۆ وێنە وایان لێ دەوێ کە وەکو چۆن باوە بڵێ لە تاوانەکەی خۆی پەشیمانە. ئەو لە وەڵامدا دەڵێ لەم ڕووەوە کەمتر هەست بەپەشیمانی دەکات و پتر بێ حەوسەڵە و کەم تاقەت دەبێ- و هەر ئەم جیاوازیی مەعنایە مەحکومی دەکات. کەواتە بەهەڵەدا نەچووین ئەگەر پێمان وابێ لە نامۆدا، بەسەرهاتی پیاوێک دەخوێنینەوە، کە بەبێ کەمترین لاف و گەزافی قارەمانێتی، ئامادەیە لە ڕێگەی حەقیقەتدا بێتە کوشتن.»

لە سەرانسەری چیرۆکەکەدا، مەرسۆ، پڕاوپڕی مانای وشە خوازیاری زمان پاکییە. وتمان کە تا ڕ ڕادەیەک گوێ قوڵاغ و بەسەرنجە: کە ڕووبەڕووی جۆری بەیان و دەربڕینی کەسانی دی دەبێتەوە، سەرنج و دیقەتی تیژتر و زۆرتر دەبێ برووسکەی تەمەڵخانەکە بەباوەڕی ئەو ڕوون نییە و دەڵێ: «ئەم ڕستەیە هەر مەعنای نییە». هەستی بەوە کردووە کە ماسون هەموو دەستەواژەکانی خۆی بەڕستەی «زیاتر بڵێم» کۆتایی هێناوە، بێ ئەوەی لە ڕاستیدا چ زیادە مەعنایەکی بەدەستەواژەکە بەخشیبێ، وەختێ، قەراری حوکمەکەی ئەو خوێنرایەوە، زیاتر جۆری «عەجایەبی» نووسینی حوکمنامەکە سەرنجی ڕاکێشا.

ئەو بەش بەحاڵی خۆی هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە کە لە تخوبی فیکری خۆی دەرنەچێ. کاتێ خەبەری بەماری دا، کە دوێنێ شەو دایکی مردووە، ماری دڵی تێک هەڵهات و هەنگاوێک بۆ پاش گەڕایەوە و ویستی بەرەڤانی لە خۆی بکات و بڵێ کە ئەو لەم بارەیەوە «بێ تاوانە»، بەڵام زوو پەی بەوە برد کە «ئەم ڕستەیە هەر مەعنای نییە». ئەوقاتی بەرەڤانی «محامی الدفاع» زۆری هەوڵ لەگەڵدا دەدات کە داخی خۆی بەبۆنەی مەرگی دایکییەوە دەربڕێ.

ئەو لە وەڵامدا دەڵێ ڕاستیەکەی دایکی خۆش ویستوە، بەڵام دەربڕینی داخ و کەسەران یان کول و کۆڤانان چ مەعنایەکی نییە و بەهیچ ناچێ. بەپێی گوتارەکەی کامۆ، لە پێشەکی چاپی نامۆی ئەمەریکادا، دەتوانین بڵێین: ئەوەندە بەس بوو کە مەرسۆ-ش، وەکو هەموو کەسێک، چەند وشەیەک بڵێ کە لە ڕاستیدا باوەڕی پێیان نەبووە، ئیدی لەو حاڵەتەدا بەزەیی قازییەکان دەجووڵا و ئەو دەیتوانی ژیانی خۆی بکڕێتەوە و خۆی ڕزگار بکات.

هەڵبەتە دروستی خەیاڵ و گوتەی مەرسۆ، نیشانە و ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندێتی تەواو نێگەتیفی کەسایەتی ئەو نییە. هەر ئەو دروستییە دەرفەتی بۆ دەڕەخسێنێ کە بەباشترین شێوە سوود لە گوتەی کەسانی دی وەربگرێ. وەختێ کە دەرگاوانی تەمەڵخانەکە قسەی لەگەڵدا دەکات، بەبۆچوونی ئەو

قسەکانی «دروست و بەجێن». هەروەها قسەی ڕیمۆن-ش بەلای ئەوەوە «دڵگیر» دەنوێنێ – چەندین ڕەخنەگر ئاماژەیان بۆ بەکارهێنانی فرەی دەستەواژەی وەک: «بەمانایەک... بەمانایەکی دی...» کردووە.

ئەو تەنانەت لە وەڵامی قسە سواوەکەی ڕیمۆندا «زەمان خێرا دەڕوات»، دەڵێ: «گوتەکەی، بەمانایەک دروست بوو». ئەم هەستکردنە وردە بەسواوی ڕستە و دەستەواژەکانی، لایەنێکی گەپجاڕی دەگرێتە خۆ. لەم حاڵەتەدا مەرسۆ وا دەردەکەوێ کە شێت و شەیدای بەیان و دەربڕینی دروستە.

بەڵام ئەم دروستییە ئەوە نیشان دەدات کە ئەو بەقووڵی حاڵی هاوڕەگەزانی خۆی دەرک دەکات. هەر دروستییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ناڕەزایی سەرۆک دایەرەکەی بفامێ و تێ بگات. کاتێ مەینەتییە سەپێنراوەکان تەحەمول دەکات، دروستی ئەو بەزەیی وروژێنە. ئەمینی و دروستکاری ئەم مەحکوم بەمەرگە، بەو ڕادەیەیە کە ئامادەیە لەبەرخاتری ڕێک بەڕێوەچوونی کارەکانی دەزگای دادوەری لە ئەنجامدانی حوکمی ئیعدامەکەی خۆیدا، هاوکاری لەگەڵ مامورەکاندا بکات و یارمەتیان بدات- ئەمینی و دروستکاری ئەو مایەی پەسندی هەمووانە. لە کاتی دادگاییەکەشدا باسی ئەوە دەکرێ. سیلست شایەتی دەدات کە مەرسۆ هەرگیز و بەخۆڕایی «هیچی نەدەگوت». دادوەرەکە دەڵێ: «مەرسۆ، قەدری وشان دەزانێ». ئەم ڕەوش و ڕێبازە یەکێک لە ڕازاندنەوەکانی کەسایەتی و سروشتی ئەو نییە: ئەم ڕەفتارە لە قوڵایی و ناوجەرگەی کەسایەتی نامۆ و غەریبی ئەودایە. لە دنیایەکدا کە خەڵکی دڵی خۆیان بەقسان خۆش کردووە و بەزەبری گۆڕینی بەیان و دەربڕینی سۆز، لەژێر باری تاوان دەردەچن، ئەو نامۆیە. مەرسۆ خۆی لە دووفاقی دەپارێزێ. ئەو نایەوێ بەزەبری ڕواڵەتبازی و بەتایبەتی لە ڕێی زمانەوە، بوونی خۆی بەجۆرێکی دی نیشان بدات: ئەو دەژی، ئاشقێنی و خۆشەویستی دەکات، کۆمەڵێک خۆزیا و ئاواتی خۆی هەیە، پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام بەدیارخستنی بوون، خۆی لە خۆیدا وازهێنانە لە بوون.

مەرسۆ لەبەر ئەوە حوکم دراوە، چونکە نەی ویستوە مەخسەرەی «مهزلة» زمان «لغة» بەکاربهێنێ؛ چونکە «مەخسەرەی زمان» ئاشکراترین مەخسەرەی تیرەی بەشەرە.

**تاوانبار**

بەڕاست مەرسۆ تا چ ڕادەیەک تاوانبارە؟ ئایا دەشێت حوکمەکەی ئەو بەئامانجی هەڵەیەکی قەزایی بزانرێ؟

کاتێ قازییەکان وا دەزانن مامەڵە لەگەڵ تاوانێکی وەهادا دەکەن کە پێشوەختە و بەپێداگرتنەوە ئەنجام دراوە، بێگومان بەهەڵەدا دەچن. هەڵبەتە مەسئولیەت خستنە ئەستۆی ئەویش، لە دوای ئەو ڕووداوانەی کە بووەتە مایەی کارەساتەکە دیسان هەڵەیەکی زەقی بەڵگەنەویستە... بەڵام خەتای سەرەکی مەرسۆ لەمانەدا نییە: حەقیقەتەکە ئەمەیە کە مەرسۆ سەبارەت بەمەرگی دایکی خۆی خەمساردی و بێ موبالاتی نیشان داوە. ئەو تەقەی لە کابرای عەرەب کردووە، ئەویش لە حاڵێکدا کە لەوەیە کابرای عەرەب جگە لە بەرەڤانی لە خۆی چ مەبەستێکی دی نەبووبێ.

بەهەر حاڵ لەو کاتەدا کە خەنیمەکەی لە دەست و پێ دەکەوێ و ناتوانێ چ ئازارێک بەم بگەیەنێ، ئەم



چوار فیشەکی تریشی پێوە دەنێ- بایەخ و بەهای کەم وێنەی چیرۆکەکە لەوەدایە کە مەرسۆ قوربانیی ڕێکەوتێکی شووم نییە، بەڵکو بەر قەهر و تووڕەیی زنجیرە کاروبارێکی مەنتیقی و ئاسایی ڕەوتی عەدالەتی ئادەمیزادان دەکەوێ.

وێڕای ئەمەش، هێشتا بەتەواوەتی نازانێ کە تاوانەکەی چییە. بەر لە دیتنی ئەوقاتی بەرەڤانییەکەی خۆی، قەت ئەوەی بەبیردا نەهاتبوو کە مەرگی دایکی دەتوانێ لە دادگاییکردنی ئەودا ڕۆڵێکی هەبێ. ئەو لەوە تێ ناگا کە بۆچی لە کاتێکدا بەئاقڵی دەزانن، هەر ئەم بەئاقڵ زانینەی وەکو بەڵگەیەک دژی ئەو بەکاردەبرێ.

بەهەر حاڵ دەبێ ماوەیەک بڕوات تا ئەو لەگەڵ وشەی «تاوانباردا کە کۆمەڵ یەکسەر پاش قەتڵەکە دایە پاڵی، ڕابێ». «ئەمە بیرێک بوو کە نەمدەتوانی لەگەڵیدا ڕابێم.» خەڵکەکەی تر وەستانەوەی ئەوە بەرانبەر بەسیستەمی هۆ و ئەنجام، ئەو سیستەمەی کە کۆمەڵ دەیەوێ ئەوی تێدا بگونجێنێ، ئەم وەستانەوەیەی ئەو بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە ئەنجام دەدرێ، دیارە ئەم حاڵەتە نەک بۆ بەرەڤانی لە خۆی گرینگە- بەڵکو بۆ قازییەکان گرینکە کە لە نێوان تاوانباری بەزۆر و تاوانیاری بەکردەوە پێوەندییەک بەرپا بکەن، ئەو ساتە دەستنیشان بکەن کە مەرسۆ پەیڕەوی هاندەرەکانی تاوانی کردووە، هۆیەکانی دەستبەکاربوون پێناسە بکەین.

بەم جۆرە، بەلای ئەو کەسانەوە کە دەیانەوێ یارمەتی ئەو بدەن (بەتایبەتی قازی) گرینگ ئەمەیە کە لە بوونی ئەم تاوانباری بەکردەوەیەدا، هەرچی چاکە و بواری ژیوان بوونەوە هەیە لە خراپە و پەستییەکانی جیا بکەنەوە تا ئەو تۆبە بکات. و حاڵبوکی مەرسۆ ناتوانێ کەسایەتی خۆی شیکار بکات و لێکی بداتەوە، ڕەگەزەکانی پێکهاتی کەسایەتی خۆی جیا بکاتەوە، هەروەها ناتوانێ لە چوارچێوەی دەوروبەر جودا ببێتەوە. کاتێ کە لە وەڵامی حاکمدا دەڵێ: «بەهۆی هەتاوەوە، ئەمە ڕووی دا» ئەم وەڵامە، باشترین نیشاندەری باوەڕ و قەناعەتی ئەوە دەربارەی کارەساتێکی جیهانی کە نەخش و ڕۆڵی ئەو لەو جیهانەدا نەخش و ڕۆڵێکی لاوەکییە. ئەم وەڵامە تەنیا لەبەر ئەوە دەبێتە مایەی پێکەنینی ئامادەبووان، چونکە مرۆڤ بەحوکمی عادەت ئەنجامی هەموو کاروکردەوەیەکی ئێمە دەگەڕێننەوە بۆ ئەو شتەی کە «کەسایەتی یا سروشتی» ناودەنێین.

مەرسۆ، بەو وەڵامەی خۆی، پەردە لەسەر جۆری بیرکردنەوەی سەرەتایی خۆی لا دەبات. هەڵبەتە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی ئەو، بەلای ئەو کۆمەڵەوە کە ئەو لە ناویدا دەژی، ناشیرین و ناسازگارە، هەر بۆیەش مەرسۆ بەلای خەڵکییەوە بابایەکە تاوانبار، کەواتە مرۆڤی کوشتووە. گوتەکەی کابرای دادوەر «حاکم» لەم بارەیەوە ڕوون و ئاشکرایە: «من ئەم پیاوە بۆیە تاوانیار دەکەم، چونکە وەکو تاوانبارێک دایکی خۆی بەخاک سپاردووە». خۆ بەلای خۆشییەوە ئەو کەسێکی کوشتووە، کەواتە دەبێ خۆی لەگەڵ ئەم بیرەدا ڕابێنێ کە ئەو بابایەکی تاوانبارە.

هەنووکە پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە بۆچی مەرسۆ لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی کوشتندا، هەست بەبەخت ڕەشی خۆی دەکات (ئەمە وەکو چوار لێدانی کورت بوو کە من لە دەرگای بەد بەختیم دەدا).

سەراپای گێڕانەوەی کاری کوشتنەکە ئەوە نیشان دەدات کە ئەو بەئانقەست تاوانی نەکردووە و لەم ڕووەوە کەمتر خۆی بەتاوانبار دەزانێت. ئەگەر هەست بەخەتاباریش بکات. هەندێک لە یۆنانیانی کۆن دەچێ. یۆنانیانی کۆن تاوانیان بەسەرچاوەی جۆرە گوناحێک نەدەزانی، بەڵکو بەسەرچاوەی جۆرە لەوتاندنێکیان دەزانی. بۆیە لە بری سزادانی تاوانباران، تاوانبارانیان لە خۆیان دوور دەخستەوە و ڕوویان نەدەدایێ. پیاوکوژ، بەلای ئەوانەوە قوربانییەکی غەزەب و تووڕەیی خوداوەندان بوو نەک کەسێکی تاوانبار.

جا بۆ ئەوەی ئەم قەناعەت و باوەڕە لەگەڵ ڕەفتاری مەرسۆدا بگونجێ، دەبێ ئەوە بگوترێ کە ئەو لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا «دەزانێ کە کارێکی گەوجانە دەکات».

بەلای ئێمەوە ئەم دەستەواژەیە بەچاکی نیشاندەری ڕەفتاری منداڵانەی مەرسۆیە، هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان دەستنیشان کردووە کە مەرسۆ چەندین جار وشەی وەک «قارەمان» و «بەدسروشت»ی لەمەڕ کەسانی دەوروبەری خۆی بەکارهێناوە: هەڵبەتە ئەم قسە منداڵانەیە ئەوە نیشان دەدات و دەسەلمێنێ کە ئەو پتر بایەخی بەتەرزی ڕەفتاری خەڵکانی دی داوە تا تاقیبکردنی هۆیەکانی ئەو ڕەفتارانەیان – وا پێ دەچێ کە بیرکردنەوەی ئەو لە تەرزی بیرکردنەوەی بەر لە دروستبوونی ئاکاری منداڵێکی ٤–٥ ساڵان بچێ کە دەزانێ چ بکا و چ نەکات و بەڵام بەباشی سەر لە هۆکاری کارەکان دەرنەکات– بۆیە، مەرسۆ بەر لەوەی لەلایەن کۆمەڵەوە تاوانبار بکرێ، وەکو بابایەکی ترسنۆک ڕەفتار دەکات: داوای لێبوردن لە سەرۆک دایەرەکەی دەکات، عوزر بۆ بەڕێوەبەری تەمەڵخانەکە دێنێتەوە، کاتێ کە دەچێتە لای دەرگاوانەکە. لە دڵی خۆیدا دەڵێ: «نە دەبوو وام بگوتبایە» و ئامادەیە داوای لێبوردن لە ماری–ش بکات: ئەنجامگیرییەکە بەم جۆرەیە: ئەو هەموو ساتێک ئامادەیە ئەو لۆمەیە لەسەرخۆی لاببا کە چ کەسێک لە هەوڵی کردنیدا نییە– کەچی، هێندە لە خەم و بیری هەڵسەنگاندنی جدیانەی بیروباوەڕەکانی خۆیدا نییە. ئەم ڕستەیەی ئەو: «مرۆڤ هەمیشە کەمۆکەیەک خەتابارە»، بەڕای ئێمە زیاتر لە قسەی منداڵێکی ترسنۆک دەچێ، یا لە قسەی منداڵێک دەچێ کە نایەوێ دەوروبەرەکەی زویر بکات و کەمتر نیشاندەری هۆشیارییە دەربارەی تاوانێکی گشتیی لە بابەتی تاوانەکەی کلامانس–ی چیرۆکی «سقوط».

ئەو هەستەی کە بۆ یەکەم جار لە کاتی دادگاییەکەدا یەخانگیری مەرسۆ دەبێت، جۆرێکی دییە. (بۆ یەکەم جار زانیم کە تاوانبارم) ئەم هەستە ئەوەی تێدەگەیەنێ کە ئەمجارەیان بەڕاستی تاوانبار کراوە– لە کاتێکا کلامانس بەخۆ تاوانبار کردن، لە داخا لاواز و باریک دەبێ، دەبینین مەرسۆ کاتێ کە لەلایەن کۆمەڵەوە تاوانبار دەکرێ، بەپێچەوانەوە زیاتر لەسەر باوەڕی خۆی ڕژد دەبێ و دژایەتی کۆمەڵ دەکات.

### قارەمانانی لاوەکی – دۆستەکانی مەرسۆ

دۆستەکانی مەرسۆ. سەر بەهەمان ژینگە و دەوروبەری ئەون: یان لە دایەرەدا هاوپیشە و هاوکاری ئەون «ئەمانوئیل، ماری کاردونا» یان دراوسێی ئەون «سیلست، سالامانۆ، ڕیمۆن، سنتس». مەرسۆ پیاوێکی دوورەپەرێز بووە و زۆر بەکەمی دۆستی گرتووە، زیاتر دۆستەکانی هاتوون بەلای ئەمدا و



بەدۆستی خۆیانیان هەڵبژاردووە. هەڵبەتە ئەم قسەیە دەربارەی ڕیمۆن و هەندێ جار سالامانۆ و تەنانەت دەربارەی ماری–ش ڕاستە. ئەو هەقی بەسەر ئاکار و تەبیعەتی کەسەکان و جۆری بیرکردنەوە و یان جۆری کاروکردەوەیانەوە نییە. ئەو تەنیا ئەوەی مەبەستە کە ئەوانە چ چاکەیەکیان دەرهەق بەئەو لە دەست دێ و لێ دەوەشێتەوە «ئارەزوو تاسەی هاودەمی، لەزەت و خۆشی بەدەنی» هەر لەبەر ئەمەیشە کە لەگەڵ قورمساغێک–شدا» «ڕیمون» دۆستایەتی دەکات– تەنیا لە کۆتایی چیرۆکەکەدا و کاتێ کۆمەڵ لە «بێتاوانی» مەحروومی دەکات، ئەوجا لە دڵی خۆیدا بیر دەکاتەوە کە «سیلست لە ڕیمۆن باشتر»ە: هەڵبەتە ئەم بیرکردنەوەیە لایەنی ئەخلاقی خۆی هەیە و بەر لە دادگاییەکە لەگەڵ میزاجی ئەودا نەگونجاوە.

ئێمە مەحکومین بەوەی کە ئەم کەسانە لە ڕوانگەی مەرسۆوە بدینین. لەبەر ئەمە ناتوانین باوەڕێکی دروستمان لەمەڕ دۆستەکانی ئەو هەبێ. بۆ وێنە گەنم ڕەنگی ماری. خۆش خویی ماری بەلای ئێمەوە مایەی سەرنجە، وا خەیاڵ دەکەین کە ژنێکی بێ غەل و غەشە، ڕاستگۆیە، خوازیارو ئاشقی مەرسۆیە.

بەڵام لە بەشی دووەمی چیرۆکەکەدا ناچارین وەکو مەرسۆ بیر بکەینەوە: بۆچی ئیدی نامە بۆ مەرسۆ نانووسێت؟ ئایا لە بیری کردووە؟ «لێوی دەخاتە بەردەستی مەرسۆیەکی دییەوە؟ نەخۆشە یان مردووە؟» چونکە بوون و کەسایەتی ماری لە ڕێگەی قارەمانێکەوە دێتە ناساندن کە چ ئارەزوویەکی شیتەڵکردنەوەی دەروون و ڕوحی خۆی نییە، بۆیە ماری لای ئێمەش ئاڵۆز و مەتەڵ و لوغز ئاسایە. ڕیمۆن–ش هەر بەم جۆرەیە: خوێنەر ئەوەی بەبیردا دێ کە: مەرسۆ هێندە لە بەدگومانی یان سەختگیری ئەخلاقی بەدوورە کە ئاساییە دەست لەگەڵ کابرایەکدا تێکەڵ بکات کە بۆخۆی لە زەڵکاودایە: ساکاری و خۆشباوەڕیی مەرسۆ، دەرفەت و توانای دادوەری ئێمەش سنووردار دەکات، ئێمەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، گیرۆدەی هەمان ساکاری و خۆشباوەڕیی ئەو بووین. بۆ وێنە ئاخۆ هەقە پێمان وابێ کە چونکە ڕیمۆن خۆی گوتەنی نەخوێنەوارە و ناتوانێ نامە بنووسێت، بۆیە پەنا وەبەر مەرسۆ دەبات کە نامەیەکی بۆ نووسێت؟ یان لە ڕاستیدا نایەوێ خۆی بخاتە خەتەرەوە و بەدەستخەتی خۆی نامەیەک بنووسێت کە دڵنیایە ئاکام و ئاقیبەتی قەزایی خراپی هەیە؟ خاڵێکی دی ئەمەیە: بۆچی کاری وەها لە مەرسۆ ڕادەبینێ؟ چونکە پێشتر هاوڕێی مەرسۆ بووە؟ یان تەنیا بەو مەبەستە قسەی لەگەڵ مەرسۆ کردووە و بووە بەهاوڕێی تا بتوانێ سوودی لێ وەربگرێ؟ بەکورتی ئایا پیاوێکی گومان لێکراوی بەتوانا لە سۆز بزووندایە یان سووکترین سووکە؟ بەهەر حاڵ، هەرچەندێ دەربارەی ئەو بەگومان بین، دەبێ حاکمەکە وشەی «قورمساغ» بەکاربێنێ تا ئێمەش بتوانین بەدڵنیاییەوە ناوێکی پڕ بەپێستی خۆی لێ بنەین، بەڵام بایەخی ئەم دڵنیاییە چەندە؟!

ڕیمون «بەدڵنیاییەوە» هەر ئەوەندە قورمساغە کە مەرسۆ تاوانبارە. خۆ ئەگەر دڵنیابوونیان لەوەی کە ماری تازە دڵی لە مەرسۆ سارد بۆتەوە، ئەوا وشەی ناشیرینمان بۆ وەسفکردنی ئەو بەکار دەبرد. هەڵبەتە ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە ئیعترافاتی ڕاستەوخۆی مەرسۆ بەهەند وەربگرین و دەرکی بکەین، بەڵام ئەگەر هەموو قارەمانەکانی دی بهێنرێنە ئاراوە و ئێمەش هەر بەهەڵخەڵەتاوی بمێنینەوە، ئەوا ئێمەش وەکو

خوێنەر، خوێنەری ئەوەندە ماقووڵ نابین.

کامۆ دەیگوت- و ئیعترافی دەکرد کە ئەم قسەیە هەندەک پێچەوانەی دابونەریتە- کە «هەوڵی داوە تا لە قارەمانەکەی خۆیدا تەنیا عیسایەک وێنە بگرێ کە ئێمە شایستەیی ئەومان هەیە. (بڕوانە پێشەکی نامۆ، چاپی زانستگە، ئەمەریکا). با ئەو سامرییە چاکبیرە وەبیر بێنینەوە کە دەڵێ ئەخلاقی مەسیحی فێری ئەوەمان دەکات کە: هاوڕەگەزی خۆتت، بەر لەوەی بیناسی، خۆش بوێ و یارمەتی بدە. هەندێکیش بەهۆی جێبەجێکردنی ئەم بنەمایەوەیە کە مەرسۆ حوکمی مەرگ «ئیعدام» دەدرێ.

**قارەمانی ناوەخت و بەڕێکەوت**

ماری و ڕیمۆن، لە نزیکەوە بەشدارییان لە ژیان و کارەساتەکەی مەرسۆدا هەیە. قارەمانەکانی تری چیرۆکەکە وەکو سێبەر بەدیار دەکەون و پێوەندییەکی یەکجار دووریان بەنەخشە و گەشەکردنی ڕووداوەکەوە هەیە - ئەگەر چیرۆکنووس بیویستایە قارەمانانی بەرجەستە و کاریگەر لە چیرۆکەکەدا، یا لە دەوڵەمەندکردنی کەسایەتی و سروشتی مەرسۆدا، یا لە بواری ئەخلاقی بەرهەمەکەدا، بەرجەستە و دیاربن، ئەوا دەرکەوتنی ئەوانی بەپێی مەعنایەکی دیاریکراو و بەپێی پێشکەوتن حسێب دەکرد. ئێمە لێرەدا قەرزارباری ڕوانینی مەرسۆین، کە هەرچییەک دەبینێ وەک خۆی و بێ کەمترین حوکمی پێشوەختە تۆماری دەکات.

بۆ وێنە لاپەڕە و نیوێک بۆ دیمەنی (ژنۆکەیەکی عەجایەب بوو، حەرەکاتی پچڕپچڕ بوو) و لە خواردنگەی سیلستدا. ڕووبەڕووی مەرسۆ دانیشتبوو، و شیوی دەخوارد، تەرخانکراوە، ئەمە تەنیا لەبەر ئەوەی کە لەو کاتەدا مەرسۆ چ کارێکی نەبووە جگە لە تەماشاکردنی ئەو. ئێمە ئەم ژنە بۆ جاری دووەم لە کاتی دادگایەکدا دەبینینەوە. هەڵبەتە بەهۆی ئەوەوە کە دەزگای عەدالەت بەزەبری گەڕان و تاقیب و سۆراخی ورد، توانیبووی هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژانی پێش تاوانەکەدا، مەرسۆ-یان دیتبوو، پەیدا بکات. بەڵام ڕۆڵی سەرەکی ئەو لە چیرۆکەکەدا تەنیا لەبەر ئەمەیە کە مەرسۆ لەکاتی بێکاریدا تووشی ئەو بووبوو. دیارە دەرکەوتن و لەپڕا پەیدابوونی قارەمانی وەک: سیلست، سالامانۆ، پیرزی پیر-ش بەهەمان ئەندازە بێ هۆیە- بەڵام ئەم قارەمانانە زیاتر (سیلست، سالامانۆ) یان لەساتی هەڵچووتردا (ماسون، پیرزی پیر) دەبینین. واتا ئامادەبوونی ئەمان بەشێوەیەکە کە خوێنەر ناتوانێ تاسەر بەشداری (بێ موبالاتی) مەرسۆ بکات و بەناچاری مانایەک بەئامادەبوونی ئەم قارەمانانە دەبەخشێت...

ئەگەرچی مەرسۆش گوێی نەداتێ، ئەوە ئەوان دەبن بەئەکتەری ئەم کارەساتە. پاش تاوانەکە ئەوان بەتۆبزی دەکەونە خانەی شایەتەوە: هەڵبەتە مەرسۆ چاوەڕوانی ئەوەناکات کە ئەمانە لە دادگادا بدینێ. بەڵام لە پڕ دەبینێ کە ئەم کەسانە لە نێو (ئاپورای تەمەشاکەرانەوە و چۆن یەک و بێ شێوە) سەردەردێنن و ئەم سەری سوڕ دەمێنێ کە بۆچی زوتر ئەمانی نەدیتوە. هاونشینی ئەم خەڵکە جیاوازەی وەک سلست، ماری و (ئەو ژنۆکە باشە)، واتا کەسانێک کە لە ژیانی ئەودا ڕۆڵی جیاوازیان هەبووە، چ پرسیارێک لای ئەو دروست ناکات. بەلای کەمەوە کاتی ئەوەی نییە (بیر) لەم بابەتە مەسەلانە بکاتەوە.



ئێمە کۆمەڵێک پێوەندی عاتیفی و ئەخلاقی دی دەدۆزینەوە کە مەرسۆ بیر لەوانەش ناکاتەوە. ئەو وەسفە وردەی کە مەرسۆ دەربارەی سیما و ڕوخساری پیرزی پیر بەدەستییەوە دەدات (لێوانی لەرزۆکی ژێر کەپۆیەکی پڕ لە خاڵی ڕەش، یان ڕەنگی قرمزی خوێناسای گوێچکەکان) بۆ خوێنەرێک کە بیری لای کارەساتێکی کپ و نزیکە ڕوودانە، مانایەکی خەماوی پەیدا دەکات.

هەروەها هەوڵ و تەقەللای بوێرانەی پیرەمێردەکە، کە بەنێو مەزراکاندا و ڕێگەی پڕ پێچ و پەنا دەبڕێ و بەهانکە هانک دووی جەنازەکە دەکەوێ، وێڕای ئەو ڕاپۆرو هەواڵە تایبەتییەی مەرسۆ لەمەڕئەو دیمەنە دەیدا، شایەتییەکی یەکجار بەزەیی ورووژێنەر دەرهەق بەوەی کە ئەو دوو بوونەوەرە تەنیا و بێ یار و یاوەرە چەند دڵیان بەیەکدی کراوەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا مەرسۆ هەندێ جار (بیر دەکاتەوە) و یارمەتیمان دەدات کە مانایەک بەفلان یان فیسار قارەمان ببەخشین. بەلای کەمەوە تەسلیمی کۆمەڵە تەداعییەک دەبێ کە چیرۆکەکە لێوان لێوی بەزەیی دەکات- ڕاستە ئەو لە ڕووی هوشیارییەوە مامەڵە لە تەک ئەم بەزەیییەدا ناکات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئاوێنەی ئەوە. بۆ وێنە کاتێ گوێی لە دەنگی گریانی سالامانۆ دەبێ کە بۆ گوم بوونی سەگەکەی دەگری، دایکی خۆی بیر دەکەوێتەوە (نازانم بۆچی دایکم بیرکەوتەوە). بەڵام ئەو کاتی ئەوەی نییە کە لەم بارەیەوە قووڵ ببێتەوە. چونکە ناچارە بۆ سبەینێ، سفێدە زوو لە خەو ڕابێ. بەڵام خوێنەر، دەنگدانەوەی هەڵقولاو و زادەی ئەم بیرەی کە کەسێک ئازیزێکی خۆی لە دەست داوە، تێ دەگات.

سالامانۆی پیر (ئامادەبوونی لەم چیرۆکەدا تەنیا بەهۆی دراوسێتی لەگەڵ مەرسۆدا بووە) لە دنیای چیرۆکەکەدا بۆخۆی مەعنایەک بەدەست دێنێ. چونکە بێ ئەوەی ئەو بەخۆی چ شتێک بڵێ، خوێنەر وا مەزەندە دەبات کە ئەو بەواتای بەزەیی قووڵی ئەوەیە.

پاش دادگاییەکە، مەرسۆ حسێب بۆ هەندێ دەلالەتان دەکات کە لە ژیانی ئازادی مرۆڤانەی خۆیدا قەت بەهەندی وەرنەگرتوون.

کاتێ کە سیلست بەوپەڕی نیازپاکی و نییەت چاکییەوە لە جێگەی شایەتان ئامادە دەبێ، ئەو (مەرسۆ) بۆ یەکەم جار لە ژیانی خۆیدا (حەز دەکات پیاوێک ڕامووسێ). هەر بەم شێوازەش پەی بەقەدەر و بایەخی ئەشقی خۆی دەرهەق بەماری، دەبات.

قەناعەت دێنی کە باوەڕ و ئیمانی قازی، داوێک لە قژی ژن نایەنێ، یان لەبەردەم ئێوارەیەکی پڕ ئومێدا، خۆشەویستی دڵگیری دایکی خۆی و پیرز-ی پیر وەکو سەرمەشقێک لە دەفتەری ئەزموونی شەخسی خۆیدا تۆمار دەکات. گۆڕانی تەبیعەتی مەرسۆ بەرانبەر بەخەڵکانی دەوروبەری، تاڕادەیەک بەجوانی لە هەڵسوکەوتیدا بەرانبەر بەو پیرەمێردانەی کە شەونخوونی بەدیار تەرمەکەی دایکییەوە دەکەن، بەرجەستە بووە: (تەنانەت تەسەورم کرد ئەم مرووەدەی کە لە نێو بازنەی ئەم پیرەمێردانە پاڵ کەوتووە، بەلای ئەوانەوە هیچ مانایەکی نییە، بەڵام هەنووکە پێم وایە کە ئەم تەسەورە نابەجێ و بێ بنج و بناوان بووە). پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە دیاریکردنی مەوقیعیەتی (ئێستا)ی حیکاتخوان (ڕاوی) سەبارەت بەڕووداوەکە چەند زەحمەتە. وا پێ دەچێ کە گومانی زنجیرە خۆشەویستییەک کە چەند

کەسێک لێکدی نزیک بکاتەوە، وێڕای ئەوەی کە ئێستا ڕوون بووەتەوە، پەیوەست بێ بەمەرسۆی دوا لاپەڕەکانی چیرۆکەکەوە. خۆ ئەگەر قەناعەت بەیەکسانی ڕوانگەی حیکایەتخوان بکەین و بێنین، ئەوا ئەم گومانە دەبێتە بەڵگەیەکی پتەو بۆ دروستی ئەو گریمانەی کە چیرۆکەکە پاش ڕوودانی مەسەلەکان نووسراوە.

هەر لە ڕیزی قارەمانە ناوەخت و بەرێکەوتەکاندا دەتوانین ئاماژە بۆ عەرەبەکان بکەین، بەتایبەتی دوژمنەکەی ڕیمۆن و دوا قوربانی دەستی مەرسۆ، ئەوانیش لەو جیهانی (بێ شەکڵییە)ی کە مەرسۆ تێیدا دەژی، جیا نابنەوە، ئەمانە لە خانەی کەمالیاتدان، قوربانییەکەی مەرسۆ لە ڕوانگەی مەرسۆوە تەنیا کۆسپێکە لەسەر ڕێگەی کانییەکە بەلای منەوە، ئەو ڕەخنەگرانەی کە پێیان وایە کامۆ بەئانقەست و بەمەبەستی تایبەتی کابرای عەرەبی هەڵبژاردووە تا بیکات بەقوربانیی کارەساتەکە، غەدر دەکەن و بەهەڵەدا چوون: چونکە یەکەم: دابەشبوونی خەڵکی جەزایر بەجۆرێ بووە کە ئیمکانی ئەوە هەبووە لە دەیا نۆ جار مەرسۆ عەرەب بکوژێ تا ئەوروپایی. (خۆ ئەگەر حیسابی ئەوە بکەین کە چیرۆکەکە لە دەوروبەری جەزایردا ڕوودەدات، ئەوا ڕێژەی ئەو ئیمکانی کوشتنە دەگاتە٣/٢). دووەم: ئەگەر وا دێتە بەرچاو کە مەرسۆ عەرەبی ناو چیرۆکەکەی بە(بنیادەم) نەزانێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بەهەمان چاوەوە سەیری کابرای عەرەب دەکات کە سەیری ئەو خەڵکانەی دی پێ دەکات کە هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا هەیە. مەرسۆ لە ڕوانگەیەکی هێندە یەکسانەوە دەڕوانێتە جیهان کە ڕەگەزپەرستی لە فەرهەنگی ئەودا بێ مەعنایە- هەڵبەتە هەموو کەسێک دەتوانێ ئەم چیرۆکە بەکۆمەڵێک دەلالەتی ڕەمزی دەوڵەمەند بکات و شەقڵی مێژوویی بەپیاوکوژییەکەی مەرسۆوە بنێ: یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی هەر شاکارێک ئەمەیە کە خەڵکی هەندێ لێکدانەوەی بۆ دەکەن کە بەهزر و بیر و خەیاڵی نووسەرەکەیدا نەهاتووە.

### کۆمەڵ

بێ موبالاتی مەرسۆ دەرهەق بەخەڵکی، پاش تاوانەکە دەگۆڕێ، و چونکە کۆمەڵ ئەوی بەدوژمنی خۆی زانیوە، ناچاری دەکات کاردانەوەیەک نیشان بدات. بەپێچەوانەی هەر پێشبینییەک، کۆمەڵ هەستی جۆرە خۆشەویستی و پێوەندییەکی لە لا بێدار دەکاتەوە کە ئەو پێشتر دەرکی نەدەکرد. یا بەلای کەمەوە بەشێوەیەکی ئاگایانە دەرکی نەدەکرد -وای دێتە بەرچاو کە (قازی مرۆڤێکی گەلێک ماقووڵ و بەشێوەیەکی گشتی ڕوح سوک و خۆشەویستە). ناڕەزایی ئەوقاتەکەی. خەمباری دەکات: (بەتووڕەیی ڕۆیی. حەزم دەکرد نەیەڵم بڕوات، و پێی بڵێم پێویستم بەمەحەبەتی ئەو هەیە، نەک لەبەر ئەوە باشتر بەرەڤانیم لێ بکات، بەڵکو هەروا بەشێوەیەکی ئاسایی.)

هەروەها دڵی دەخوازێ: (لە کانگای دڵەوە، تەقریبەن لە ڕووی خۆشەویستییەوە) ئەوە بۆ ئەو دادوەرەی کە ئەوی خستۆتە ژێر قامچی جنێوان، (شەرم بکات کە بۆچی ناتوانێ لە تاوانەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە) لەو ساتەوە کە دەستگیرکراوە، وەکو منداڵێک کە لە کوتەک بترسێت، سەری سوڕدەمێنێ، کە بۆچی لە بیری دارکاری کردن و لێدانی ئەودا نین. جا لەبەر ئەمە حەز دەکات (مەحەبەتێکی) دەرهەق بەو کەسانە کردبێ کە ئەو هەموو نەرمییەی لەگەڵدا دەنوێنن. سەیر ئەوەیە



ئەوانەی کە (خێری) ئەویان دەوێ، و دڵ بەگۆڕانی کەسایەتی ئەو و ناساندنی ئەو گۆڕانە بەئەو، خۆش دەکەن، لە هەموو کەسێک کەمتر کار لەو دەکەن.

کاتێ قازی دەکەوێتە خۆ بۆ گۆڕینی باوەڕی ئەو، ئەم هەوڵە ناڕەحەتی دەکات- هەوڵەکەی قازی سەرەتا ناڕەحەت و پاشان زۆر تووڕەی دەکات.

گۆڕانی مەرسۆ، لە جۆری نیشاندانی نوێنەرانی کۆمەڵدا بەدیار دەکەوێ. مەرسۆ سەرەتا بەپێی حەزی ئاسایی خۆی سەرنجی لەسەر وردە شتانێک دەگیرسێتەوە، کە زەقن: چارەی قازی، (بۆینباخە سەیرەکەی ئەوقاتەکەی کە ڕێ ڕێیەکی درشتی ڕەش و سپییە)، جبە سوورەکەی سەرۆکی دادگا، وێڕای ئەوەش هەر لە سەرەتای دادگاییەکەوە، چاوانی گەشی ڕۆژنامەنووسێک کە بەوردی ئەو هەڵدەسەنگێنن، لەم حاڵەتی خەسیوی و نەزۆکییە بەدەرە: مەرسۆ جۆرە مانایەک بەم چاوانە دەدات: (حاڵەتێکی سەیری وەهام لا دروست بوو کە دەتگوت خۆم خەریک بووم سەیری خۆم دەکرد). سەراپای دادگاکە بەرە بەرە کەمتر لەپێشان وەکو نمایشێکی سادە دێتە بەرچاوی -بەلای کەمەوە لە جاران پتر هەست بەوە دەکات کە باس باسی ئەوە. ئەو ئاگای لە (نیگای سەرکەوتووی) دادوەرەکەیە و هەروەها ئاگای لەو تیشکە تەوس ئامێزەشە کە لە چاوانییەوە دەدرەوشێتەوە. وای دێتە بەرچاو کە ئەوقاتەکەی (مرۆڤێکی مەخسەرەیە). لە وەسفکردنەکەی قازیدا، چ شوێنەوارێکی بێ غەرەزی ساکارانەی دیتنەکانی پێشووی مەرسۆ نابینرێ، ملایمی، غەم، تووڕەیی و تەنانەت لێهاتوویشی (قازی تاکتیکی هەڕەشە بەکاردێنێ و چاو دەبڕێتە دوڕ چاوانی موخاتەبەکەی خۆی) لە چاوانی مەرسۆ ون نابێ.

دەربارەی تێکڕای قارەمانەکان، ئەو تەنیا مەبدەئێکی زۆرجار بێ مەعنای خستە ڕوو کە توانای خەیاڵ یان بیری ڕەخنەگرانەی ئێمە لەوێندەرەوە دەستی بەحەرەکەت دەکرد. بەپێچەوانەوە:

ئەو باوەڕەی ئێمە دەربارەی قازی بۆ خۆمان گەڵاڵەمان کردووە، زادە و هەڵقوڵاوی ئەنجامگیری (استنتاج) نییە: ئەم باوەڕە هەر هەمووی بەندە بەبینینەکانی مەرسۆوە: چونکە ئەو پاش ئەمە پتر بیری لە پێوەندی خۆی لەگەڵ خەڵکانی دیدا کردۆتەوە و لەوە دەرچووە هەر بەدیاردە ئاڵۆزەکان قەناعەت بکات و وازبهێنێ.

### بەهای فەلسەفی و ئەخلاقی نامۆ

کامۆ بەخۆی بیانووی دابووە دەست ئەو کەسانەی کە نامۆیان بەتەفسیرێکی سادەی (ئەفسانەی سیزیف) دەژمارد. کامۆ لەو ڕەخنەیەیدا کە لەمەڕ (هێلنج)ی سارتەری نووسیبوو، گوتبووی: (هەر چیرۆکێ بگری، هەمیشە فەلسەفەیەکە کە بەشێوەی وێنەگرتن هاتۆتە بەیانکردن و دەربڕین). هەڵبەتە ئەمە بڕیارێکی مەترسیدارە و لە ڕواڵەتدا سەربەخۆیی و ڕەسەنایەتی چیرۆک سنووردار دەکات، بەڵام وێڕای ئەمەش ئەگەر ئەوە لەبەرچاوبگرین کە کامۆ هەرگیز تەسلیمی یەک سیستەمی فیکری نەبووە و بەرهەمە فەلسەفییەکانی و. هەڵبەتە کەمتر نامە تیۆرییەکانی، پتر قۆناغە داشۆرینەکانی ئەو، واتا (چیرۆکی) فیکرێکە کە عەودالی دووی خۆیەتی، ئەوکاتە باشتر پەی بەمانای بڕیارەکەی ئەو دەبەین.

لەبەر ئەمە، ئەگەر بەخۆمان زۆر لە کنوکۆی دۆزینەوەی لێکچوونی بەرهەمەکانی کامۆدا نەبین، ئەوا بەراوردکردنی جیهانی چیرۆک و بەرهەمی فەلسەفی کامۆ لەوە کەمتر زیان بەدەوڵەمەندی چیرۆکەکانی ئەو دەگەیەنێ کە تەسەور دەکرێ. واتە زیانی ئەو بەراوردە لە ڕادەی تەسەور کەمترە. بۆیە ئەو بەخۆی کاتێ کە ئەنجامێکی مومکینی (لە گوین) بۆ نامۆ پێشنیاز دەکرد، (کۆمەڵ پێویستی بەکەسانێکە کە لە ڕێوڕەسمی ناشتنی دایکی خۆیاندا بگرین) ئەوەی قبوڵ بوو کە (دە ئەنجامی لە گوین-ی تریشی) لەم چیرۆکەدا دیتوە (بڕوانە دەفتەری بیرەوەرییەکان).

## جیهانی بێ شێوە

ئایا دەکرێت وەکو هەندێ جار گوتراوە، لە نامۆدا بەڵگەی پووچی جیهان بدینرێ؟ سارتەر لە گوتاری (لێکدانەوەیەکی نامۆ)دا ڕایەکی تایبەتی لەم بارەیەوە هەیە و دەڵێ: ئارمانجی کامۆ لە ئەفسانەی سیزیفدا نیشاندان و بەرجەستەکردنی چەمکی بێهوودەیی و پووچییە و لە نامۆدا نیشاندانی هەستکردنە بەبێهوودەیی و پووچی - بەباوەڕی کامۆ ناتوانرێ بگوترێ کە خودی مرۆڤ یان جیهان بێهوودە و پووچن: دنیا خۆی لە خۆیدا ماقوڵ نییە.

بێهوودەیی و پووچی لە ڕوا وەستانی ناماقوڵی دنیایە، کە لە قووڵترین شوێنی ناخی مرۆڤدا دەنگ دەداتەوە. بێهوودەیی و پووچی چەند پەیوەستە بەجیهانەوە. ، هێندەش پەیوەستە بەمرۆڤەوە.

بێهوودەیی و پووچی تاقە پێوەندی نێوان جیهان و مرۆڤە - (ئەفسانەی سیزیف). کەواتە هەستی بێهوودەیی و پووچی کە مەرسۆ بەرجەستەی کردووە، ئا ئەمەیە. بەڵام ئاستی ڕۆشنبیری ئەو (مەرسۆ) زۆر لەوە کەمترە کە بتوانێ هەستی خۆی لە قاڵبی چەمکێکدا بۆ ئێمە بگوازێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، وا دێتە بەرچاو کە ئەگەر کامۆ لە چیرۆکەکەی خۆیدا سەلماندنی ئەم بیرەی مەبەست بوایە، ئەوا دەیتوانی کەرەستەی باشتر هەڵبژێرێ و بەکاربهێنێ: بۆ وێنە هەمان ئەو کەرەستانەی بەکاربهێنابوایە کە سارتەر لە هێڵنجدا بەکاریان دەبات. ڕوکانتن-ی حیکایەتخوانی هێڵنج، لەم دنیایەدا هەست دەکات کە پایەی شایان بەخۆی وەرگرتووە- بۆیە بەمەبەستی توێژینەوەیەکی مێژوویی کە باوەڕی پێیەتی، زنجیرە لێکۆڵینەوەیەک ئەنجام دەدا- دۆستێکی (معشوقة) هەیە کەوا دەزانێ دڵبەندێتێ: بەڵام لە نکاودا ئەم جیهانە، کە وەڵامدەرەوەی پێشبینییە ئەقڵی و هەستییەکانی بووە، هەموو بنەما و هاوسەنگییەکی خۆی لە دەست دەدا: وشەکان لە مانای خۆیان جیا دەبنەوە و لایەنی سەرسامی بەخۆوە دەگرن. مرۆڤ و شتەکان پەیوەندی خۆیان لە دەست دەدەن و لە دنیایەکی بێهوودە و عەبەسدا دەردەکەون.

دەربارەی ڕوکانتن دەتوانرێ بگوترێ کە لەو کاتەدا وەکو مەرسۆ، هەست بەنامۆیی خۆی لە جیهان دەکات و، ئەو هەستە ناو دەنێ (هێڵنج). بەم جۆرە کاتێ کە مەرسۆ بەدیار جەنازەکەی دایکییەوە شەونخوونی دەکات بەهەمان ئەندازە و ساردییەوە دەڕوانێتە بورغووە بریقەدارەکانی سەر چوارچێوەی تابووتەکە، کە دەڕوانێتە سیما و چارەی دۆستەکانی دایکی. چونکە بەلای ئەوەوە بورغووەکان و سیماکان ڕێک بەئەندازەی یەکتر کەم مانان.



نیگای ڕوکانتن-ش، بەهەمان شێوە و بێ هیچ هۆیەک لەسەر قایشە وەنەوشەییەکەی پانتۆڵی بەڕێوەبەری کافتریاکەیان لەسەر ڕەگوڕیشەی درەختی شابەڕووەکە دەگیرسێتەوە، بەڵام لە کاتێکدا کە ئەم شتانە لەلای ڕوکانتن ئامادەبوونێکی تاقەت بەر و بێ لەزەتیان هەیە، بورغووەکان نابنە مایەی کەمترین دڵ تێک هەڵهاتن و هێڵنج لەلای مەرسۆ. چونکە ئەو هەمیشە بەم جۆرە (ئاسایی و سروشتی) ڕوانیویەتێ دنیا. لەبەر ئەمە هیچ هەستێکی پووچی و بێهوودەیی لای خوێنەری یەکەمین لاپەڕەکانی نامۆ دروست نابێ، مەگەر لای ئەو کەسانەی کە بەپێچەوانەی مەرسۆوە چاوەڕێی جیهانی لێوان لێوی مەعنا بن.

لەمە چاکتر: هەڵبەتە مەرسۆ لە حاڵێکا دەژیا کە ئەگەر ڕوکانتن لەو حاڵەدا بژیابوایە، دڵی تێک هەڵدەهات و هێڵنجی دەهاتێ: لەم ڕووەوە، مەرسۆ بەگۆڕانێکی پێچەوانەی قارەمانەکەی سارتەردا دەڕوات: لە حاڵێکدا کە ئەو بەرە بەرە مەعنایەک لە جیهاندا دەدۆزێتەوە. ڕوکاش بەرە بەرە مەعنای جیهان لە دەست دەدات. ڕوکانتن لە هێڵنجدا نقوم دەبێ، گیرۆدە دەبێ، مەرسۆ لە ئەنجامدا دەگاتە شۆڕش- گوتمان تەمەشاکەرانی دادگا لە چاوی مەرسۆدا (یەک شێوە) دەیاننواند: شتێک بەیەک شێوە دێتە پێش چاو کە مرۆڤ پێشتر لە هەوڵی ئەوەدا بووبێ کە شێوەیەکی پێ ببەخشێت. هەروەها ئەوەشمان نیشان دا کە لە داگاییەکە بەدواوە دنیای مەرسۆ چۆن دەمەیی و دروست دەبوو. بۆ وێنە دایکی، کە تەنیا لە ڕێگەی تەداعییەوە لەگەڵ سەگەکەی سالامانۆدا بەبیری ئەودا تێدەپەڕێ، لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەبێ بەمایەی خۆشەویستی و ئومێدی ئەو. لە هێڵنجدا جیهان بەرە بەرە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی شتەکان- لە نامۆدا تا پتر دەچینە پێشی، دنیا پتر ڕەنگ و ڕووی مرۆڤانە وەردەگرێ... نەک لەبەر ئەوەی کە بێهوودەیی بەمانا فەلسەفییەکەی وشەی بێهوودەیی، لەم کتێبەدا بخرێتە خانەی دودڵییەوە یان ڕەتکردنەوەوە- بەڵکو، وەک کامۆ خۆی هەمیشە دەیگوت، ئەو کەشفکردنی بێهوودەیی بەئامانجێک نەدەزانی.

بێهوودەیی بۆ ئەو سەرەتایەک (مبدأ) بوو. لە هێڵنجدا (هەستی بێهوودەیی) ئەگەرچی بەسوێ و نێگەتیفە، لە فەتحێک دەچێ لە دنیایەکدا کە دەمامکی ئومێدە بۆش و بەتاڵە بەشەرییەکانی پۆشیوە -لە نامۆدا، بێهوودەیی گریمانەی یەکەمین و سەرەتایە، نکۆڵی و باوەڕ نەکردنێکە کە نیشانەکانی خۆشەویستی و باوەڕ بەمرۆڤ و جیهان لەسەر ئەو ڕۆنراوە.

## قارەمانێکی نادیار

لە ئەفسانەی سیزیفدا، کامۆ گەلێک نموونەی (مرۆڤانی بێهوودە)ی نیشان داوەو دەربارەیان گوتوویەتی: (ئایا پێویست بەوە دەکات ئەمە ڕوون بکەینەوە کە نموونە مەرج نییە سەرمەشق بێ (و لە دنیای بێهوودەییدا، ئەمە هەر زۆر کەمە)، و نابێ ئەم نموونانە لاسایی بکرێنەوە؟ کامۆ هەوڵی دەدا و -نەیدەشاردەوە- کە مەرسۆ وەکو مەسیحایەکی نوێ بناسێنێت: هەڵبەتە ئەمە بەلای کەمەوە وەڵامێکی گەلێک بەسوود بوو بۆ ئەو عەیب دۆزەرەوانەی کە مەرسۆ-یان بەنموونەی گەلحۆیی و سستی دەژمارد.

حەقیقەتی مەسەلەکە ئەمەیە کە لە چاو قارەمانانی ئەفسانەی سیزیفدا، ناتوانرێ مەرسۆ، بەشێوەیەکی سادە و دوور لە ئالۆزی، وەکو سەرمەشق یان نموونەی نێگەتیڤی تەبیعەتی مرۆڤ لەبەرچاو بگیرێ.

سەرەتا مەرسۆ قسە لەگەڵ ئێمە دەکات، و ئێمەش ئەوەمان ساغ کردۆتەوە کە یەکجار زەحمەتە قسەکانی ئەو بەقسەی بێ لایەن بزانین. لەو دواییيانەدا ڕای گشتی ئەمەریکا ڕابوو و کەوتە پشتیوانی لە کابرایەکی مەحکوم بەئیعدام، لەبەر ئەوەی لە زینداندا دەستی دابووە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی. ئایا هونەری ئەم زیندانییە بەڵگەی پاکی و بێ تاوانی ئەوە؟ ئەم ڕووداوەش وەکو نامۆ، ئەوە نیشان دەدات کە شارەزایی لە تایبەتمەندێتی ژیانی کەسێک دەبێتە هۆی دەرک و عەفوی ئەو کەسە. ئێمە نامانەوێ ڕۆڵی جەلاد بدینین، بەڵام ئەگەر نامۆ وەکو قەواڵەیەکی (سند) قەزایی بخەینە بەر موتالا و (دادگایی مەرسۆ) دەست پێ بکەینەوە، ئاخۆ بەڕاستی ناچار نابین کە گومان لە ڕزگاری و ئاسوودەیی مەرسۆ وەکو (ڕەفتارێکی مەسڵەحەتی) بکەین؟ ئایا ئیعترافاتەکەی مەرسۆ لێهاتووانەترین بەرەڤانی نییە؟ یان بەلای کەمەوە ئایا دڵنیاین کە مەرسۆ، ڕووداوەکان بەوپەڕی نیازپاکییەوە وەبیر دێنێتەوە؟ و بەشێک لە مەبەستەکان یا کەساسی و زەبوونییەکانی خۆی بەهۆی ترسی لە حەقیقەت، تەنانەت لە خۆیشی ناشارێتەوە؟ کامۆ وەکو چیرۆکنووس دەست لەکاری چیرۆکەکە وەرنادات، بەسەرهات و واریقاتەکەی مەرسۆ وەکو قەواڵەیەکی بابەتی و مایەی هەر جۆرە لێکدانەوە و شرۆڤەیەک دەخاتە بەردەستی ئێمە.

لەودیوی ئەو ئالۆزییەوە کە هەڵقولاوی هەمان مامەڵەی بەرهەمەکەیە، ئایا ڕەفتاری کۆمەلایەتی (عەجیب)ی مەرسۆ دەبێ چۆن لێک بدرێتەوە؟ مرۆڤێک بۆ ئەوەی لە زیندانا تووشی بێ تاقەتی و بێزاری نەبێ، یان بۆ ئەوەی بتوانێ پاش نیوەڕۆیەک بێ هیچ کارێک بگوزەرێنێ یان دەبێ لە ڕادەبەدەر زیرەک و فرەزان بێ یان دەبێ دوچاری مەنگی تایبەتی گیانداران بووبێ. دەبێ چۆن مل بۆ ئەم حاڵ یا ئەو حاڵ بدرێ؟ بەم شێوەیە وەزع و حاڵی دادگایییەکە: بەهیچ جۆرێ دیار نییە کە ئاخۆ ڕزگاری مەرسۆ وەکو ڕزگاری سوکراتە لەبەردەم داوەرەکانیدا یان ئەم ڕزگارییە ئەنجامی بێهۆشییەکە کە بەئیعترافی خۆی زۆر جار تووشی بووە و لەگەڵیا یەتێ.

هەڵبەتە ئەم ئالۆزییانە «بەڵگەی بنجبڕ نین" ئەمانە شەقڵێک بەبەرهەمەکە دەبەخشن و ئەگەر بمانەوێ هەر چۆنێک بووە ڕوونیان بکەینەوە و شرۆڤەیان بکەین ئەوا خیانەت لە مەبەستی کامۆ دەکەین و ڕۆڵی حاکم و دادوەر دەگێڕین. ئێمە دەتوانین ئەوە بڵێین کە مەرسۆ گەییوەتە ئاستی هوشیاری و، لەگەڵ مەرسۆدا پەیوەندییەکانی (مەرسۆ) لەگەڵ کەس و شتەکاندا کەشف بکەین، دەتوانین بڵێین: کە (ئەو وەهایە) و دەستنیشانکردنی ڕادەی هۆشمەندی یا تاوانباری ئەو کار و ئەرکی کۆمەڵە. (دادوەرەکەش دەربارەی ئەو دەڵێ: (ئەو بەهۆش)ە؛ هەروەها (ئەو تاوانبارە). ئاخۆ ئەو بابایەکە قارەمان یان شەهید؟ دەربارەی مەرسۆ هەر ئەوەندە دەتوانرێ بگوترێ کە بابایەکی قوربانییە. ئەو قوربانیی کۆمەڵێکە کە دەیەوێ هەموو شتێک بزانێ و بچێتە بنج و بناوانی هەموو شتێک. ئەم کۆمەڵە تەسەوری خۆی دەربارەی مرۆڤ لە خودی مرۆڤەکە پێ باشترە. مەرسۆ، چونکە وەکو خۆی چۆن هەیە ئاوها دەردەکەوێ، ڕازەکانی



خۆی دەپارێزێ و. نایاندرکێنێ، کەواتە نابێ بەتەمای چاوپۆشی کۆمەڵ بێ- تەنیا ئەمە و بەس.

## کۆمەڵێکی بێ گیان

کامۆ لە ١٩٣٧/٨دا، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نووسیوێتی: (ئەوە چەندین ساڵە، هەر جارێ کە گوێم لە گوتارێکی سیاسی دەبێ، یا گوتاری کەسانێک دەخوێنمەوە کە ڕێبەریمان دەکەن، ترسم لێ دەنیشێت: چونکە تاقە دەنگێک ناژنەوم کە سەدا و ئاهەنگی ئینسانی تێدا بێ، هەمیشە هەمان وشە و هەمان درۆ دووبارە دەکەنەوە. ئەمەش کە خەڵک خوویان بەوانەوە گرتووە و تووڕەیی و غەزەبی جەماوەری خەڵک تا نهو ئەم بوکەڵە کارتۆنانەی تێک و پێک نەشکاندووە، بەڵگەی ئەوەیە کە خەڵکی لە بایەخی حکوومەتی خۆیان غافڵن و گەمە بەبەشێک لە ژیان و بەرژەوەندی هەرە گرینگی خۆیان دەکەن. بەڵێ، بەڕاستی گەمەی پێ دەکەن). دنیای عەدالەت لەم باشتر نییە. نوێنەرانی کۆمەڵ لە دادگادا دەرهەق بەکاری ئەو کەسانەی کە ئەم نوێنەرانە مەسئولیانن، یەکجار خەمساردن. وەکو چۆن نوێنەرانی گەل؛ بەڕای کامۆ، دەرهەق بەکاری گەل، ئەو گەلەی کە ئەمانی هەڵبژاردووە، خەمسارد و بێ موبالاتن، دەتوانین لە مەرسۆ بپرسین کە کێیە (ڕواڵەتی ڕۆڵی دادگایییەکەیش هەر ئەمەیە): مەبەستیانە و پێیان چاکە ئەم خاڵەی فێربکەن و چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکەن کە تەنیا بەگوتار و ڕەفتاری خۆی باوەڕی پێشوەختە ڕەسمکراوی ئەوان بسەلمێنێ، بەڵام ئەو لەم ڕێوڕەسمە پێشوەختە بڕیار لەسەر دراوەدا، ڕۆڵی خۆی یاری ناکات، و بەم جۆرە مەتەڵ و لوغزێکی لە توانابەدەر بۆ قازییەکان چێ دەکات کە گەمە کۆمەلایەتییەکە بێ ئیعتبار دەکات.

ڕەوتی دادگایییەکە هەر لە نمایشێکی کۆمیدی دەچێ، ئەوقاتەکەی مەرسۆ و دادوەر لەجیاتی وەکو دوو ڕەقیب بنوێنن، وەکو هاودەست و دۆست دەنوێنن. کەواتە بەهیچ جۆرێ جێی سەرسوڕمان نییە ئەگەر هاوباوەڕ لەگەڵ سارتەردا بڵێین: قارەمانانی ئەم چیرۆکە لە شووشەیەکەوە دەبینرێن کە هەڵسوکەوتیانی پووچ و کۆمیدییانە لێ کردووە و هەڵسوکەوتیانی بۆ جۆرە لاڵبازییەک گۆڕیوە. بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە ئەوە نیشان بدەین کە کاتێ کاری دادگایییەکە بەرەبەرە دەچێتە پێشێ. شووشەکەش نامێنێ و ون دەبێ. لەوساتە بەدواوە، ئەم نمایشە کۆمیدییە کەمتر لە بڕیاری نووسەر دەچێت تا لە مەبەستی کەشفکردنی فێڵ و دەهۆیەک. مەرسۆ تا ئەو کاتەی لەم دیوی شووشەکەوە بوو، لە تەماشاڤانێکی خەمسارد پتر چیدی نەبوو، بەڵام لەوساتەوە کە دنیا لە ڕوانگەی ئەوەوە مانایەک پەیدا دەکات، بەڕای ئەو ئیدی لە تەحەمولدا نامێنێ کە لاڵبازییەکە بەردەوام بێ و ئەویش دەوری تێدا هەبێ، کەواتە یاخی دەبێ.

## هونەری کامۆ – شێوازی نامۆ

شێوازی نامۆ لە ڕووی سادەیی و ڕەوانییەوە سەرنجڕاکێشە. هەڵبەتە ئەم تایبەتمەندییانە لە ئالۆزی و ئیبهام بەدەرنییە: کاتێ نامۆ دەخوێنینەوە، لەوەیە وەسا خەیاڵ بکەین کە هونەری ئەم چیرۆکە لە ئاستی تێگەیشتنی هەموو کەسێک بێ. وەکو چۆن تابلۆکانی؛ موندریان یان کلێسای ڕونشان-ی بەرهەمی لوکوربوزیە زیاتر لە نیگارکێشییە دەستکردەکانی مسونیەر یان تەلارە شکۆدارەکانی سەدەی ڕابوردوو

دەتوانن زەوقی نیگارکێشی یان تەلارکاری لای بینەری گشتی بجوولێنن: بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێ خۆ دوورگرتن لە ڕازانەوە نیشانەی بێ توانایی نییە؛ و لە هونەردا هیچ ڕێیەک لە ڕێگەی گەیشتن بەماڵی کردنی سادەیی و ڕەوانی، سەخت و دژوارتر نییە.

**سادەیی ئاراستە کراو**

ڕۆلان پارت، لە گوتاری (نمرە سفری نووسین)دا و لەو شوێنەدا کە دێتە سەر باسی (نووسینی نوێی دوولایەنە) دەڵێ: (ئەم گوتارە شەفافە، کە بەنامۆی کامۆ دەستی پێ کردووە، شێوازی پەنهان ڕۆدەنێ، کە تەقریبەن دەکاتە غیابی ئامانجی شێواز). هەروەها لەسەری دەڕوات و دەڵێ: (نووسینی پاک و بێ لایەنانە ئەمەیە). ئێمە کە دەڵێین ئەم نووسینە پاک و بێ لایەنانە دەنوێنێ. لەبەر ئەوەیە چونکە بەشێوەیەکی گشتی پتر لەهەر نووسینێکی دی دوورە لە بێ لایەنی ڕاستەقینە.

لە پشت نووسینەکەی کامۆوە، ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی و جوانکاری و مەبەستە تایبەتییەکانی چیرۆکنووسە مەزنەکانی سەدەی نۆزدەی فەرەنسا، کە بەباوەڕی ڕۆلان پارت هەڵقولاوی ڕەوشی بورژوازییەتە، نابینرێ. بەڵام هەموو سروشتێکی کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و مەسەلەکیش لە نامۆ نەتارێنراوە. بەر لەم سارتەر لە گوتاری (لێکدانەوەیەکی نامۆ)دا ئاماژەی بۆ کپی و بێ تیف تیفەیی شێوازی کامۆ کردبوو: دەربارەی ژول ڕونارە دەیانگوت ڕۆژێ دێ کە بنووسێت: (مریشک هێلکە دەکات). ڕێزدار کامۆ و گەلێک لە نووسەرانی هاوچەرخیش بەم زووانە دەنووسن کە: (مریشک هەیە و هێلکە دەکات) ئەمانە شتەکانیان لە پێناوی بوونی شتەکاندا خۆش دەوێ، و نایانەوێ شتەکان لە سێلاوی زەماندا بتوێننەوە. بەڵام کامۆ، بەم جۆرە نووسینە لە نامۆدا، جگە لە تەرجەمەیەکی وەفادارانەی تەرزی ئاخافتنی گوتەبێژی (خیتابی) تایبەتی فەرەنساییەکانی جەزایر چ کارێکی دی ئەنجام نادات. هەڵبەتە ئەم تەرزە خیتابە میراتی شێوازی حیکایەت و نەقڵی عەرەبە: ئەمان بەوەرگێڕانی سادەی کارەکان، کە خۆی لە خۆیدا مایەی سەرنجە ئیکتیفا دەکەن، و بەپێویستی نازانن دەستی پێدا بێنن و لە نوێ دروستی بکەنەوە و نایانەوێ کارەکان لە خیتابێکی هاوپەیوەندا بسازێنن و بگونجێنن. کاتێ ئەم کارانە لەسەر یەکتر کەڵەکە بوون، سەرەنجام مەودایەکی حەماسی (حماسە) وەردەگرێ. بەسەرهاتی ڕیمۆن سنتس ئاوهایە. و کامۆ وەکو دیتمان ئیلهامی ئەم کارەی لە شەڕی ناو کۆڵانەوە وەرگرتووە و وەکو چۆن شەڕەکەی دیتوە ئاوها و بێ ڕتوش لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا تۆماری کردبوو، بۆیە ئاهەنگی ئەم کارە لەو ڕووداوە دڵگیرانە دەچێت کە لە شادی Noces و هاوین (Etel) دەردەکەون، بەڵام بەپێچەوانەی ئەم دوو بەرهەمەوە، نامۆ پەیامێک نییە. مەرسۆ قسان دەکات و شێوازی ئەو لە تەرجەمەی هەستەکاندا یان ئەو ڕووداوانەدا کە ئەو دیتوونی لە ناخی چیرۆکەکەدا، لەبن دێڕی چیرۆکەکەدا مانایەکیان پێ دەبەخشێت مەرسۆ بەوەبیرهێنانەوەی گوایە ئاساییترین و گرینگترین کاروبار، ئەویش لە ڕێگەی ڕستەی سووک و کورتی ئەوتۆ کە زۆرجار هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ئەنجامی پێکیانەوە نابەستێ، وا دەنوێنێ کە گوایە بۆچوونە جیاوازەکانی ئێمە لەمەڕ کاروبار و شتەکان کەشف دەکات. شێوازەکەی هاوار دەکات و پێمان دەڵێ کە لە ڕوانگەی ئەودا مەسەلەی بچووک بوونی نییە.



ملاحەزەکردن و دیتنی وردەشتان (بورغووەکانی تابووتەکە)، یان ڕێبازی ئەو لەمەڕ هەڵسەنگاندنی باش و خراپی هەر شتێکدا (بەمانایەک... بەمانایەکی دی...) نیشانەی ڕوحیەتێکی بەدیقەت و پڕ سەرنج و وردبینە. کامۆ، نەهاتووە مەرسۆ بکات بەکەرەستەیەک و بۆ ڕێکخستن و ئامادەکردنی ڕاپۆرتێک سوودی لێ وەربگرێ: بەڵکو لە ڕێگەی ئەوەوە دەچێتە ژێرباری خەڵوەتێکی زۆر دژوار تا سەرلەنوێ جیهان کەشف بکاتەوە: ئەم جیهانە لەژێر نیگای تازەی قارەمانێکدا کە بەها ئینسانییە تەقلیدییەکان بەهەند هەڵناگرێ، هاوسەنگ بووە.

**شۆخی**

زۆر لە گوینە کە خوێنەر بەئاسانی بەم هەڵوەشاندنەوە و سڕینەوەی دەلالەتانە قاییل نەبێ، چونکە ڕوانینی مەرسۆ کەمتر ئاراستەی تەوەجوهێکی نوێ دەبێ تا بیرکردنەوەیەکی حەپەساو و تەنانەت ڕەخنەیی لەمەڕ ئەو ڕێبازەی کە شتەکان دێنە بەرچاوی ئەوە یەکێک لەو بابەتانەی کە لە نێوان لێکۆڵەرەوانی نامۆدا باس دەکرێ ئەمەیە کە بزانن ئایا مەرسۆ بەخۆی بابایەکی شۆخیبازە یان نا، ئەو داردەستی بێ دەسەڵاتی هەزەلیاتی (شۆخی) کامۆیە: چارەسەری ئەم مەسەلەیە لە چوارچێوەی بەرهەمەکەدا قورس و زەحمەتە. تەنیا ئەوەندە لە تواناداد هەیە کە ئاماژە بۆ نیشانەکانی شۆخیبازی ئەو لە گوتار و دەربڕینەکانیدا بکرێ.

هەندێ لە زاراوەکان، تەنیا بۆ ئەوە بەکارهێنراون تا سەرنجی ئێمە بۆ مەعنای قووڵی دەستەواژەی بازاڕی لە باوکەوتووی سواو ڕابکێشرێ: بۆ وێنە دەستەواژەی: (ئەوان بەدەم نەعرەتە و سترانەوە دەیانگوت کەیانەکەی ئەوان نابود نابێ)، لێرەدا و بەسایی شێوازی ناڕاستەوخۆوە هەموو توانایەکی فرمانی (نابود بوون) دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو و کەچی کاتێ هەوادارانی گرووپە وەرزشییەکان هەمان فرمان لە دروشمەکانی خۆیاندا بەکاردێنن، ئێمە هیچ بیرێک لە مەعناکەی ناکەینەوە.

بەڵام بەزۆری دیدی شۆخیبازیانەی مەرسۆ، دەشێت بایەخی گەلەک زیاتری هەبێ. مەرسۆ، لەکاتی ناشتنی دایکیدا هێندە بێ موبالات و سارد و سڕانە دەڕوانێتە ڕێوڕەسمی بەخاک سپاردنەکە، کە ڕێوڕەسمەکە لە شێوەی دابێکی خاڵی لە مانای ڕاستەقینە و تەنانەت گەپچاڕانەش دەنوێنێ. بەم جۆرە: (قەشەیەک و دوو منداڵی گرووپی ئاوازی کڵێسا لەبەردەم بینایەکەدا بوون. یەکێک لەم دوو منداڵە مەقڵییەکی عود و بخورد سووتانی بەدەستەوەبوو، قەشەکە بەلایدا دانەوییەوە تا درێژی زنجیرە زیوەکە ڕێک بخاتەوە. «کاتێ ئێمە گەیشتین، قەشەکە بە(کوڕم) بانگی کردم و چەند وشەیەکی پێم گوت و وەژوورکەوت. منیش دوای کەوتم.» ناڕاستی دادگاییەکە، کە تەشریفاتی ئاڵۆزتر و پووچەڵتری هەیە، تەنیا بەوەسفکردنی ڕێوڕەسمەکانی خۆی، لەمە پتر مەحکوم دەبێ.

لەگەڵ ئەمەشدا، وەکو لە ئەنجامگیرییەکانی پێشوەوە پێشبینی دەکرێ، ئەم شۆخیبازییە لە ئاخرو ئۆخری چیرۆکەکەدا بەرە بەرە کەم دەبێتەوە. کاتێ مەرسۆ بەوپەڕی سەرسامییەوە دەبینێ کە ئەویان لە دادگاییەکەدا کەنارخستووە، لە وەسفکردنی ئەم ڕێوڕەسمە سەیرە هێوەتر دەڕوات- بێهوودەیی و بێداری

دادگاییەکە بەڕاشکاوی مەحکوم دەکات. بەلای کەمەوە لەم دابونەریتە بێ تاقەت و نارەحەت دەبێ. دەرفەت نادات کە ئێمە خۆمان بگەینە قەناعەت کە ئەوقاتەکەی مەخسەرەیە. ڕێک ئەم وشەیەی بەزاردا دێ. دوا قسەی لەگەڵ قەشەکەدا و لەناو زیندانەکەدا جێی کەمتر گومانی شۆخیبازی (هزل) ناهێڵێتەوە- چونکە مەرسۆ بۆی دەرکەوتووە کە ئەمە نمایشێکی خەندەدارە (مضحک) و ئەوەتا قەشەکە دوا دیمەنی یاری دەکات، ئەمە کارێکی بێ مەعنا نییە، بەڵکو پیلانێکە زۆر فێڵبازانە چنراوە. تا ئەو دەمە لە گوین بوو ئەم بەسەرهاتە یەکێک لە حیکایەتەکانی ڤۆلتێر-مان وە بیر بخاتەوە، ئەگەر دوا لاپەڕەکان جۆرە بیرێکی ڤۆلتێرانەی گرتبێتە خۆ، ئەوا لە جۆرێکی دییە:

ڕژدی و تەزویر و ڕیا و ساختەکاری «هەڵبەتە دیسان کەمێک لە ڕێگەی مەرسۆوە، بەڵام ئەمجارە دەنگی کامۆ دەگاتە گوێ» هێندە بەگەرمی و توندی مەحکوم کراوە کە هیچ بوارێک بۆ شۆخیبازی حیکایەتەکە نامێنێتەوە.

**شیعرییەتی (نامۆ)**

سارتەر دەڵێ: (لە هەندێ ساتی دەگمەندا، نووسەر بەپێچەوانەی تەبعی خۆیەوە، ڕوو لە شیعر دەکات). دیارە ئەم جۆرە تەبع و تەبیعەتە هەرگیز لەلایەن کامۆوە پەیڕەوی نەکراوە و سارتەر ئەمەی دەداتە پاڵ. باوەڕ ناکەم کامۆ هەرگیز ئیعترافی بەبنەما و سروشتی وەها کردبێ. بۆیە ئێمە لێکدانەوەکەی ڕوب گرییە-مان پێ پەسەندترە کە دەڵێ: کە ساتی کوشتنەکە بەرە بەرە نزیک دەبێتەوە، لە دیارترین خواستنی ئاساییمان پتر بۆ دەردەکەوێ کە بۆ خۆی بیرخەرەوەی مرۆڤە یان نیشانەی ئامادەبوونی هەمیشەیی مرۆڤە: دەشت لە هەتاو (پاراو) دەبێ، عەسر (وەکو ئاشتی کاتی غەمگینە)، جادەی پڕ کەندولەند (گۆشتی درەخشانی) قیرەکە نیشان دەدات، زەمین (ڕەنگی خوێنی) گرتووە، هەتاو دەبێ بە(بارانێکی کوێرکەر)، ڕەنگدانەوەی لەسەر گوێچکە ماسییەک دەبێ بە(شمشێرێکی نورانی). ڕۆژ (لە ئۆقیانووسێکی مەعدەنی تواوەدا لەنگەر دەگرێ) جگە لە (هەناسەی) شەپۆڵە (تەمەڵ)ەکان، تیلماسەکە زەوی (خەوالّوو)، دەریایەک کە (هەناسە دەدات) یان پێوەرەکانی هەتاو.

ئەو ناسکییەی کە لە چیرۆکەکەوە هەڵدەقوڵێ. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و پۆشراو دێتە دەربڕین. مەرسۆ وەختێ لەگەڵ کەسەکاندا گفتوگۆ دەکات بەجۆرێکی سەیر ناشی و تازەکارە (سەرنجی ڕەفتاری ئەو لەگەڵ ماریدا، یان تەداعی ئەو لە نێوان دایکی و سەگەکەدا بدە). بەڵام کە دێتە سەر باسی تەبیعەت، زۆر بەئاو تاو و پڕ هەست و جۆشەوە قسە دەکات.

شیعری نامۆ شیعری ڕەگەزە (عناصر) و سۆزە بەشەرییەکان چ شوێنێکی لەوێدا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، گۆڕانی ئەو بەجۆرێکە کە سۆزە نەناسراوەکان یان لە شەرمدا دامرکاوەکان، لەگەڵ جۆش و خرۆشێکی پڕ لەو ئومێدەی کە لە دوا لاپەڕەدا دێتە دەربڕین و بەیانکردن، لەگەڵ هەستی تەبیعەتدۆستی، کەتا ئەو ساتە هەستی دیار و بەرجەستە دەینواند، تێکەڵ دەبێ. ئەو کاتە ئارامی هاوین لەگەڵ هێوری دڵی ئەودا یەک دەگرێ. ناسکی جیهانی هاوباخەڵی دەبێ بەخۆشەویستییەک کە ئەو ئێستاکە بەهۆی بیرکردنەوە لە



دایکی خۆی، دەری دەبڕێ. ئێستا شەو تەنیا لێوان لێوی ئەستێران نییە: پڕ دەبێ لە نیشانەکانیش. ڕۆژێ ڕەخنەگرێک گوتبووی: (شیعری جوان و باش و بێ هاوتا هەمیشە زادە و بەرەنجامی هاوباخەڵی و ئاوێتەبوون و جوتبوونی کاریگەری سروشتی و کول و کۆڤان و ئازاری ڕوحییە.) مەرسۆ لە کۆتایی نامۆدا بەم ئاکامە دەگات. مەرسۆ، پاش ئەوەی بەتەواوەتی خۆی دەناسێت، دەبێ بەشاعیریش.

**ئەنجامگیری: کلاسیزمی کامۆ**

نامۆ بەرهەمێک سێبەری تەکنیکی چیرۆکی ئەمەریکایی پێوە دیارە. دیارە بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمە هاوکات بوو لەگەڵ برەوسەندنی فیکری وجودییەتدا و چیرۆکێکی پێشڕەوە (چیرۆکی نوێ). چ کەسێک دەتوانێ ئەم ئەنجامگیرییە ڕەت بکاتەوە؟ ئەوجاش کامۆ سەد هەمینگوای بەیەک ستنداڵ یان بەیەک-کونستانت دەگۆڕییەوە، چەندین جار موخالەفەتی خۆی لەگەڵ جۆرەکانی فەلسەفەی وجودییەتدا بەیان کردووە و زۆر بەکەمی بایەخی بە(چیرۆکی نوێ) داوە. کەواتە دەتوانین بڵێین بابایەکی سەر بەڕێبازی ناماقوڵ بوو؟!

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە کامۆ لە جوملەی ئەو نووسەرانەیە کە بەرهەمی ئەدەبی بەمەیدانی تاقیکردنەوەی تەکنیکێک یان فەلسەفەیەک ناژمێرن. ئامانج و مەبەستی ئەو بریتییە لە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی ڕەفتاری کەسێک کە خۆی لە دەربڕین و بەیانکردنی نهێنییەکانی خۆی، دەدزێتەوە. ئا لەم ڕێچکەیەوە لەگەڵ بیروباوەڕی (ڕەفتار گەرایان)ی هەندێ نووسەردا یەک دەگرێتەوە. بەمەحکوم کردنی شێوەکانی کۆمەڵێک کە پێی پەسندە، لە بری مامەڵەکردن لەگەڵ تاک تاکی کۆمەڵدا وەکو چۆن هەن، مارکە و مۆرێکیان پێوە بنێ و تەبیعەتێکیان بداتە پاڵ، تا بتوانێ بوونی ئەوان تەحەمول بکات، کامۆ بەناچاری، مەرسۆ دەخاتە خەرمانەی قارەمانانی وجودییەوە.

ئەو جۆری قسەکردنی مەرسۆی، لەگەڵ جیهانبینی ئەودا، تەواو گونجاندووە. بەم جۆرە کامۆ بەبیرکردنەوە لەمەڕ بوون (وجود) گەیییە دۆزینەوەی شێوازێک کە پاش ئەو خەڵکانی دی بەبیرکردنەوە دەربارەی شێوازەکانی نووسین بتوانن هەمان شێوازی ئەو سەرلەنوێ بدۆزنەوە. ئەو بەخۆشحاڵی و بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ کلاسیزم، بەتایبەتی سەبارەت بەنامۆ، دەخستەڕوو؛ واتا بەبێ لەڕودامان ئیعترافی بەبۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ کلاسیزم دەکرد. کلاسیک بوون بەلای ئەوەوە بەمانای (کەمتر گوتن) و (زیاتر مانا گەیاندن) بوو. جا لەم بارەیەوە کامۆ نەک هەر کلاسیکە، بەڵکو کلاسیزمی خەباتگێڕیشە، چونکە کامۆ تەنیا بەنیشاندانی جیهانێکی لێوان لێوی خۆشەویستی هاوئاهەنگ و گونجاو لەگەڵ دنیادا داناسەکنێ "ئەو ئەو کەسانە مەحکوم دەکات کە پێویستیان بەقسەی زل و قەبە و قەڵەوە تا بتوانن شوێن پێی بیرێک یان هەستێک هەڵبگرن- کلاسیزمی ئەو نەپاکیزەیە و نەبێگەرد و بێ گوناح. بەڵکو پەروەردەی نمایشێکی خەندەدار و (مضحک) نایابی کۆنە کە لە نامۆدا، گەرچی لە ڕێگەی شۆخی بازیشەوەیە، خۆی دەنوێنێ بەم جۆرە، بێدەنگییەکانی مەرسۆ تەنیا بێدەنگی خۆدزینەوە نییە: خامۆشی و بێدەنگییەکی ویستراوە بەرانبەر بەهەرزە وێژی بێشەرمانە، بەڵام نامۆ بەشێوەیەکی قووڵتریش هەر کلاسیکە: کامۆ لەم بەرهەمەدا

فۆرمێکی ڕەسەنی ئەوتۆی دۆزیبیەوە کە تا ئێستاش لاسایی دەکرێتەوە. ئەم فۆرمە کارەساتێکی مەیلە و گشتی بەیان دەکات و دەردەبڕێ. بەجۆرێک کە تەنانەت (دوژمنان)ی وجودییەتی ئەو، ڕووی خۆیان لەم ئاوێنەیەدا دەناسنەوە. ئەگەر لە بەرانبەر کۆمەڵێکی چەنەبازی شەیدای درێژ دادڕی و وشەی قەبە و قەڵەودا، مەرسۆ شەهیدی کەم دووی و کورتبڕی بێ، ئەوا ئەمە بۆ کلاسیزمی نامۆ کەمتر بایەخی هەیە تا کورتبڕی بەیان و دەربڕینی کامۆ لەم بارەیەوە. هەرچەندە بۆ کامۆ فەرق ناکات. ئایا کامۆ نەیدەتوانی هەمان ئەو قسەیەی خۆی، کە بەوپەڕی سادەییەوە لەمەڕ بەرهەمێکی تری خۆی گوتبووی، سەبارەت بەنامۆش دووبارە بکاتەوە: (من فۆرمی قسەم لەگەڵ ناوەڕۆکیدا گونجاندووە. تەنیا ئەمە و بەس.).

## پاشکۆکان

١- (ئەو شتە تایبەتییەی کە من لەم چیرۆکەدا دیتوومە ئامادەبوونی (حضور) بەدەنی و ئەزموونی بەدەنییە کە ڕەخنەگران نەیان دیتوە: زەوییە و ئاسمان و پیاوێکە کە خەڵقەندەی ئەو زەوییە و پەروەردەی ئەم ئاسمانەیە.

خەڵکی لەوێندەر دەقاودەق وەکو قارەمانەکەی من سادە دەژین. هەڵبەتە ئێوە دەتوانن لە مەرسۆ بگەن، بەڵام کەسێکی جەزایری ئاسانتر و قووڵتر لە حاڵی ئەو دەگات.) (رای کامۆ بۆ پیکون).

٢- (وا دەزانم کە تەکنیکی چیرۆکی ئەمریکایی گەییوەتە جۆرە بن بەستێک. هەڵبەتە من لە نووسینی نامۆدا سوودم لەوە وەرگرتووە. بەڵام ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە ئەم تەکنیکە لەگەڵ مەبەست و خیتابی مندا دەگونجا. مەبەستی من بریتی بوو لە وەسفی پیاوێک بێ چ شعوورێکی دیار- ئەگەر ئەم تەکنیکە تەعمیم بکەین دەگەینە جیهانێکی پڕ لە کەسانی بێ ئیرادە و میکانیکی و تەسلیمبووی غەریزە. ئەمەش هەژارییەکی مەزن و گەورەی لێ دەکەوێتەوە.) (لە گفتوگۆکانی کامۆوە...).

٣- (کوشتنی کابرای عەرەب تەنیا بیانوە و هیچی دی. دادوەرەکان، لە ڕێگەی کابرای تاوانبارەوە و لە پشت ئەوەوە، دەیانەوێ حەقیقەتێک بسڕنەوە کە ئەو نوێنەرێتی.) (بڕوانە ماکمەت).

٤- (نامۆ پتر لە چاتوترن-ی بەرهەمی ڤیگنی دەچێت تا لە حەکایەتی فەلسەفی. چونکە حیکایەت ناوەڕۆکێکی ئیجابی و ئامانجێکی ڕوونی هەیە. لە کاتێکدا چاتوترن، وەکو نامۆ بەر لە هەر شتێک ئیعترازی لەفزی کەسێکی نارازییە.) (بڕوانە: جیرارد).

٥- (لە دادگا یان کۆشکی، کافکادا، قارەمانی چیرۆک دەیەوێ کارەکانی خۆی زۆر بەوردی ڕوون بکاتەوە و لە جیهانی دەوروبەر تێ بگات... دنیای دەوروبەری ئەو بەئاشکرا لە مەنتیقی بوون و ڕێکوپێکی هەڵدێ و بەدەرە. لە نامۆدا، بەپێچەوانەوە، قارەمان هۆکاری کردارەکانی خۆی، لە جیهانێک کە هەڵبەتە نارێکە، بەڵام هەوڵ دەدا بەشێوەیەکی سەرڤە سەرڤە (سطحي) ڕێک و مەنتیقی بنوێنێ، کەشف و ئاشکرا ناکات.) (بڕوانە: ئالبەرس).

٦- (ئەم بەرهەمە بەرە بەرە و خۆبەخۆ لەبەرچاوی خوێنەر شێوە و فۆرمی خۆی وەردەگرێ کە خۆی لە خۆیدا نیشاندەری ژێرخانێکی پتەوە و بەرهەمەکەی لەسەر ڕۆنراوە. تەنانەت تاقە یەک ڕووداوی



زیادە لە بەرهەمەکەدا نابینرێ: ڕووداوێک نییە کە پاشان سوودی خۆی نەبی و نەبێتە مایەی باس. کاتێ کە کتێبەکەمان داخست، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ کە نەدەتوانرا ئەم چیرۆکە بەشێوەیەکی دی دەست پێ بکرێ یان نەدەتوانرا کۆتاییەکی دی هەبێ: لەم دنیایەدا کە دەیانەوێ وەکو دنیایەکی پووچ و بێهوودە بەئێمەی پیشان بدەن و ڕەگوڕیشەی هۆیەکانیان لەبنەوە دەرکێشاوە، کەمترین ڕووداو بایەخی خۆی هەیە. هیچ ڕووداوێک نییە کە قارەمانی چیرۆکەکە بەرەو تاوان و ئیعدام ڕاپێچ نەکات.

نامۆ بەرهەمێکی ئەزەلی و ڕێکوپێکە و دەربارەی بێهوودەیی و دژی بێهوودەیی نووسراوە) (بڕوانە، جان- پول سارتەر).

تێبینی: ئەم کتێبەم لە ساڵی ١٩٩٢ وەرگێڕاوە.